# دەستپێك

زانای گەورەی عێراقی عەلی ئەلوەردی لە نەسلی رەسەنی ئەو رەوتە رووناکبیرییە رەسەنەیە کە عیراقی جاران، عیراقی پێش زاڵبوونی هەژموونی تۆتالیتاریزم، بەخۆوەی بینی. ئەو دەنگێکی دیارو تایبەتمەندی ناو ئەو رەوتە رووناکبیریی و کۆمەڵایەتیەش بوو کە تا نیوەی یەکەمی شەستەکانیش، دروست بەر لە ملکەچپێکردنی مۆزایکی عیراقی بۆ تەوژمی ناسیۆنالیزمی یەکرەنگی عەرەبی، بەگیانی زانست پەروەریی و بەدیدێکی واقیع بینیانەوە لە رەوشی کۆمەڵایەتی، سیاسی و فەرهەنگی عیراقی دەکۆڵییەوە. لەسەر وەختێکدا سیحری ئایدیۆلۆژیا لە عیراق و دنیای رۆژهەڵات دەم و دەستی لێکۆڵیارانی بەستبوو، تەوژمی توندرەوی ناسیۆنالیستیی عەرەبیش ملی راستییەکانی نێو واقیعی چەماندبۆوە، ئەلوەردی هات تا پێمان بڵێت کۆمەڵگەی عیراقی وەك هەر کۆمەڵگەیکی دیکەی رۆژهەڵاتی قابیلی رەدو بەدەڵە، قابیلی لێکۆڵینەوەو دەرخستنی راستییەکانی نێو هەناوێتی، با ئەو راستییانە تاڵ و ناخۆشیش بن، با لەگەڵ زمانی رەسمیی دەوڵەت و لەگەڵ تەوژمی ئایدیۆلۆژیای باوی نێو نوخبەی رووناکبیرانی ئایدیۆلۆژیستی ئەو سەردەمەی عیراقیش یەك نەگرێتەوە.

لەبەرئەوە بە زنجیرەو پەیتا پەیتای توێژینەوە بەنێو رەگەکانی مێژووی سۆسیۆلۆژی عیراق و پێکهاتەی نەفسی تاکی عیراقیدا رۆچووە خواریێ و بە پەرۆشی زاناو گیانی رەخنەگرانەی رووناکبیرییەوە کاغەزی توتی لەسەر کەسێتیی عیراقی لابردو (ربي كما خلقتني) پیشانیداین.

سەرنجی متەوازیعانەی بەندە وایە کە لە زانایەتی و گەورەیەتیدا ئەلوەردی لەباری پێشکەشکردنی واقیع وەك ئەوەی خۆی هەیە هیچی لە بیرمەندی گەورەی ئیتالّی نیکۆلای میکیاڤیللی کەمتر نییە.

میکیاڤیللی لەبارەی (میر)و کەینوبەینەکانی میرایەتی دواوە وەك ئەوەی خۆی هەیە نەك وەك ئەوەی میرەکان و مێژوونووسە رەسمیەکانیان دەیخوازن. ئەلوەردیش لەبارەی عیراق و عیراقییەکانەوە دواوە وەك ئەوەی خۆیان هەن، وەك ئەوەی پشتاو پشت لەناو ڕاڕەوەکانی مێژووی کۆمەڵایەتی رۆژهەڵاتدا بەچاك و خراپ بزاوتیان هەبووە. میکیاڤیللی لەلایەن ئەوانەی بە فیعلی وەسیەتی میرەکەی جێبەجێدەکەن گەورەترین هێرشی تا ئێستا بەردەوامی لە دژ بەرپا کراوە. ئەلوەردیش جگە لە هێرشی کۆنەپەرستان کەوتە بەر سیاسەتی فەرامۆشی و پیلانی پشتگوێ خستنی ئەو نەسلە نارەسەنەی بە کۆکردنەوەی هەموو خەسڵەتە خراپەکانی کەسێتی عیراقی و فەرامۆشکردنی خەسڵەتە جوانەکانی ئەو کەسێتییە، بوونەوە بەحەجاجێکی ترو سەری نەك هەر عیراقی بەڵکو سەری عیراقیشیان پەڕاند، وەك بڵێی قەدەری عیراق وابێت کە زاناکانی تراژیدیای (انا الحق)ی حەلاج و جەللادەکانیشی درامای خوێناوی حەجاج دووبارە بکەنەوە.

بیرۆکەی ئەلوەردی وایە کە مرۆڤ، بەتایبەتی مرۆڤە عیراقییەکان!، بە کێماسی و خەسڵەتە باشەکانیانەوە، بەدزێوی و شتە جوانەکانیانەوە جوانن. کەسێتی نێو لێکۆڵینەوەکانی، ڕووداوەکانی لەوانی دەگێڕێتەوە، نەشتەرگەرییەکانی کە بۆ ڕێڕەوی کۆمەڵایەتی دەیکات، هەر هەموویان ڕووبەڕووکردنەوەی ئێمەی بەنی بەشەرە لەگەڵ واقیعدا. ئەوانەی ئەو

باسیان دەکات، ئەو بیرۆکانەی ئەو دەیانخاتەڕوو هەمووی لەو بابەتانەن کە ئێمەش دەیزانین خۆمانی لێ دەشارینەوەو لەناو قەباغ و قەپیلکەی ئایدیۆلۆژیای رەسمیماندا دایدەپۆشین. عینادی لەگەڵ خۆمان و خەڵکیدا دەکەین، ملی واقیع دەچەمێنینەوە بۆ روانینە تیۆرییەکانمان کەچی کە ئەلوەردی دەخوێنینەوە لەپاڵ کۆششێکی زانستیی بێوێنەدا هەست بە ترپەی دڵ و قوڵپدانی خوێن دەکەین. ئەو قسانەمان گوێ لێ بووە، کەچی زۆرن و تازە بابەتیشن. ئەم رووداوەی ئەلوەردی دەیگێڕێتەوە ئێمەش بیستوومانە، ئەی بۆ ئەم وا جوان و لەدڵەوە بۆ دڵ، لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیدا تەوزیفی کردووە؟ مەگەر کاتی خۆشی بە کۆڵۆمبۆسیان نەگوت کە ئەمریکا خۆی هەبوو، زەحمەت نەبێ تۆ چیت دۆزیوەتەوە ؟!

ئەلوەردی هەروا لە خەسڵەتێکی تریشدا زانایەکی رەوشت بەرزو وردەکارە، بۆیە سەربای هەموو لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر کەسێیتی عیراقی، سەبارەت بە تایبەتمەندێتی کەسێیتی کوردی خۆی لە لێکۆڵینەوەی رەوشی ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کورد نەدا. ئەمەش جگە لەوەی دانپیانانێکی متەوازیعانەی زانایەکی گەورەیە بە ئاگادارنەبوونی لەکایەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو، تەئکید کردنەوەیەکی زانستیانەشە لەسەر جیاوازی رەوشی کورد لەهی ئەو عیراقەی ئەمی بەزۆر پێوەلکێنراوە. ئەم دەربڕینەی عەلی ئەلوەردی پرۆتستۆیەکی بێدەنگانەشە بەرامبەر بەو چەند تەن لێکۆڵینەوە درۆزن و ساختەکارانەی وای نیشان دەدات کوردو کۆمەڵگەی کوردستانەکەی بێ سێو دوو، بێ چەندو چون بەشێکی بەگۆشتو خوێن تێکەڵاوبووی کۆمەڵگەی عەرەبی عێراقە.

بێگومـان چـەند لەســەر ئاکـاری بـەرزی ئـەم زانـا گەورەیـە و لەســەر دانایی‌و ژیری بڵێین هێشتا کەمەو لە عۆدەی ئەم پێشەکییە کورتـەدا نییـە کـە بـۆ کتێبـی (خـوارق اللاشـعور)، یـەك لەبەرهەمـە دانسـقەکانی عــەلی وەردی، نووسراوە.

هێندە نەبێت کە بڵێین ئەم کتێبەش، وەك ئـەوانی تـری، هـەر لەسـەر هـەمان ڕێچکـەی ڕەچەشـکاندنی ڕەوتــی بـاوی لێکۆڵینــەوەکانی بــواری سۆسیۆلۆژییە. سەرەڕای تایبەتمەندییەکانی بەڵام خوێنـەری بەسـەلیقەو پەرۆشی بەرهەمەکانی ناتوانێ لەڕێرەوو ڕەوتی کتێبـەکانی تـری دابـبڕێ چونکە ئەلوەردی خۆی بە تێکڕایی پڕۆژەیـەکی گـەورەی توێژینەوەیەکـەو بەش‌و ڕشتەکانی بەسەر چەند کتێبێکدا دابەش بوون.

وەرگــێڕانی ئــەم کتێبــە پێویســتیەکی دیــاری نامەخانــەی کــوردی پڕدەکاتەوە. دەمێك بوو کاك سەمەد زەنگەنە هیلاکی‌و ماندوبوونی خۆی لـەوەرگێڕانیدا خســتبووە بـەردەمم تـا پێشـەکییەکی لەســەر بنووسـم. لێ بەندە درەنگ هاتمە دەست‌و بەئەندازەی بەشـی خـۆم بوومـە سـەبەبکاری دواکەوتنی.

بۆیە داوای لێبوردن لەکاك سەمەدو لەخوێنـەران و... هـەروا لـەڕۆحی ڕەوانی عەلی ئەلوەردیش دەکەم.

**ستران عەبدوڵڵا**

**سلێمانی ٢٠٠٢/٧/٦**

# پێشـــەکـی

ئەم لێکۆڵینەوەیەی پێشکەش بە خوێنەرانی دەکەم، توانایەکی لەڕادەبەدەرو کاتێکی زۆری لێبردووم... ماوەی دووساڵ سەرقاڵی وردەکارییەکانی بووم. بەجۆرێك پەلکێشی دەکردم، هێندەی نەمابوو خۆم لەدەست بدەم، لەئەنجامیشدا گەیشتمە ئەو ڕاستیو زانیاریانەی کە لەوانەیە تاڕادەیەکی زۆر بەخوێنەر نامۆبنو دووربن لە پێکهاتەو بانکی زانیارییە ئاساییو باوەکانی.

سەرەتای لێکۆڵینەوەکەم بەهیچ شێوەیەك لەو باوەڕەدا نەبووم بگەمە ئەو ئەنجامەی ئێستا. زیاد ڕەویش ناکەم گەر بڵێم پێشوەخت بێئاگابووم لەهەموو ئەو بیرو بۆچوونانەی ئەمڕۆم .

ڕۆژێك بەر لەوەی لە ئەمریکا بگەڕێمەوە بەڕێکەوت کتێبێکم بینی، ناوەڕۆکی ئەو کتێبەش پاڵنەری سەرەکی بوو بۆ بەردەوام بوونو بەدوادا چوونی ئەم لێکۆڵینەوەیە... لەو پاپۆڕەی پێی دەگەڕامەوە نازانم لەباشی بەختانم بوو، یاخود چارەڕەشیو نەگبەتیم، لەبری ئەوەی منیش وەکو سەرنشینانیدی بەسەماو دڵاریو چاوبڕکێو دەستبازییەوە کاتەکەم بەسەربەرم خۆمم بەو کتێبەوە خەریك کردبوو، هەروەکو شەیدایەکی ئالودە سەرقاڵی خوێندنەوەی ببووم... لەوانەشە ئەو پەرۆشیەم بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە، بێبەشبوونو لەدەستدانو ئاخ هەڵکێشان بووبێت بۆ ئەو لاوێتییەی کە هەمیشە سەرکوتکرابوو... پیاو قسەیەکیش بۆ دز

بکات[١] خوێندنەوەی کتێبەکە ئەوەندە سەرنجڕاکێش بوو نەمدەتوانی دەستبەرداری بم، پاڵنەرێکی چاکیش بوو بۆ (بەڵەدویستی)[١].

گەشتەکە کۆتایی هاتو گەڕامەوە بۆ عێراق، دەمویست هەرچی شتێك لە دوورو نزیکەوە پەیوەندی بە بابەتەکانی ئەو کتێبەوە هەبوو کۆی بکەمەوە، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ڕاستیەکان، نامەوێت قەناعەت بە خوێنەر بێنم ئەو ئەنجامەی من پێی گەیشتووم، ئەو بڕوای پێبێنێ.. چونکە خودی خۆم سالانێکی دوورو درێژ لەزۆر شت بەگومان بوومو ئەمڕۆش دانیان پێدا دەنێمو باوەڕم پێهێناون، کاتێکیش بیرم لە پرنسیپی ناوەڕۆکی بابەتەکانی دەکردەوە بەکارێکی‌مەحاڵو گرانم دەزانی. چونکە منیش یەکێك بووم لە نەوەکانی ئەم سەردەمەو پێکەنینم بەهەموو ئەو شتانە دەهات کە لەگەڵ زاراوە فیکریو دابونەریتە باوەکانی فێربوونو خوێندنەکانمدا نەدەگونجان.

لەو تەمەنەمداو لە ئەنجامی ئەو زانیاریانەی لە کتێبەکانی خوێندنگەوە فێری ببوم، خۆم زۆر بە گەورەو لوتبەرز دەزانی. گاڵتەشم بەهەموو ئەو زانیاریانە دەهات لەگەڵ پێوەرە لۆژیکیەکانی ئەو زانیارییە سەرەتاییانەی وەرم گرتبوون نەدەگونجان.. هەرچ شتێکیش پێچەوانەی بۆچوونەکانی لەوەو بەرم بوون بە مەحاڵم دەزانین و بەلوتبەرزییەوە لچم لێ‌هەڵدەقورتاندنو خۆشم زۆر لەوانە گەورەتر لەقەڵەم دەدا..

---

[١] ئەم کتێبە دەقاودەق وەرنەگێ ڕدراوە، گوتەو پەندە عەرەبییەکانم گۆڕیوە بە گوتەو پەندی کوردی بەمەرجێك پڕاوپڕی مەبەستەکە بووبێت.(و)

[١] بەڵەدویستی: حب الأستطلاع.

لەوباوەڕەشدام هەندێك لە خوێنەرانی ئەم کتێبەش هەمان لوتبەرزیو خۆ بەزلزانینی من ڕووبەڕویان دەبێتەوە..

بەهەرحاڵ ئەو هەڵسوکەوتەی مرۆڤ خوویەکی عەقڵیەو تووشی هەموو مرۆڤێك دەبێتو بەدەگمەن یەکێك لە داوەکانی دەربازی دەبێت.

ئەو پێوەرەی "مەحاڵ" و "بوون"[1] لە بابەتەکاندا لەیەکدی جیا دەکاتەوە، لەواقیعدا پێوەرێکی ڕێژەییە، چونکە لەو دابونەرێتو زاراوەو بابەتە کۆمەڵایەتیانەوە هەڵدەقوڵێن کە "تاك" لەسەری ڕاهاتووە، یاخود لەدەوروبەرو خوێندنگەو یانەکانەوە بەسروش[2] بۆی هاتووە..بۆ نموونە: ئەو کەسەی ڕادێوی نەدیبێو هیچ شتێکی لە ئیزگەوە نەبیستبێ، باوەڕ بەکەسێك ناکات ئەگەر پێی بڵێت: شتێك هەیە دەتوانێت لەدووری هەزاران میلەوە دەنگی خەڵکانی ترت پێبگەیەنێت. هەریەکەش لەئێمە بەشێوەیەکی زۆر یان کەم وەکو ئەو کەسەین کەباوەڕ بەدەنگی ڕادیۆکە ناکات... پێکهاتەی عەقڵی لە سەرجەم مرۆڤەکاندا هاوشێوەو لێکچونێکی هەیە... خوێندەوارو نەخوێندەوار. لەسەروی مێشکی هەموو مرۆڤێکەوە دوربینێك هەیە، یاخود چوار چێوەیەکی فیکری هەیەو لەوێوە دەڕوانێتە گەردوون.. بۆیە هەرچی شتێك بکەوێتە دەرەوەی ئەو چوارچێوەوە باوەڕی پێناکات... دووکەس لەسەر حەقیقەتێك جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە، یەکێکیان بەڕادەیەك بڕوای پێیەتی هەروەکو بەچاوی خۆی بیبینێ، ئەوی دیان بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوەو بەقەناعەتی تەواوەوە نکۆڵی لێدەکاتو ڕەتی دەکاتەوە..

---

[1] بوون: لێرەدا مەبەست لە (ممكن)ە نەك "وجود".

[2] وەحی.

ئەگەر بەدوای سەرچاوەی ململانێ‌و جیاوازی ئەو دوو کەسەدا بگەڕێین سەبارەت بە حەقیقەتەکە، دەبینین جیاوازیو ململانێیەکەیان لەو چوارچێوەیەدایە کە هەریەکەیان لەوێوە بۆ حەقیقەتەکە دەڕوانێت.. لەوانەیە ئەو دووکەسەش لەڕێژەیەکی چونیەکی زیرەکیو هێزی بیرکردنەوەشدابن. بەڵام ئەو چوارچێوەی عەقڵی هەریەکەیانی گرتووە وایانلێدەکات یەکێکیان لەگۆشەیەکەوە بڕوانێتە حەقیقەتو ئەوی دیان لە گۆشەیەکی دیکەوە. هەردوو گۆشە نیگاکەش لەیەکدی جیاوازن. ئەوپەڕی گێلیو نەزانیە گەر بمانەوێت یەکێك بەهەمان شێوەو سەلماندن بخەینە سەر ئەو ڕوانین‌و بۆچوونەی خۆمان باوەڕمان پێیەتی... ئەگەر بمانەوێت قەناعەت بەیەکێك بێنین پێویستە لەسەرەتاوە چوارچێوە فکریەکەی بگۆڕین، کە ئەوەشمان کرد ئەو مرۆڤە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گوێ لەڕاو بۆچوون‌و بەڵگەو سەلماندنەکانمان دەگرێت.

لەو ڕوانگەیەشەوە دووبارەی دەکەمەوە: من لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەستم ئەوەنیە بەبۆچوونەکانم قەناعەت بە سەرجەم خوێنەران بکەم.. ئەو کەسەی وا ڕاهاتووە بەشێوەیەکی جیاواز بڕوانێتە حەقیقەت، هەرچەندێك ئێمە هێزی سەلماندنەکانمان بەهێزبێت مەحاڵە بتوانین قەناعەتی پێ‌بکەین. بەواتایەکی دی: من لەم کتێبەدا نامەوێت قەناعەت بەکەس بێنم تەنها ئەو کەسانە نەبێت کەخۆیان دەیانەوێت قەناعەت بکەن.

ئەم لێکۆڵینەوەیە پێچەوانەی سەرجەم دیدو بۆچوون‌و تێبینیەکانی مامۆستایان‌و نووسەران‌و ڕەوانبێژانی ئەم وڵاتەن لەهەموو بوارەکاندا وانەیان پێ گوتوینەتەوەو فێریان کردووین: ((هەرچ کەسێك سووربێت

لەسەر شتێك وەدەستی دێنێت[1]، یاخود هەرچ کەسێك بە ڕێگەیەکدا بڕوات دەگاتە جێ، دواڕۆژی مرۆڤ بەدەستی خۆیەتی، بەشێلگیری و ئیرادەو هەوڵدان و خەباتکردنی بێوچان چۆن بتەوێت خۆت دروست دەکەیت)).

ئەو ئامۆژگاریانە خراپ نین ئەگەر بەمنداڵ و قوتابییە سەرەتاییەکانی بڵێینەوەو هانیان بدەین بۆ کارکردن و بەردەوامبون لە خوێندن و دورخستنەوەیان لە تەمبەڵی و دەستبەرداری... بەلاّم ئامۆژگاریکردنی گەورەکان و زیاد ڕەوی کردن، ئەنجامێکی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە.

هەموومان زۆر جار لەژیانماندا بۆ ئەنجامدانی کارێك نەخشەمان داڕشتووەو هەوڵمانداوەو ئیرادەمان بەکارهێناوە. بەلاّم بینیومانە هەرچەندێك ئێمە چوینەتە پێش ئەو کارە لێماندورکەوتۆتەوەو گرانترو مەحاڵتر بووە، بەواتایەکی دی: هەرچەندێك ئێمە سورتر بووین لەوەدەستهێنان و بە ئەنجامگەیاندنی، ئەوەندە ئاڵۆزترو گرانتر بووە. بەپێچەوانەشەوە کارێك هەرچەندێك پشتگوێمان خستبێت و خۆمان لێنەبان کردبێت، ئەو خۆی دەدات بەدەستەوە، هەر لەکۆنیشەوە گوتراوە: "با" بەپێچەوانەی پاپۆڕەوە هەڵدەکات[1].

---

[1] من بۆ ئەو گوتە عەرەبیە (من جَّد وَجَدَ) ئەو ڕستەیەم بەچاك زانی لەوانەیە لە کوردیدا گوتەی لەوە ڕەوانترو ڕاستریش هەبێت. بەلاّم من نەمبیستووە (و).

[1] کێ لەئێمە لەژیانیدا ڕێکەوتی ئەوەی نەکردبێ شتێك زۆر پێویستمان بووەو هەموو سوچ و کەلەبەرێکی ماڵەکەمان پشکنیوە نەماندۆزیوەتەوە، بەلاّم پاش ماوەیەك ڕەنگە چەند چرکەیەك دوای دەستبەرداریمان لە دۆزینەوەی دوای ئەوەی کارمان پێنەماوە یاخود لەبیرمان چۆتەوە کوتوپڕو هەر لەخۆوە لەبەردەمماندا قوت بۆتەوە.

من لەکاتی لاوێتیمدا قوربانیەك بووم لە قوربانیانی ئەو پرنسیپە هیچ و پووچە (هەرچ کەسێك سووربێت لەسەر شتێك وەدەستی دێنێت).. زۆربەی کاتەکانم بەهەوڵدان و شێلگیری و جەخت کردنەوە بەسەر دەبرد، نەخشەو پلانی جێبەجێکردنی کارەکانم دادەڕشت. لەکۆتایشدا هەستم بەو ڕاستیەکرد کە وردە وردە لەشەڕی ژیاندا لاواز دەبم و کەمتواناتر دەبم و کەمتریش سەرکەوتوو دەبم، کەسانی تریش کە بەگوێرەی سروشتی خۆیان و بەبێ خۆماندوکردنێکی زۆر سەرکەوتنێکی گەورەیان لەژیانیاندا وەدەست دەهێنا.

زۆربەی زۆری کۆمەڵانی خەڵك باوەڕیان بە "بەخت" هەیە... لەوانەیە پاڵنەری سەرەکیش بۆ بڵاوبونەوەی باوەڕهێنان بەبەخت هەر ئەو پرنسیپەی سەرەوە بووبێت کە بەهیچ و پووچ ناومان هێنا.. مرۆڤ هەمیشە گوێبیستی ئەوە دەبێت سەرکەوتن و رزق و بالادەستی لە ئەنجامی هەوڵ و تێکۆشان و شەونخونی خودی مرۆڤدایە، بۆیە هەمیشە هەوڵدەدات بگاتە ئەو سەرکەوتنەی بۆی تێدەکۆشێت. بەڵام کە بەئاگا دێتەوە لەکاروانەکە دواکەوتوەو ئەوانەشی لەو کەمتواناترو هەوڵی کەمتریان داوەو ئیرادەیان لەو لاوازتر بووە پێشی کەوتوون و بەجێیان هێشتووە.. لەو کاتەدا ئەو هاوڕێ تێکۆشەرەمان سەرنەکەوتویی و کارەساتەکەی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ نەبوونی "بەخت" و دەکەوێتە گلەیی و گازەندەو گریان و قۆڕپێوان لە بەختە رەشەکەی، کەوەکو کەسانی دی یاوەری نابێت.

بەڵگە نەویستە "بەخت" بەو واتا باوەی کە کۆمەڵانی خەڵك لێی تێگەیشتوون بنەمایەکی ڕاستەقینەی نییە.. ئەو شتەش کە بناغەیەکی

زانستی هەیە بریتیە لە "هێزێکی ناهەستی و لەقولایی دەرونەوە هەڵدەقولێت و کاریگەرێتیەکی لەرادەبەدەری هەیە لە سەرکەوتن و بالادەستی تاکەکانی کۆمەڵدا".

ئەو جیاوازیەی لەنێوان تاکێك و یەکێکی دیدا دەبینرێت لەرادەی سەرکەوتنیاندا بۆ بابەتەکان.. سەرەرای ئەوەی هاوشێوەییەکی لەیەکچووی نێوانیان لە زیرەکی و هەوڵ و تێکۆشانەکانیاندا دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی یەکێکیان رێگە بە "هێزە ناهەستیەکانی" دەدات لەقولایی دەرونیەوە بێنە دەرێ و لەژیانیدا سودیان لێوەردەگرێت... بەلام ئەوی دیان بەدرێژایی کاتەکانی هەوڵدەدات و خۆی ماندوو دەکات، بەو شێوەیەش هێزە شاراوە ناهەستیەکانی سەرکوتدەکات و گوێ لە رێنماییەکانی هەنگاوە سەرسورهێنەرەکانی ئەو هێزانە ناگرێت.. بۆیە بێئەوەی خۆی بیەوێت لە رێگەی سەرکەوتنی کارەکەی دوور دەکەوێتەوە.

هەندێك وشەی وەکو "خۆماندوکردنی زۆر، هەوڵ و تێکۆشان و ...هتد" ئەو کارانە دژو پێچەوانەی ((پاڵنەرە ناهەستیەکانن)) هەروەکو لەبەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا لێیان دەدوێین.. بۆیە ئەو کەسەی سووربێت لەسەر جێبەجێکردنی کارێك زۆر هەڵە دەکات و کەمیش سەرکەوتوو دەبێت.

زۆربەی هۆکارەکانی سەرکەوتن و بالادەستی مرۆڤ لەئیلهامەکانی نەست و گوێگرتن لە سروشەکانیەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەگەر یەکێك لەکارێکدا پەلەی کردو هەوڵیداو ویستی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، هەر لەوکاتەدا سروشی هێزە ناهەستیەکانی پێشێل دەکات و بەرێگەی روخان و هەرەسی خۆیدا گوزەر دەکات.

ئێمە نامانەوێت لە گرنگی ئیرادەو هەوڵ و تێکۆشانەکانی مرۆڤ کەمبکەینەوە، یاخود نکۆڵی لەهەندێك سەرکەوتنەکانی تاك بکەینەوە. بەڵکو مەبەستمانە سنورێکی جیاکردنەوە دابنێین و ئەو بوارانە رونبکەینەوە کەئەو تاکە ناتوانێت بیانبەزێنێت.. هەندێك جار مرۆڤ پێویستی بەتێکۆشان و هەوڵدان هەیەو هەندێك جاری دی پێویستی بە پشتگوێخستن و ناموبالاتی و گوێنەدان هەیە.. مرۆڤی بەختەوەرو سەرکەوتوش ئەو کەسەیە هەردوو کاتەکە لەیەکدی جیابکاتەوەو لەهەریەکەشیاندا بەگوێرەی بارودۆخەکە هەنگاوبنێت و رێرەو وەرگرێت.

پێویستە خوێنەر ئەوەش بزانێت کەمن هەوڵم نەداوە هۆکارەکانی ئابوری پشتگوێ بخەم و گاڵتە بە کاریگەرێتی سیستمی سیاسی و گرنگی بکەم لەژیانی تاکەکانی کۆمەڵدا، چونکە بەڵگە نەویستە سیستمی هەڵوەشاوەو تەپیوی سیاسی و ئابوری تواناکانی تاکیش سەرکوت دەکەن و دەیمرێنن و رێگە لەبەکارهێنانی هێزە دەرونیەکانیشی دەگرن.. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا باس لە سیستمی سیاسی و ئابوری ناکەین و تەنها دەمانەوێت رۆبچینە قولایی دەرونی مرۆڤەوەو بەهۆکارو پاڵنەرە نەستیەکانی ئاشنابین کە دەبنە هۆی سەرکەوتنی تاکەکان و بالادەستی بەسەر ئەو کەسانەی لەهەمان بارودۆخی ئەودا دەژین.

سەرجەم سیستمە سیاسی - ئابورییەکان لەژمارەیەکی زۆری تاکەکان پێکدێن. لەنێو ئەوانەشدا سەرکەوتوو سەرنەکەوتوو هەن.

ئێمەش دەمانەوێت گرنگی بەلێکۆڵینەوەی ئەو هۆکارە دەرونیانە بدەین کە پاڵنەرێکن بۆ سەرکەوتنی تاکێك و سەرنەکەوتنی تاکێکی دی. لەهەموو سیستمێکدا سەرکەوتن و بالادەستی تەواو کارێکی دەگمەنەو تەنها خەڵکانێکی کەم وەدەستی دێنن.. چونکە ئەگەر سەرجەم کۆمەلانی خەڵك سەرکەوتووبن و بەهەمان پلەو پایەی یەکدی بچنە پێش ئەوکاتە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی ڕادەوەستێ و سەرجەم مرۆڤەکانیش وەکو شارە هەنگیان لێدێت کە شانەکان دروست دەکەن و هەنگوین کۆدەکەنەوە. هەر هەنگێك لەکارەکەی خۆیدا شارەزاو داهێنەرو ماندووە، لاسارییەك لەپورە هەنگەکەدا بەدیناکرێت. (هەزاران ساڵە ئەو کردارە دوبارە دەبێتەوە بەبێ ئەوەی پێشکەوتنێك لەکارەکەیاندا هەبێت).

بەلام پێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە ئەنجامی ئەو ململانێ و کێبەرکێ توندو تیژەدا دروست دەبێت کە هەموو تاکێك داهێنەر بێت و بەسەر ئەوانی دیدا زاڵ و سەرکەوتوو بێت

کەواتە پێشکەوتن لەسەر لاشەی قوربانیان دروست دەبێت، لاشەی ئەوانەی لەژیاندا سەرکەوتوو نەبوون و ئەوانی دیش بەسەر پشتی ئەماندا سەرکەوتون... کەواتە ئێمە باس لەو سەرکەوتنە ناکەین کە هەندێك کەس لەڕێگەی ماستاوکردن و خزمایەتی و واسیتەو خۆهەڵواسین و شتی ترەوە وەدەستی دێنن، ئەو ڕێگەیەی دەرون نزمەکان دەیگرنەبەر بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن... ئەو سەرکەوتنەی ئێمە لێی دەدوێین تاك و کۆمەڵ سوودی لێوەردەگرن، هەر ئەو سەرکەوتنەشە نەوە لەدوای نەوە کاریگەرێتیەکەی کەمنابێتەوە. سەرکەوتنی داهێنەرو زاناو لێکۆڵەرو مامۆستاو پزیشك و ئەندازیارو بازرگان و سەرکردەو...هتد. هەر

ئەوانیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ داهێنانێکی نوێو بەرهەمێکی نوێ دەخەنە سەر کەلتووری شارستانیەتی مرۆڤایەتی.

بەشێوەیەکی زانستی ئەو ڕاستیە سەلمێندراوە کەبەشێکی زۆری ئەو سەرکەوتنە نەمرانەی لەمێژوودا کەسانی سەرکەوتوو پێی گەیشتوون لەئەنجامی ئەو ئیلهامەوە هاتووە کە لە قوڵایی نەستەوە بەدیاری بۆیان هاتووەو زانیویانە چۆنی بەکاردێنن.

بابەتی هێزە دەرونیەکان، بابەتێکی زۆر نوێیە.. لەساڵی (١٩٣٠)یەوە نەبێت بەم شێوە تەجریبیەی ئێستای دەستی پێنەکردووە. دەتوانین ئەو ساڵە بەخاڵی گۆڕانکاری دابنێین لەمێژووی بیری مرۆڤایەتیدا... زانکۆی (دیوك) لە ئەمریکا بەشێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەی هێزە شاراوەکان کردەوە.. لێکۆڵینەوەیەکی تاقیگەیی و لەژێر چاودێریی پرۆفیسۆر (ڕاین)دا بوو.. ڕاین – Raen چەندین کتێبیلەوبارەیەوە نوسی و سەرجەم ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوانەی تێدا باس کردوەو لەناوەندە زانستیەکانیشدا مشتومڕێکی زۆری نایەوە. لەسەرەتادا زاناکان بە گاڵتەپێکردنو نکۆڵیلێکردنێکی زۆرەوە ڕووبەڕوی ئەو لێکۆڵینەوانە بوونەوە. مامۆستاو دامەزراوە زانکۆییەکانیش بەرپەرچیان دەدایەوەو بەهەرەسو بەربەستێکی بەردەم پێشکەوتنی زانستو گەڕانەوە بۆ سەردەمی خورافاتو بیرو باوەڕە سەرەتاییەکانی مرۆڤیان لەقەڵم دەدا.. بەڵام زانکۆی (دیوك) سووربوو لەسەر نەخشەکەی بەمەبەستی هاندانی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی ئەو بابەتە. لەدواییدا وردە وردە مشتومڕەکە هێورو کەمتر بوەوە. زاناکانیش دوای ئەوەی ئەنجامە ئەزمونگەریەکانیان

بینی بە بۆچوونو دیدێكی جیدییەوە لێیان دەڕوانی... پەیتا پەیتا زۆربەی زانكۆكانی دیش ئەو بابەتەیان خستە پرۆگرامی خوێندنیانەوە دوا هەواڵیش لەوبارەیەوە دەڵێت: هەندێك زانكۆی بەناوبانگی وەكو ئۆكسفۆردو كمبردوگ لەڕێگەی زەمالاتەوە هاندەرێكی بەهێز بوون بۆ ئەو بابەتە.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا (هێزە دەرونیەكان) بابەتێكی تاقیكراوەی پەسەندنو ئەو مامۆستاو زانایانەش كە پلەیەكی زانستی بەرزیان هەیە لێی دەكۆڵنەوەو تاقیگەی نوێی بۆ دادەمەزرێننو كتێبەكانی زانكۆش بەرهەم دێنن[1].

---

(1) مەخابن كۆمەڵگەی كوردەواری هیچ ئاگایەكی لەو پێشكەوتنە زانستیانە نییەو بەپێچەوانەشەوە هەروەكو سەدەكانی ناوەڕاست لەم ساڵانەی دواییدا بەشێوەیەكی زۆر نازانستیانە لێشاوی گەرانەوەیەكی ترسناك ڕووەو كارە سەرەتاییەكانی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بوینەتەوە لە خورافات، گەڕەكێك نیە كۆلكە شێخێك (لەگەڵ ڕێزدا بۆ شێخانی تەریقەت و پیاوچاك و لەخوداترس)، یاخود فێلبازێك لەخۆنەگرێتو لە ژوورە تاریكو تەنیاكاندا خەریكی وشە پڕوپوچەكانی وەكو (سیحری ڕەشو سیحری سوور و تەڵسمو ...هتد) نەبن.. من ساڵانێكی دورو درێژ هەموو ئەو كتێبانەم خوێندۆتەوە بەمەبەستی زانینی بنەماو بناغە زانستیەكانی، بۆ ئەو مەبەستەش لێكۆڵینەوەیەكی تێرو تەسەلی بەراورد كاری ئەو كتێبانەو زانستی پاراسایكۆلۆژیم ئامادەكردوەو بەهیوام پاش ماوەیەك بكەوێتە بەردیدی خوێنەران.
نكۆڵی لەو ڕاستیەش ناكرێت لە بەرابەریشدا ڕێڕەوێكی زانستیانەی كەم وە بەرگیراوە بۆ گەیشتن بەبنەما زانستیەكانی ئەو بابەتە. بەڵام ئەو بەڕێزانەش هەر كە ئەلفوبێیەكی سەرەتایی ئەو زانستە فێربوون لە (خەواندنی موگناتیسیو ...هتد) لەخۆبایی دەبنو خۆیان بە مامۆستای ئەو بوارە دەزانن و بەبێ ئەوەی لە ئەنجامە ترسناكەكانی بەهەڵە بەكارهێنانی ئەو زانستە ئاگادارین، دەیان تاقیكردنەوە لەسەر مرۆڤی لاوازو نەخوێنەواری كورد دەكەن. كار گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی هەندێك لە كەناڵەكانی ڕاگەیاندنیش پڕۆپاگەندە بۆ هێزو توانای ئەو كەسانە بكەن.(و).

جارێکیان سەبارەت بە بابەتی (هێزە دەرونیەکان) لەگەڵ یەکێك لە ڕوناکبیرە بەناوبانگەکانی خۆماندا گفتوگۆم دەکرد.. من دەمگوت مرۆڤ لەقوڵاییەکانی عەقڵی ناوەوەیدا هێزێکی نائاسایی ئەوتۆی هەیە بەربەستەکانی شوێن و کات دەبەزێنێت.

ئەو یەکسەر گوتەکەی پێبڕیم و بەگاڵتەجاڕیو بەدرۆخستنەوە وەڵامی دامەوە: پیاوێکی وەکو تۆ چۆن و بەچ شێوەیەك باوەڕ بەو قسە پڕوپووچانە دەکەیت کە لەگەڵ لۆژیك و بیرکردنەوەی ڕاست و دروستدا ناگونجێت... منیش لای خۆمەوە توشی سەرسوڕمان بووم: چۆن پیاوێکی وەکو ئەو کە خاوەنی پلەیەکی بەرزی ڕوناکبیرییە، بەو شێوە یەکلاکەرەوەیە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە زانستیە تەجریبیانە بەبیانوی (پێچەوانەی لۆژیك و عەقڵ) ڕەتدەکاتەوەو لەوەش بێئاگایە کە ئەو پێوەرە لۆژیکی و عەقڵیانەی ئەو لێی دەدوێت ڕێژەیین و پشت بە زاراوەو دابونەریتە شارستانیەکان دەبەستن و گۆڕانی ئەو دابونەریتانەش پێوەرە لۆژیکیو عەقڵیەکانیش گۆڕانکاریان بەسەردا دێت.

کەواتە چی جیاوازیەك هەیە لەنێوان ئەو ڕوناکبیرەی گاڵتەی بە گوتەکانم کردو ئەو نەخوێندەوارە توندڕەوەی بنەماکانی زانستی نوێ ڕەتدەکاتەوە.

بە هەرحاڵ لەوەزیاتر ناتوانین لۆمەی ئەو ڕوناکبیرە ڕێزدارە بکەین، چونکە لەمەوبەر گوتمان هەموو مرۆڤێك نکوڵی لەو شتە نوێیانە دەکات کە پێچەوانەی پێکهاتە فیکریەکانی لەوەو بەری بێت. لەڕاستیشدا بابەتی هێزە دەرونیەکان زۆر نامۆیە بەو چەمکەو گۆتە لۆژیکیانەی لە قوتابخانەکاندا فێری بووین.

ئەگەر یەکێك لەو دوربینە سەرەتاییەی کە (گالیلۆو نیوتن)، یاخود (داروینو باستور) بەکاریان دەهێنا، بڕوانێتە گەردوون ناتوانێت بەئاسانی باوەڕ بە هێزە شاراوەکانی دەروون بکات، کە لە ڕێگەیانەوە مرۆڤ دەتوانێت عەقڵو بیرکردنەوەی بەرامبەرەکەی بخوێنێتەوە، یاخود لەودیوی پەردەو بەربەستەکانەوە شتەکان ببینێ، یان پێشبینی هەندێك شت بکات کە لەداهاتوودا ڕوودەدەن.

زۆر کەس لەوانەی لەو بارەیەوە گفتۆگۆم لەگەڵ کردوون بە ڕاشکاویەوە پێیان گوتووم: عەقڵیان ناتوانێت باوەڕ بەو شتانە بکات، چونکە بەرهەمی خورافاتو فڕوفێڵن... کە لێشیان دەپرسی بۆچی؟ سەر ڕادەوەشێننو هیچ وەڵامێکیان نییە.

ئەگەر یەکێك بەر لە دروستکردنی تیشکی وێنەگر[1] بهاتایە لای ئەو هەڤاڵانەو پێی گوتبان: شتێك هەیە پزیشك بەهۆیەوە دەتوانێت ناوسکی مرۆڤ ببینێ. پێیان دەگوت: درۆ دەکەیت.. بەڵام ئەوانە ئەمڕۆ تیشکی وێنەگر بە کارێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدەنو بەلایانەوە جێگەی سەرسوڕمان نییە.. کێ دەڵێت سبەینێ باوەڕ بەهێزە دەرونییەکانی مرۆڤ ناهێنن، دوای ئەوەی ئەم بابەتە نوێیەی ئەمڕۆ، سبەی دەبێتە بابەتێکی کۆنو هەروەکو زانستەکانی فیزیاو کیمیا دەکەوێتە پرۆگرامەکانی خوێندنەوە.

من سەرم سوڕ دەمێنێ یەکێك باوەڕی بە تیشکی وێنەگرو ڕادارو تەلەفزیۆن هەبێت و نەتوانێت باوەڕ بە هێزە دەرونییەکان بکات، ئەو باوەڕ بەو ئۆتۆمبێلە دەکات کە هەڵی دەگرێتو دەیگوێزێتەوە، بەڵام

---

[1] تیشکی وێنەگر: الأشعة.

باوەڕی بەخودی مرۆڤ نییە.. ئەو مرۆڤەی لەپێکهاتەی لەشیدا چەندین شتی سەرسوڕهێنەری تێدایە کە لەژمارە نایەن... لەو ساڵانەی دواییدا زاناکان چەندین شتی سەر سوڕهێنەری کارەبایی و شەپۆلە کارەباییەکانیان لە نهێنیەکانی لەشی مرۆڤدادۆزیوەتەوە، کە خودی خۆشیان لەو هێزانەی لەشی مرۆڤ واقیان وڕماوە.. لەوانەیە لە پاشەڕۆژیشدا چەندین جۆری جیهازی عەسەبی ورد بدۆزنەوە کە ڕادارو تەلەفزیۆن لەئاستیدا زۆر بێواتاو بێتواناو سەرەتایی بن.

دەگێڕنەوە لەسەدەی حەڤدەدا کاتێك (ولیام هارفی) خوولی خوێنی دۆزییەوەو بەجیهانی ڕاگەیاند کە دڵ وەکو ترومپایەك وایەو لەڕێگەی خوێنبەرو خوێنهێنەرە تایبەتیەکانەوە خوێن دەگەیەنێتە هەموو لەش و بەپێچەوانەشەوە..خەڵکی گاڵتەیان پێکردوو بە گاڵتە جاڕییەوە پێشوازیان لەو بۆچوونەی دەکرد. باوەڕیان نەدەکرد لە لەشی مرۆڤدا ئەو کۆئەندامە تۆکمەیە هەبێت.. ئەمڕۆش دوای پێشکەوتنی زانستی فەسلەجە ئەوە سەلمێندراوە کە چەندین کۆئەندامە وردترو تۆکمەتر لە لەشیمرۆڤدا هەن کە چەندین جار لەدڵ کارامەترو وردترن.

مێژووی هێزە دەروونیەکانی مرۆڤ زۆر کۆن و دوورو درێژە بەڵام گیروگرفتی سەرەکی لەمێژووی ئەو هێزانەدا ئەوەیە لەکات و شوێنە جیاجیاکانی مێژوودا لەلایەن سیحربازو قەشەو شێخەکانەوە بەکار هێنراون.. بۆیە لەزۆربەی سەدەو سەردەمەکاندا ئاوێتەو تێکەڵاوی فڕوفێڵ و هەڵخەڵەتاندنی کۆمەڵانی خەڵك کراون... ئەوەی جێگەی داخێکی زۆرە لەکۆندا مرۆڤ ئەو هێزەیان دەبردەوە سەر هەندێك هێزی ڕۆحی و غەیبی، بۆیە دەبووە هێمایەك بۆ خورافات و پاڵپشتێکی بەهێزیش بۆ زۆربەی بزوتنەوە توندڕەوو

دواکەوتوەکان[1]، لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستداو ئەو کاتەی ڕێنیسانسی زانستەکان دەستی پێکرد کاردانەوەیەکی توندو تیژ سەری هەڵدا، بەرامبەر باوەڕ بوون بەو هێزانە... گرنگی و ناوەڕۆکی زاناکانی ئەو سەردەمە ئاراستەی تێکشکاندنی خورافات و بیرکردنەوە غەیبییەکان بوو لە هەموو لایەنەکانەوە. نەیاندەتوانی لەڕێگەی ئەو زانستە نوێیەوە قەناعەت بە کۆمەڵانی

[1] ١-: لەکۆمەڵی کوردەواریدا هەتا ئێستەش هەر بە عەقڵیەتی سەدە کۆنەکانەوە لەو هێزانە دەڕوانن... من برادەرێکم هەیە، کوڕێکی هەیە توشی یەکێك لە نەخۆشیە دەرونیەکان هاتووە، ساڵانێکە ئەم پزیشك و ئەو پزیشکی پێدەکات... کار گەیشتۆتە ئەوەی (دڵنیام لە خۆشەویستی کوڕەکەیدایە) باوەڕی بەوە هێناوەو دەیباتە لای پیاوێك کە لەو بزوتنەوانەدایە کە عەلی وەردی باسی دەکات. چەندین کاتژمێر ئەو نەخۆشە بەستەزمانە لەبەردەمیدا دادەنێت و شتی بەسەردا دەخوێنێت بۆ ئەوەی شەیتانەکان لەسەری دەربهێنێت. من لەو باوەڕەدام ئەو برادەرەم خودی خۆشی باوەڕی بەو هەنگاوەی نییە بەڵام لەلایەك کەمتوانایی چارەسەرە پزیشکیەکان و لەلایەکی دیکەوە ئەو چوارچێوە فیکریەی دەوری عەقڵیان داوەو لە ئەنجامی دابونەریتە باوەکاندا بەسەریدا چەسپیوە ناتوانێت لێی دەربازبێت و ڕووەو ئەو کارەی بردووە.

٢-: بۆچی دوور بڕۆین.. بەسەرهاتێکی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە، ساڵانێك لەمەوبەر بڕێك پارەم لە ڕێگەی یەکێکەوە بوو بە قوربانی:

یەکەم: بۆ تاقیکردنەوەی هێزو تواناکانی یەکێك لەوانەی خاوەنی هێزێکی دەرونین و ناوبانگێکی گەورەی هەیە و پارەیەکی زۆریشی کۆکردۆتەوە.

دووەم: چوارچێوە فیکریەکەی خۆشم پاڵی پێوەنام و هەتا ئەو کاتەش باوەڕم بە هەندێك شتی لەو بابەتە هەبوو.. چومەلای ئەو بەڕێزە و بێئەوەی یەك وشە بڵێم لە پارچە کاغەزێك ناوی یەکێکی بۆ نوسیم و گوتی ئەو پارەکەی بردووە. منیش گوتم نەخێر وانیە، بەڵام ئەو دوبارە لەکاغەزێکی دی بۆی نوسیم (...، پارە، دز) من لەوساتەدا حەپەسام و (١٠) دینارم خستە ژێر دۆشەکەکەوەو چومە دەرێ، بەڵام هێندەی دی گیروگرفتەکەم گەورەتربوو چونکە ئەو ناوەی ئەو نوسیبووی هاوڕێیەکی نزیك و خۆشەویستم بوو... لەشارێکی دی پیاوێکی دی هەبوو هەمان بانگەشەی گەورەیی خۆی و ئیمانداری خۆی دەکرد... بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانەی مێشکی دەکرۆژتم چومە لای

**خەڵك بێنن. تەنها توانیان سەرجەم عەقیدەو ئەفسانە باوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست تێکبشکێنن.. بەو شێوەیە توندڕەوی دژی هێزە دەرونیەکان لەسەدەی نۆزدەهەمدا گەیشتە چڵەپۆپەی ..زاناکانیش گەیشتبوونە پلەی لەخۆبایی بوون لەو شتانەی کە دۆزیبویانەوەو ئاشکرایان کردبوو، لەو تیۆریانەی لەزانستە سروشتیەکانەوە**

ئەویش، هەر لە دەرگەوە چوومە ژووریَ چەند ژنێکم بینی لەژورێکدا بەسترابونەوەو دەیاننالاًند، کە لەو دیمەنە ترسناکەم پرسی یەکێك لەپاروو چەورەکان پیَی گوتم: ئەمانە شێتن و کاك (.....) چاکیان دەکاتەوە. حەوشە گەورەکەی پڕی بوو لە سەگی ڕەشو زەبەلاحی گەورەو پشیلەی ڕەنگاوڕەنگ.. بەهەرحاڵ چومە خزمەتی جەنابی بەناو شێخ. کەشی پێکهاتەی ژوورەکەو ئەو وێنەو شمشێرو خەنجەرانەی بەدیوارەکانەوە هەڵواسرابوون پیاویان دەتۆقاند. بەڕاستیش گەنجێکی موو ڕەشی قۆز بوو... لیَی پرسیم فەرموو گوتم: شتێکم لیَ ڕویداوە... فەرمووی تۆ جاریَ واز لەو قسانە بێنە ژنت هێناوە، گوتم: جەناب من لەشارێکی ترەوە هاتوومو دەبیَ بگەڕێمەوە، کارێکم لای جەنابتە گەر دەزانی ئەو گومانەی مێشکی خواردووم پێم بڵیَ.. بەلاًم ئەو سوور بوو لەسەر گوتەکەی خۆیو گوتی: من پێنج ژنم هێناوە، یەکێکم لە کوەیت و ئەوی دیانم لە سعودیە بەجیَهێشتووە، ئێستاش سیانی دیکەم هەیە. ژن گەورەترین نیعمەتی خودایە بۆ مرۆڤ... بە تەمابوو هەرچی شتێك لە کازانتزاکی و لەزمانی زۆرباوە سەبارەت بەژن گوتراوە بەمنی بفرۆشێت.. دڵنیاشم تازە لە خوێندنەوەی ڕۆمانی زۆربا ببوەوە، چونکە زۆربەی گوتەکانی زۆربایی بوون. من دیسانەوە گوتەکەم پیَبڕی بەبیانوی ئەوەی ڕۆژ لەتەواوبوندایەو دەبێت بگەڕێمەوە شارەکەی خۆم... تێگەیشت من کێڵگەیەکی چاك نیم بۆ ئەو گوتانەی.. بەهەناسەیەکی قووڵەوە تەماشایەکی بنمیچەکەی کردوو چاوەکانی چووقاندو چەند چرکەیەك بەو حاڵەتە مایەوەو پاشان کردنیەوە. سەری هێنایە ئاستی روانینەکانی من و گوتی: چییە ئەو بابەتەی بۆی هاتووی... گوتم حەزم دەکرد تۆش بەرلەوەی من بدوێم وەکو جەنابی کاك (.....) خۆت پێم بڵیَی بۆچی هاتووم.. بەهەر حاڵ من بڕێك پارەم نەماوەو حەز دەکەم ناوی ئەو کەسەم پیَبڵیَی کە بردویەتی. دیسانەوە سەری بڵند کردەوە بۆ بنمیچەکەو چاوەکانی نوقاندەوەو بەجوولەی ریشە ڕەشەکەیدا دیاربوو هەندێك شت لەبەر خۆیەوە دەڵێت.. لەپڕێکدا چاوی کردەوە...

وەدەســتیان هێنــابوو. بەشـــێوەیەك لــەوباوەڕەدا بــوون گەیشــتوونەتە سەرجەم نهێنیەکانی گـەردوون و تەنـها چـەند وردەکارییـەکی کـەم مـاوە ئەویش زوو یا درەنگ دەیگەنێ.. دەتوانین سەدەی نۆزدەهەم نـاوبنێین "ســـەدەی لەخۆبایی بوونی زانســــــت".. لەخۆبایی بوونی زاناکانی ئەو

سوورو سپیەك... نەخێر نەخێر ئەسمەرێکی گەنم ڕەنگەو بالاّشی مام ناوەندییە.. گوتم ناوەکەیم پێبڵێ، ئـەم جارەیـان لەگـەڵ چاونوقاندنەکـەیدا چـەند نـاوێکی بـەدەنگێکی نیمچە بیستراوو دەگوت و بانگی لەچەند ناوێکی دیکەش کرد... چەند جارێك سەری ڕاوەشاندو گوتی: بەداخەوە ناوەکەیم پێنالێن.. بەلاّم دڵنیام ئەوەی ئەو پیاوەی تـر پێی گوتی ئەو نییە..

سوپاسیم کردو ژورە ترسناك و ماڵە گەورەو پڕ لە سەگی زەبەلاح و پشیلەی ڕەنگاو ڕەنگ و ژنی نەخۆشم بەجێهێشت. بەلاّم ئەمڕۆ شیکردنەوەیەکی دیکەم هەیە بۆ ئەو دوو بەڕێزە: یەکەمیان کە ناوەکەی بۆ نوسیم خاوەنی هێزێکی دەرونـی و ناهەسـتیە. مێشـك و بیرکردنـەوەی بەرامبەرەکـەی دەخوێنێتـەوە. چونکـە ڕۆژێـك لەوەوبـەر ئــەو هاوڕێیەم کە ئەو ناوەکەی نوسی لەماڵمان بوو، ڕەنگە بەر لەچوونە ژوورەوەشم هەموو ئەوانەم هێنابێتەوە یـاد کـە ئەگـەری بردنـی پارەکـەیان هـەبووبێت.. ڕەنگـە لەمێشـکی خۆشمدا سەرنجی تەواوم خستبێتە سەر ئەو برادەرەم.. ئێستەش ئەو شێخە بەڕێزە هێزە دەرونی و ناهەستیەکانی بەکاردەهێنێت و ڕۆژانە دەیان کەس دەچێنەلای. هەروەکو د. علی وەردێش دەڵێت: مەرج نیە هەموو کاتێك هێزە دەرونیەکان ڕاستی بپێکن.

هەر ئەو بەڕێزەی باسی لێوە دەکەین جارێکی دی من لە قوتابخانەیەك مامۆستابووم، ئەویش دراوســێی قوتابخانەکـە بووبەڕێوەبـەر و یـاریدەدەرو مـن چوینـە خزمـەتی بـۆ ئەوەی تاقمێك قەنەفە بۆ قوتابخانە نوێیەکە بکرێت. هەر کە چووینــە ژوورەوە پــێی گوتین: ئێوە بۆ ئاشکراکردنی دزییەك هاتوون و منیش ئەو کارانە ناکەم. ئەو گوتەیـەی زۆر دووربـوو لـە ناوبـانگ و شـارەزاییەکانی، بـەلاّم کەسـی دووەمیــان: خــاوەنی ژن و پشیلەو سەگەکان لەچینی دووەمیانە. هیچ هـێزێکی دەرونـی تێدانـەبوو. بـەلاّم خـەڵکی سادەو نەخوێندەوار هـەتا خوێندەوارەکـانی وەکـو منیشـیان هەڵدەخەڵـەتاند.. ڕەنگـە چـەند هـێزێکی ناهەستیشـی هـەبووبێت، بـەلاّم لەڕێگـەی خورافات و تـرس و تۆقاندنــەوە پیادەی دەکرد.

سەردەمە وەکو ئەو خوێندکارانەی زانکۆبوون کە بۆ یەکەمجارو لەپۆلی یەکەمدا ئەو زانیاریانەی وەری دەگرن تووشی سەرسوڕمانیان دەکات و وادەزانن سەرجەم نهێنیەکانی زانست فێربوون، دەتوانن هەموو گیروگرفتەکان چارەسەر بکەن... ڕوناکبیرەکانی ئێمەش تائێستاش لە عەقڵیەتی سەدەی نۆزدەدا دەژین، نازانن ئەو عەقڵیەتە ئەمڕۆ بوەتە شتێکی کۆن و بەسەرچوو. زاناکانی سەدەی بیست بەو عەقڵەیەتە پێکەنین و زانایانی سەدەی بیست و یەکیش بەوانی سەدەی بیست پێدەکەنن.

زاناکانی سەدەی نۆزدە ئەوەندە باوەڕیان بە "مادده" هەبوو، هەرچی شتێك ئەگەر لێکدانەوەیەکی ماددی بۆ نەکرایە نکۆڵیان لێدەکرد... "یوختر" لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا کتێبێکی لەژێر ناوی "هێزو مادده"دا نوسی. هەوڵی دابوو لەڕێگەی کارلێکی ماددەو جووڵەوە هەموو شتەکانی نێو گەردوون لەبچوکترینیانەوە بۆ گەورەترینیان شی بکاتەوە....ئەو کتێبە ببووە گەورەترین (سەرچاوە) مادییەکانی سەدەی نۆزدەو بە ئینجیلی خۆیانیان لەقەڵەم دەدا کە هیچ بەڵگەو سەلماندنێکی ناوێت... گیروگرفتی ئەوان لە تێڕوانینی توندڕەویاندا نەبووە بۆ مادده. بەڵکو ماددەیان بەو حەقیقەتەی نەدەناسی کە لەم دواییانەدا پەردە لەڕووی نهێنیەکانی هەڵدرایەوە.. ئەگەر پرسیارت لە یەکێکیان بکردایە: مادده چیە؟ سەریان لە پرسیارەکەت سوڕدەماو ئەوان لەو باوەڕەدابوون مادده شتێکە پێویستی بە ناساندن نییە. مادده بەلای ئەوانەوە ئەو شتە بوو کە دەبینرێت و دەستی لێدەدرێت و لەدەورپشتماندا هەستی پێدەکەین..

کەواتە تێگەیشتنی ئەوان بۆ مادده هیچ جیاوازیەکی نەبوو لەگەڵ بۆچوونی یەکێکی سەرجادەدا بۆ تێگەیشتن لە مادده.. نکۆڵی لەوەش ناکرێت لەو سەردەمەدا ئەوان تیوری (گەردیلە) یان دۆزیەوە، بەلام ئەوەشیان لە تیوریەکی یۆنانی کۆنەوە وەرگرتبوو.

لەزانستی ئەمڕۆشدا تیوری گەردیلە بەکارێکی زۆر ئاسایی و سادە لەقەڵەم دەدرێت. ناوەڕۆکەکەی دەڵێت: مادده لەگەردیلەی بچووك پێهاتووە.. ماهیەتی ئەو گەردیلانەش لەڕوانینی ئەواندا جیاوازی نییە لەگەڵ هەرچ پارچە ماددەیەکی دیکەدا، تەنها ئەوەندە نەبێت هێندە بچوکە شایەنی کەرتکردن نیە.. ئەو تیوریەیان هەندێك سوودی هەبوو بەشێوەیەك توانیان لەو ڕێگەیەوە بڕێك لە پێکهاتە کیمیاویەکان شیبکەنەوە.. بەلام لەدۆزینەوەی ماددەو ماهیەتە بنەڕەتیەکەیدا سوودێکی ئەوتۆی نەبوو.. زاناکان هەتا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم حەقیقەتی ماددەیان نەدۆزیەوە.. لەساڵی ١٨٦٩ دا یەکەم هەنگاو بۆ دۆزینەوەی ناوەڕۆکی گەردیلە نرا سەبارەت بەو نهێنیە زۆر گەورانەی تێیدایە. ئەو هەنگاوەش لەلایەن زانایەکەوە بوو کەناوی (هنری بکریل) بوو.. هنری لەمانگی شوباتی ١٨٩٦ دا جۆرێك لەتیشکی بینی کە لەیەکێك لە پێکهاتە کیمیاییەکانەوە دەردەپەڕی. پاشان لێکۆڵینەوەو دۆزینەوە سەرسوڕهێنەرەکانی بەردەوام بوون. لەکۆتاییدا لێکۆڵەرەوەکان گەیشتنە ئەوەی ئەو ناوەرۆکە تاك و تەنهایەی وایان دەزانی لەوە زیاتر کەرتناکرێت بریتیە لەجیهانێکی پڕ لەهێزی گەورەو لەو شەپۆلە کارەباییانە پێکهاتووە کە لەشێوەی بازنەیەکی سەیردا بەدەوری ناوکێکدا دەسوڕێنەوە، هەروەکو سوڕانەوەی ئەستێرەکان بەدەوری خۆردا.

ئەو دۆزینەوە زانستیە بیری مرۆڤایەتی سەرەوخوار هەڵگێڕایەوەو فەیلەسوفەکانی خستە حاڵەتێکی حەپەساوی و واقوڕماویی تەواوەوە.. فیزیای سەدەی بیستەم جیاوازیەکی زۆری هەبوو لە فیزیای سەدەی نۆزدەهەم، هەروەکو ڕاداری نوێو دوربینەکەی ناپلیۆنی ڕەحمەتی.

کاتێك یەکەم تەقینەوەی چەکی ناوکی ڕوییدا، خەڵکی سادەی تووشی سەرسوڕمانو تۆقاندن کرد.. لەڕاستیشدا تەقینەوەی ناوکی شتێکی ئەوتۆ نەبوو بەرامبەر ئەو تەقینەوە گەورەیەی لەمێشکی زاناکاندا ڕوویدا سەبارەت تێڕوانینیان بۆ گەردوون... ئەگەر ئەمڕۆ زانایەکی سەدەی نۆزدە زیندوبێتەوەو ئەو پێشکەوتنەی لەبواری نهێنیەکانی گەردوونو ماهیەتی ماددەدا ڕویداوە ببینێ، لەوانەیە ببورێتەوەو کەهاتەوە هۆش باوەڕنەکات. یاخود بەبێ سێودوو ئەو شتە بەدرۆ دەخاتەوەو نکۆڵی لێدەکات بەو بیانووەی کارێکی ناماقووڵو مەحاڵە.

ئەمڕۆ زاناکان لەو خاڵەدا یەکدەگرنەوە کە ماددە بەگوێرەی تێگەیشتنی زاناکانی سەدەی نۆزدەهەم نیە، چونکە ئەو مادەیەی بەدەستەکانمان دەیگرینو هەستی پێدەکەین لەڕوانینی ئەوانەوە وەهمێکە لەوەهمەکانی هەستو لەشەپۆلە کارەباییەکان پێکهاتووە، و لەبوارێکی بچووكو تەسکدا چڕبۆتەوە.. هەندێك لە زاناکانیش دەڵێن: هیچ جیاوازیەکی جەوهەری نیە لەنێوان ئەو پارچە ماددەیەی بە دەستەکانمان دەیگرینو ئەو تیشکە ڕوناکییانەی بەرچاوەکانمان دەکەون، هەریەکەیان بریتیە لە شەپۆلە کارەباییەکان. تەنها جیاوازیش ئەوەیە شەپۆلەکانی مادە چڕبونەتەوەو لەناو بازنە بچوکەکاندا

دەخولێنــەوە، بــەڵام شــەپۆلە تیشــکیەکان بەشــێوەیەکی ســەربەخۆ لەگەردوندا بڵاوبوونەتەوە.

ئـەو تێگەیشـتنە نوێیـە بـۆ مـاددە لـەخۆبایی بوونـی زاناکـانی تاڕادەیـەکی زۆر کـەمتر کـردەوە... زاناکـانی سـەدەی نۆزدەهـەم جگـە لەوشتانەی هەستی پێدەکرێت باوەڕیان بەشتی تر نەدەکرد.

بەو پێودانگەی کە هەستەکان تاقە پێوەرن بۆ جیاکردنەوەی حەق‌و ناحەق. بەڵام زاناکانی سەدەی بیست گومانیـان لـەپێوەرە هەستیەکان پـەیداکرد.. بەتایبـەتی کـاتێك ئـەو شـتەیان دۆزیـەوە کـە لـەودیوی هەستەوەرەکانەوە هەن. لەجیهانێکی شاراوەی دەسـەڵاتدار کـە تەنـها لەڕێگەی هاوکێشە بیرکاریەکان‌و گریمانە وەهمیەکانەوە پێی دەگەن.

(بلانك) و (ئەنشتاین) کۆمەڵێك تیۆریان لەسەر ماددە هێنایە گۆڕێ کـە عـەقڵ بـاوەڕی پێناکـات‌و پـێی هـەرس نـابێت. ئـەو تیۆرانـەش پێچەوانەی بنەما لۆژیکیەکانن کە لەبیرکردنەوەماندا پشتی پێدەبەستین. هـەر ئـەوەش بانگهێشـتمان دەکـات بـۆ دۆزینـەوەی لۆژیکێکـی نـوێ کـە جیاوازیـەکی بنـەڕەتی هەیـە لەگـەڵ ئـەو لۆژیکـە کۆنـەی لەڕێگەیـەوە دەمانڕوانییە گەردوون.

ئـەو کەسـەی بیـەوێت سروشـتی مـاددەو گـەردوون لەڕێگـەی ئـەو لۆژیکـەی ئـەمڕۆ لەخوێندنگـەو زانکۆکانمانـەوە فـێری دەبـین بناسـێت‌و ئاشنای بێت، ڕوبەڕووی بەربەستێکی گەورەی فیکری دەبێتـەوە.. لـەو ڕێکەوتنەداو لەهەمان کاتدا کە زاناکانی فیزیاو بیرکاری دەچوونە قوڵایـی پێکهاتەو ماهیەتی ماددەوەو پەردەیان لەڕووی نهێنیە سەرسوڕهێنەرەکان

هەڵدەدایەوە کۆمەڵێکی دی لە زاناکان چوونە قوڵایی دەروونی مرۆڤەوەو پەردەیان لەڕووی ئەو هێزە سەرسوڕهێنەرانە هەڵدایەوە.

کەواتە سەدەی بیستەم دوو کودەتای گەورەی بەخۆیەوە بینی: یەکەمیان: لەلێکۆڵینەوەی بوارەکانی ماددەداو ئەوی دیکەیان لەلێکۆڵینەوەی پێکهاتەکانی دەروندا... ئەو شتەی شایەنی سەرسوڕمانە هەردوو کودەتاکەش ئاماژە بەیەك ئەنجام دەکەن، دوای ئەوەی زاناکانی فیزیا بۆیان ڕونبوەوە کە ماددە بریتیە لە شەپۆلە کارەبابییەکان، زاناکانی بواری لێکۆڵینەوەی دەرونیش، لە دەرونی مرۆڤدا چەندین تیشك دەبینن کە لە یەکێك لەبوارەکانیدا هاوشێوەی ئەو شەپۆلانەیە.

منیش وای دەبینم کە ماددەو دەروون دوو ڕووی یەك حەقیقەتن ئەویش (کارەبایە).

لەم سەدەیەشدا گیروگرفتی گەورەمان ئەوەیە بزانین کارەبا چییە؟ لەچارەڕەشیمان ئێمە بەنەناسراوێك نەناسراوێکی دی پێناسەدەکەین.

لەڕاستیدا کارەبا سەرسوڕهێنەرترین سەرسوڕهێنەرەکانە لەوانەشە زاناکان پاش زەمەنێکی دی بتوانن سەرجەم هێماکانی کارەباو گەردوون شیبکەنەوە.

دەڵێن لەگەردووندا سێ سەد بلیۆن پەیژەی شەپۆلە کارەباییەکان هەیە. ئێمە ناتوانین جەخت لەسەر ڕاستی ئەو ژمارەیە بکەینەوە، یاخود بڕوا بە وردەکاریەکانی بکەین.

بەڵام دەتوانین وێنەیەك لەو شەپۆلە کارەباییانەی نێو گەردوون وەربگرین. ئەگەر گەڕاینەوە سەدەی نۆزدەهەم دەبینین زاناکان تەنها حەوت پەیژەی شەپۆلە کارەباییەکانیان دەناسی، ئەویش (شەپۆلی

ڕەنگـەکان) بـوو.. هـەتا ئـەو حـەوت ڕەنگـەش لەناوەڕاسـتی سـەدەی بیستەمدا گەیشتە سروشتی شەپۆلە ڕووناکیەکان..

ئەو کاتەی (ماکسویل) تیۆریە ناسراوەکەی سەبارەت بە سروشتی ڕەنگە کارەباییەکان ڕاگەیاند.

لەوکاتـەوە، واتـە لەسـەردەمی (ماکسـویل)ەوە لێکۆڵـەرەوەکان چەندین شەپۆلی نوێی یەك لەدوای یەکی کارەباییان دۆزیوەتەوە.. (هرتز) لەساڵی ١٨٨٣ دا شـەپۆلە بێتەلـەکانی دۆزییـەوە... (ڕۆنتنجـن) لەسـاڵی ١٨٩٥دا تیشکە وێنەگرەکان.. ساڵی ١٨٩٠ مەدام کوری رادیۆی داهێنا کەسێ جـۆر لـە تیشـکەکان پـەخش دەکـات، پاشـان (ملیکـان) شـەپۆلە گەردوونیەکانی دۆزییەوە. لەوانەیە زاناکـان بـەردەوام بن لـە دۆزینـەوەی بەردەوامی شەپۆلە نوێیەکان.

زاناکانی ئەمڕۆ لەو باوەڕەدان ئەم بۆشاییەی ئێمەی تێیدا دەژین لێوانلێوە لەو شەپۆلە نەبینراوانەی لە ژمارە نایەن و بەردەوام و لەهەموو چرکەیەکدا بەر جەستەمان دەکەون، بێئەوەی هەستی پێبکەین، یاخود کاریگەرێتی بزانین لەسەر ڕێڕەوە دەروونی و ژیاریەکانمان.

کەواتە زاناکانی سەدەی نۆزدە لەوپـەڕی لـەخۆبایی بوونـدا بـوون کاتێك تەنها دەرکەوتەکانی ماددەو جوڵەیان دەناسی و هەموو ئەو نهێنییە شاراوانەی شەپۆلە گەورەکانیان درك پێنەدەکرد کە سەرتاسەری بۆشایی گەردوونیان پڕکردووە.

ئەوان لەو سەدەیەدا لەو باوەڕەدا بوون کە ماددە بناغەی گەردوونە، شەپۆلەکانیش لە ڕوانینی ئەوانەوە تەنها پانتاییەکی سادەو ساکارن و هیچ گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە... بەڵام لـەڕۆژگاری ئـەمڕۆماندا کارەکـە

سەرەوخوار هەڵگەڕاوەتەوە، بەشێوەیەك شەپۆلەكان بونەتە پێكهاتەی گەردوونو ماددەش بریتیە لە پانتاییەك، یاخود وەهمێك...كەواتە باوەڕ هێنان تەنها بە هەستەوەرەكانی مرۆڤ كەمتر بۆتەوە، چونكە تەنها حەوت پەیژەی لە شەپۆلەكان ناساندووەو ئەوانی دییان نەبینیووە كە ژمارەیان دەگاتە سەدان بلیۆن.. كاتێك ماكسویل شەپۆلە تیشكیەكانی دۆزییەوە، زاناكان سەریان سوڕماو پرسیان: چۆن دەتوانن ڕێڕەوی ئەو شەپۆلە تیشكیانە لە بۆشایی نێوان ئەستێرەكاندا شیبكەنەوە.. سەرسوڕمانەكەیان روەو گریمانێكی وەهمی پەلكێشی كردنو ناویان لێنا (ئەسیر)و بۆشایی گەردونیان لێپڕكرد... لەو (ئەسیرە) وەهمیەشدا چەندین سیفەتی دژینەیان كۆكردەوە بۆ ئەوەی ڕێڕەوی تیشكەكان شیبكەنەوە لە دوورییە زۆرەكاندا بەبێ ئەوەی شتێك لە وزەكەی لەدەست بدات.

دەیانگوت لەهەموو غازێكی ناسراو نەرمترە و لەئاسنیش ڕەقتر. ئەوەندە نەرمە ناتوانێت ڕێگە لە تێپەڕبوونی هەموو ئەو شتانە بگرێت كە بەناویدا گوزەر دەكەن. بۆشاییەكانی نێوان ئەستێرەكان لەلایەكو گەریلەكانی مادده لەلایەكی ترەوە پڕ دەكاتەوە.

لەدواییدا (ئەنشتاین) هاتو گریمانی (ئەسیر)ی لە بنەماكەیەوە هەڵتەكاند.. ئەنشتاین دەڵێت: ئێمە پێویستیمان بەگریمانی بیرۆكەی (ئەسیر) نییە بۆ ئەوەی لەبۆشاییدا ڕێڕەوی شەپۆلە تیشكیەكانو ئەوانی دی بناسین. بۆشایی لەتێگەی ئەنشتاینەوە خاوەنی بوونو سیفەتێكی تایبەت بەخۆیەتی.. ئەو بۆشاییە یاخود گەردوونەی دەكەوێتە نێوان ئەستێرەكانەوە ناوی لێنانرێت بۆشایی، بەڵكو بوونێكی حەقیقیەو خاوەنی خودی خۆیەتیو چوار دووربەندی هەیە: (درێژی، پانی،

بەرزی، زەمان) ئەنشتاین بە (زەمکان) ناوی دەبات، یاخود پێکگەیشتنی (زەمان و مەکان).

عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت ئەو تیورییە تێبگات، چونکە (زەمان و مەکان) جیادەکاتەوە، هەریەکەشیان بە بوونێکی خودی سەربەخۆ لەقەڵەم دەدات. بەڵام ئەنشتاین لەوباوەڕەدابوو کە بناغەی ماددەی گەردوون (زەمکانە)، زەمکانیش جیاناکرێتەوە لە (مەکان). بە یەکگرتنیشیان بونێکی پێکهاتوو لەچوار دووربەندی پێکدەهێنن.

ئەنشتاین بەپشت بەستن بەو تیوریە توانیویەتی سروشتی شەپۆلەکان شیبکاتەوە. لێرەدا دەتوانین شەپۆلە کارەباییەکان بچوێنین بەو شەپۆلانەی کە لەسەر ڕوی ئاودا ڕوو دەدەن لەگەڵ جیاوازیەکی کەم، ئەویش جیاوازی نێوان سروشتی سەر ڕووی ئاوو سروشتی (زەمکان). ئەو شەپۆلانەی لەسەر ڕوی ئاودا ڕوودەدەن لەرادەی دوو دوربەندیدایە (درێژیو پانی). لەوکاتەدا "پێچاوپێچ" ڕووەو دوربەندی سێیەم دەبێت بەواتا ڕێڕەوی (بەرزی).

بەڵام شەپۆلە کارەباییەکان لە (مەکان)ێکدا ڕوو دەدەن کە خاوەنی سێ دووربەندیە (درێژی و پانی و بەرزی) پێچاوپێچەکەش ڕوەو دوربەندی چوارەمە، بەواتایەکی دی رووەو (زەمان)ە.

بەهەرحاڵ ئێمە ناتوانین گریمانی بوونی جیاوازیەکی زۆر بکەین لەنێوان بۆشاییەکو یەکێکی دیدا.. ئەو کاتە تێپەڕی کە ئێمە وابزانین (بۆشایی) یەك شتەو لەهەموو شوێنێکدا وەکو یەك وایە.

ئێمە کاتێك دەڕوانینە روکاری دەریا لەو ریزە زۆرەی شەپۆلەکان و زۆری جۆرەکانی سەرمان سوڕدەمێنێ، روکاری ئاوەکەش چرکەیك ئارام نابێت، چونکە شەپۆلەکان زۆردەبن و دەچنە سەریەك و بەریەك دەکەون.

بۆشایی گەردوونیش هەروەکو روکاری ئاو وایە، ئەگەر ئێمە خاوەنی هەستەوەری دی بوینایەو سەرجەم شەپۆلە گەردوونییەکانی هەست پێبکردبایە، هەروەکو چاو شەپۆلە تیشکیەکان دەبینێت، ئەو کاتە لەدەریادا ئەو شەپۆلانەمان دەبینی کە خاوەنی چەندین بلیۆن ڕەنگ و وێنەی جیاوازو جۆراوجۆرن.

ئەگەر باس لەو تیوریەش بکەین کە دەڵێت: هێزە دەرونیەکان چەندین شەپۆلی جۆرە جیاوازەکان دەردەپەڕێنن. دەتوانین بلێین ئەو گەردوونەی چواردەوری داوین پڕیەتی لەو لاربونەوەو پێچاوپێچی‌یەی کە کاردەکاتە سەر مرۆڤ و شتەکان کە زانستی ئەمڕۆش بەشێوەیەکی تەواو نەیناسیوە.

ئێمە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا چاودێری هەموو شتێکی نوێ دەکەین کە زانست لەدواڕۆژدا پەردە لەڕووی هەڵدەداتەوە. ئەوانیش روکارەکانی دیکەی سروشتی شەپۆلە ماددی و دەرونیەکانن. لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان لێکۆڵینەوە نوێیەکان کلیلی نهێنی هێزە دەرونیەکانمان بداتە دەست، هەروەکو کلیلی وزەی ئەتۆمی داینە دەست.

هەروەکو گوتمان ئێمە لەمێژووی بیری مرۆڤدا دوو کودەتا دەبینین یەکەمیان دۆزینەوەی هێزە ناوکیەکان و دووەمیشیان دۆزینەوەی هێزە دەروونییەکانە. لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان لێکۆڵیارەکان پەردە لەسەر ڕوی ئەو گریمانە هەڵدەنەوە کە سەرچاوەی ئەو دوو هێزە شەپۆلە

کارەباییەکانن ... هەرچۆنێك بێت بابەتی هێزە دەروونیەکان لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا جێگەی گرنگیپێدانێکی لەڕادەبەدەری لێکۆڵیارەکانە لەسەرجەم دەوڵەتانی دونیادا. چونکە ئێستا گەشەکردنەکەی ڕووەو گەشبینییەکی زۆر هەنگاو دەنێت.. یەکێك لە لێکۆڵیارە بەناوبانگەکان تێبینی ئەوە دەکات کە ئەم سەدەیە (سەدەی بیست و یەك) دەبێتە سەدەی بەکارهێنانی هێزە دەروونیەکان.

لەم ساڵانەی دواییدا چەندین کتێب سەبارەت بابەتی هێزە دەروونیەکان کەوتە بازاڕەوە، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەیان باوەڕیان بە کارە غەیبییەکان هەیە کەئەو هێزە دەروونیانە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی بوونی جیهانی ڕوح یاخود ئەودیوی سروشت لەقەڵەم دەدرێن. من دەمەوێت سەرنجی خوێنەر بەلای ئەو ڕاستییەدا ڕابکێشم کە نکوڵی لەروح ناکەم، لە هەمانکاتدا نامەوێت باوەڕیشی پێبکەم.. باشترین شت لەو بارەیەوە کە دەتوانم بیڵێم دووبارە کردنەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزەیە ((يسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربي وما أوتيتم من العلم إلا قليلا)).

زانستی سەردەم هیچ شتێك سەبارەت بە رۆح ناڵێت، لەوەش دەچێت تاماوەیەکی دورتر نەتوانرێت لەو بارەیەوە هیچ شتێك بگوترێت... لەوانەیە ئێمە بڵێین : نکوڵیکردنی روح هەروەکو ئیمانداری وایە، هەردوکیان لە تێڕوانینی زانستەوە دەکەونە چوارچێوەی توندڕەوییەوە. هەندێ کەس نکوڵی لەروح دەکەن هەروەکو ئەوەی ئەو نکوڵیکردنە ئازادی بیر بگەیەنێت. هەردوکیان شتێك دەڵێن و شتێکی دی لەیاد دەکەن. لێکۆڵیاری ڕاستەقینەو چاکیش پێویستە بڵێت: نازانم!!

دەگێڕنەوە: لەسەرە مەرگدا لە فەیلەسوفێکیان پرسی: چی فێربوویت؟ ئەویش گوتی: باشترین شت لەژیانمدا فێری بووم ئەوەیە کە لەهیچ شتێك نازانم و لەهیچیش تێنەگەیشتم.

لێکۆڵەر چەندێك لەزانستەکەیدا قوڵبێتەوەو بچێتە ناخی نهێنییەکانی گەردوونەوە کۆمەڵێکی زۆرتر گیروگرفت و نهێنی رووبەڕوی دەبێتەوە.. لەخۆبایی بوو لەزانستدا وەکو ئەو کەسەیە سەرکردایەتی گەڕەك یاخود گوندێکی گرتۆتە ئەستۆ، خۆی وادەزانێت سەرۆکێکی زۆر گەورەیە.. لەکاتێکدا سەرکردە بەتواناکان ئەوانەی سەرکردایەتی نیوەی جیهان دەکەن دوچاری رارایی‌و نیگەرانی بوون.

ئێمە ناتوانین بەرامبەر هەچ بیرو بۆچونێك یاخود بڕواو عەقیدەیەك توند ڕەوبین، هەرچەندە پشت ئەستوری بەڵگەو سەلماندنە زانستیەکانیش بین. چونکە سەلماندنەکانیش مەزەندەکارین و بەگوێرەی (کات)ەکان گۆڕانکاریان بەسەردا دێت.. ئەو بەڵگەو سەلماندنەی ئەمڕۆ وەری دەگرین ، لەوانەیە سبەینێ ببێتە شتێکی بێ‌واتای هیچ‌و پووچ.. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە ئێمە لە هێزە دەرونیەکان بەو شێوەیەی لەواقیعدا هەیە دەکۆڵینەوە. لەخوێندنەوەی ئەم کتێبەدا خوێنەر هەست بە دوو جیاوازی دەکات:

**یەکەم:** من هەوڵمداوە لێکۆڵینەوەکەم لەدوورو نزیکەوە پەیوەندی بە ڕێڕەوە ئاینی‌و روحیەکانەوە نەبێت. ویستومە پشت بە نوێترین گۆڕانکاریەکانی فەلسەفەو لێکۆڵینەوە دەروونی‌و زانستەکانی فیزیا ببەستم... بۆیە خوێنەر لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکاندا هەندێك ئاسانکاری دەبینێت بۆ (بلانك)و (ئەنشتاین)و ئەوانی دی. هەروەها

لەخستنەڕووی هەندێك چەمکی بناغەیی لەلێکدانەوەی گەردیلەو ئەو پێکهاتەی ماددەی لەسەر دروست بووە.

کە ئەوەش دەڵێم مەبەستم ئەوەنییە مافی تەواوم داوە بەلێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانە چونکە من لە (بلانك و ئەنشتاین) ناگەم لەواقیعی بیرکاری خۆیاندا، بەڵکو پشتم بە لێکۆڵینەوەی هەندێك لەوانە بەستووە کە ئاسانکاریو کورتکردنەوەی ئەنجامە فەلسەفیەکانیان کردووە. وەکو (رسل، جود، جێنیز، ئەدنکتن، بورن و راینباخ).

<u>دووەم:</u> من وەکو لێکۆڵیارانی دی نەمویستووە بابەتی هێزە دەروونیەکان بوروژێنمو لەنیوەدا وازی لێبێنم، بەڵکو هەوڵمداوە ئامانجی ئەو بابەتە لەگەڵ واقیعی ژیانی ڕۆژانەدا بگونجێنم، هەروەها ئەو ڕێگەیە ڕووناك بکەمەوە کە پەیوەندی بەتاکەکانەوە هەیە لەلایەنی بیرکردنەوەو کردەوەکانیدا کە چارەنووسی دیاری دەکەن رووەو سەرکەوتن یاخود سەرنەکەوتنی..

بەهەرحاڵ ئەم ڕێگەیە پڕیەتی لە بەربەستو هەڵەکردنیش کارێکی ئاساییە، ئەوەشی زۆر هیوای دەکەم سەرنج ڕاکێشانی خوێنەری بەڕێزە بۆ ئەوەی گرنگییەك بەم بابەتە نوێیە بدات، چونکە دڵنیام هێزە دەروونیو ناهەستیو نائاساییەکانی مرۆڤ لەدواڕۆژی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا ڕۆڵێکی گرنگو کاریگەرو ترسناك دەگێڕێن.

لەوانەیە هەڵە نەبم گەر بڵێم هەریەکێك لەئێمە لە ژیانیدا هەست بە کاریگەرێتی هێزە دەروونیەکانی دەکات. و لەو باوەڕەشدام لێکۆڵینەوەی هێزە دەروونیەکان سودێکی زۆر بەئێمە دەگەیەنێت، چونکە پەردە لەڕووی ئەو ڕاستیە هەڵدەداتەوە کە لە قولایی دەروونماندا چەندین

گەنجینەی شاراوە هەیە.. هەرچەندێکیش پشتگوێیان بخەین ئەوەندە دوچاری زیان و هەرەس و نوشوستی دەبینەوە کە ئاگامان لە رودانیان نییە.

ئەو هێزە دەرونیە نائاساییانە لە هەموو کەسێکدا هەیە، بەلاّم بەیەك پلە دەرناکەوێت... زۆربەی خەڵکی بەشێکی کەمی تێدایە کە لەوانەیە هەست بە بوونی نەکەن...

ئەو هێزانە هەندێك جار بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەین سوودمان پێدەگەیەنێت (هەروەکو لەمەودوا لێی دەدوێین). لەهەندێك کەسی دەگمەنیشدا زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت ئەو دەگمەنانەش زۆر بەکەمی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بینراون.

لە هەرچ نەوەیەکدا لەوانەیە لە پەنجەکانی دەست تێنەپەڕن ئەو کەسانەش ئەوانەن کە بەسەر ئاگردا دەڕۆن و خۆیان دەدەنە بەر دەستڕێژی گوللەو بە ئاسماندا دەفڕن...

ئەوانەش بەبێ‌ئەوەی لەشتێك نزیك ببنەوە لەدوورەوە دەیجوڵێنن، هەروەها ئەوانەش بۆچوون و عەقڵی بەرامبەرەکەیان دەخوێننەوەو پێشبینی هەندێك روداو دەکەن لە داهاتوودا.

لەلای هیچ کەسێکیش شاراوە نییە ئەو کەسانە چ ڕۆڵێکیان هەبووە لە مێژوودا ... کۆمەڵێکی زۆریان بوون بە پێغەمبەر و قەدیس و سۆفی و قەشەو ساحیرو عەبقەری و ... هتد.

(برجسون) و (توینبی) دەڵێن: شارستانیەت لەلایەن ئەو کەسە دەگمەنانەوە دروست کراوە...

کەواتە ئەو هێزانە وەکو سەرجەم تواناکانی مرۆڤ دەتوانرێت لەرێگەی خێرو شەڕدا بەکاربهێنرێت.. هەروەکو ئەو چەکە وایە کە دەتوانرێت بۆ چەوساندنەوەو ڕزگاریش بەکاربهێنرێت، هەروەکو گوتمان هێزە دەروونیەکان لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە. بەڵام ئەو جیاوازیە چییە لەنێوان هەندێك مرۆڤ و ئەوانی تردا دەبینرێت؟. هیچ جیاوازیەك لە (جۆر - پلە) دا نییە، یاخود بەواتایەکی دی هەریەکە لەئێمە تاڕادەیەك پێغەمبەر، یان ساحیرێکە بۆ خۆی ... پێغەمبەرایەتی یاخود سیحر لە قوڵایی دەروونی هەموو کەسێکدا هەیە، بەپلەیەکی کەم یا زۆر، زۆر جاریش بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەین لەژیانی ڕۆژانەماندا سوودی لێوەردەگرین.

ئەو تاقیکردنەوانەی (راین)و کەسانی دی لەتاقیگەکاندا بەسەر هەزاران کەسدا ئەنجامیاندا سەلماندی کە هەموو کەسێك لەقوڵایی دەروونیدا هێزێکی داهێنەرانەی هەیە. بۆ نموونە: ئەگەر یەکێك لەئێمە پارچەیەك پارەی ئاسن سەد جار هەڵبدات رووەو ئاسمان و هەموو جارێك پێشبینی شێر یان خەتەکە بکات. ئەگەر ئەو پێشبینینانە لە پەنجا تێپەڕی، بەڵگەی ئەوەیە خاوەنی هێزێکی دەروونی دۆزەرەوەیەو دەتوانێت بەسەرکەوتویی هەندێك لە روداوەکانی دواڕۆژ ببینێ..

گەورەترین گیروگرفت لەو لایەنەدا ڕوبەڕومان دەبێتەوە. خوێندەوارەکانمان لەسەر بنەمای لۆژیکی کۆن راهاتوون و هەر لەوێشەوە دەڕواننە بابەتەکان. ئەو لۆژیکەی پێی دەڵێن ((لۆژیکی دووسەرە)).

هەموو شتێك بەلای ئەوانەوە یان دەبێت (حەق)ی تەواو بێت، یاخود (ناحەق)ی تەواو، هەرچ شتێك بکەوێتە ئەو نێوەندەوە ئەوان

باوەڕی پێناکەن.. ئەوان دەیانەوێت هێزە دەروونیەکانیان هەموو کات ڕاستی بپێکێت ئەوجا باوەڕی پێدەکەن. ئەگەر چەندین جار ڕاستیی پێکاو جارێك هەڵەی کرد رووی خۆیانی لێوەردەگێڕن و دەیبەنەوە سەر فڕوفێڵ و هەڵخەڵەتاندن.. لەڕاستیشدا هێزە دەروونیە نائاساییەکان بەردەوام ڕاستی ناپێکن هەروەکو تێکڕای (بەهرە)کانی مرۆڤ شتێکی ڕەها نییەو شایەنی هەڵەکردن و کەموکورتیە. ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لێکۆڵەرەکان ئەنجامی دەدەن ئەوە ناخوازێت هەمیشە ڕاستی بپێکن، بەڵکو ئەوەندە بەسە لە سەرووی ڕێکەوتەوەبن. بۆ نموونە ئەگەر ڕێژەی پێکانی ڕاستی ی ڕێککەوت 50٪ بێت و هەستەکانی مرۆڤیش توانیان 60٪ ڕاستیەکان بپێکن، ئەوکاتە بێگومان تۆ خاوەنی هێزێکی دەرونیت. (ڕاین) باس لە کیژۆڵەیەك دەکات کە تەمەنی نۆزدە ساڵانەو ناوی (لیلیان)ە. دەڵێت ئەو کیژۆڵەیە هاتە تاقیگەی هێزە دەرونیەکان لەزانکۆی (دیوك) بە مەبەستی پشکنینی هێزە دەروونیەکانی. ئەو کچە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەستەکانی ڕاستی دەپێکا، هەموو جارێك کە دەمانخستە ژێر تاقیکردنەوەوە پشتی دەکردە ئەو مێزەی بۆ تاقیکردنەوە تەرخانکرابوو، چرکەیەك ڕادەوەستاو چاوی دەنوقاندو پاشان روی لەمێزەکە دەکردەوە، بەشێوەیەك لێوی دەجوڵاند کەشتێك بڵێت، لەدواجاریشدا یەك لەدوای یەك و بەبێ ئەوەی هەڵەبکات شتەکانی دەگوت.

ئەو حاڵەتەی لیلیان زۆر دەگمەنەو لەهەموو کەسێکدا نییە، لەوانەیە خودی لیلیانیش لە پێکانی ڕاستیدا بەردەوام نەبێت...

هێزە دەروونیەکان بەگوێرەی ئیرادەکانی تاك نایەنەدی، هەر کاتێك بیەوێت بەهێزی بکات ئەو لاواز دەبێت، یاخود نامێنێت، ئەو هێزە لەقولایی عەقلی ناوەوەی مرۆڤدا هەلدەقولێت، بۆیە خۆڕاهێنان و بیرکردنەوەی زۆر بەربەست دروست دەکات لە هاتنە دەرەوەیدا.

چەندین چیرۆکی ئەوتۆمان بیستووە کە هەندێك کەس لەسەرەتای ژیانیانەوە خاوەنی هێزێکی دەروونی زۆر بوون، بەلام پاش ئەوەی چوونە قوتابخانەو دەستیانکردوە بە خۆڕاهێنان و بوون بەخاوەنی پلەو پایە لەکارە عەقلیەکانیاندا، ئەو پەرییە (هێزە دەروونیەکان) بەجێ ی هێشتوون و مالئاوایی لێکردوون...

هەروەکو ئەوکەسەی لە ڕەوانبێژیدا دەستێکی بالای هەبێت بەلام پاش ئەوەی فێری ڕێزمان و بنەماکانی بوو. زمانە پاراوو شیرین و ڕەوانبێژیەکەیان شێواو، هەروەکو ئەو شتەی لە قولایی عەقلی ناوەوەیاندا هەلدەقولا لاواز بوبێت. ئەو کاتە بنەمای بیرکردنەوەکانیشی دەبنە بەربەستێك بۆی.

ئەم کتێبەم ناوناوە (ئەودیوی هۆش) یاخود (نهێنەکانی کەسیەتی سەرکەوتوو)، چونکە ویستوومە سەرنجی خوێنەر بەلای لایەنێکی کەسیەتیەکەیدا ڕابکێشم کە لەوانەیە ئاگای لێ نەبوبێت. ئەویش لایەنە ناهەستیەکانێتی، یاخود هەندێك جار پێ ی دەلێن "عەقلی ناوەوە" .

دەتوانین عەقلی مرۆڤ بەو چیا سەهۆلبەندانەی نێو دەریاکان بچوێنین، کە بەشێکی کەمی لەسەر ڕوکاری ئاوەکەوە دیارەو بەشە گەورەکەشی لەقولایی دەریادایە. زۆربەی جموجوڵ و هەلسوکەوتەکانی مرۆڤیش ئەوبەشە شاراوەیە کە عەقلی ناوەوە دەیجولێنێ، نەك عەقلی

دەرەوە کە تەنها لایەنێکی هەڵخەڵەتێنەرە بۆ عەقڵی مرۆڤ، تەنها کاری شێواندنو دانانی ڕوکەشێکی نەخشەڕێژی بۆیەکراوە سەبارەت بە حەقیقەتی شتەکان.

من دەمەوێت ئەم کتێبە پێشکەش بەو لاوە خوێندەوارانە بکەم کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەنها باوەڕیان بە عەقڵ هەیەو کردویانەتە خواوەندێكو دەیپەرستن.

دەگێڕنەوە (ڕۆبسبیر)ی پاڵەوانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا لەسەردەمی ئیرهابدا کچە سەماکەرێکی هێناو فەرمانی بەخەڵکی پاریس کرد بیپەرستن، بەو پێودانگەی هێمای عەقڵی مرۆڤە... ڕوبسبیر بەو کارەی ویستی خودا لە عەرشەکەی دوربخاتەوەو عەقڵ بخاتە شوێنی. لەمەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئەو مۆدە فیکریەی روحی شۆڕشی فەرەنسی گرتبوەوە. هەر ئەو مۆدەیەش بوو لەگەڵ سوپاکانی ناپلیۆندا گەیشتە میسرو لەوێشەوە بەجیهانی عەرەبدا بڵاوبوەوە.

کاتێك دەتەوێت لەگەڵ ئەو لاوانەدا سەبارەت بە کەسیەتی مرۆڤو هۆکارە کاریگەرەکانی بدوێیت لە پێکهاتەکەیدا. دەبینی بەشێوەیەکی شێلگیرانە بەرزیو نەمری عەقڵت بۆ باس دەکەن، دەڵێن عەقڵ ئەو بناغەیەیە کەسیەتی مرۆڤ بەهەموو لایەنەکانیەوە دروست دەکات. ئەوان لەو باوەڕەدان ئەگەر مرۆڤ بەشێوەیەکی تەواو عەقڵی بەکارهێنا حەتمەن دەگاتە کەسیەتیەکی باڵاو دەسەڵاتێکی گەورە.

مرۆڤ لەسەرەتادا بەسروشتی عەقڵی ناوەوە دەجوڵێو پاشان عەقڵی دەرەوە دێو بیانوو بۆ ئەوشتە دێنێتەوە کە ئەنجامی داوە،

دەینەخشێنێ و لەبەرچاوی کۆمەڵانی خەڵك دیمەنێکی پەسەندکراوی پێدەبەخشێت.

بۆیە دەتوانین بڵێین: مرۆڤ کارێك دەکات و پاشان بیری لێدەکاتەوە، ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونی پێشینەکانی مێژوون... لەکۆندا دەیانگوت مرۆڤ حەیوانێکی عاقڵە. لەڕاستیشدا وانییە، مرۆڤ پڕاوپڕی تێگەیشتنەکانمان نییە، عاقڵێکی پەیتا پەیتا دروستبووە نەك عاقڵێکی خۆڕسکی پڕاوپڕ. هەرچەندە مرۆڤ لەڕووکەشدا خۆی بەعاقڵ دەزانێت بەڵام ئەو هەمیشە بوونێکی شێتە.

ڕەنگە یەکێك بپرسێت: ئەدی ئەو عەقڵەی ناوەوەی مرۆڤ چییە کەلە زۆربەی کارەکانیدا ڕێنمایی دەکات و دەیجوڵێنێت؟ وەڵامی ئەو پرسیارەش زۆر گرانە... بۆ لێکدانەوەی عەقڵی ناوەوە لێکۆڵەرەکان بۆچوونێکی جیاوازەو زۆر جاریش دژەیەکیان هەیە.. بۆیە چەندین پێڕەویان پێکهێناوە. لەم دواییانەشدا کۆمەڵێك زانا بەتەواوی نکۆڵی لەبوونی عەقڵی ناوەوە دەکەن.... ئێمە نامانەوێت بکەوینە ئەو مشتومڕەوە، یاخود هەوڵبدەین حوکمی تێدا بکەین. ئەو شتەش مەبەستی ئێمەیە عەقڵی ناوەوەیە (نەست)، ئەو زاراوەیەی ئاماژە بەڕوداوێك دەکات لەناوەوەی دەروونداڕوودەدات. لەو ڕێڕەوانەدا کەبیری مرۆڤ هەستی پێناکات و ناکەوێتە چوارچێوەی بواری هەست و ڕامانەوە.

دەتوانین بڵێین: تیوری عەقڵی ناوەوە سەرەڕای لاوازییەکانی کودەتایەکی گەورەی لەمێژووی بیری مرۆڤدا بەرپاکرد.. فرۆیدیش بەداهێنانی (تیوری ناهەستی) خزمەتێکی گەورەی بە مرۆڤایەتی کرد. ئەگەر ئەمڕۆ لێکۆڵەرەکان باوەڕ بە فرۆیدو تیوریەکەی عەقڵی ناوەوەی

نەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەگرنگی و کاریگەریەکەی دەکەن کە ئەو تیوریە لەسروشتی لێکۆڵینەوە دەروونیەکانی دوای خۆیدا بەجێ ی هێشت. بیریارەکانی بەر لە فرۆید لەژێر کاریگەرێتی فەلسەفەی کۆندا بوون کە باوەڕی تەواوی بەعەقڵی دەرەوە هەبوو. نەیاندەزانی لەقولایی دەرووندا ناوچەیەکی ناهەستی هەیەو هەمیشە لەکاردایەو کاریگەرێتیەکی لەڕادە بەدەریشی هەیە بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێبکات. لەو ڕوانگەیەشەوە بۆ هەموو جموجۆڵو هەڵسوکەوتێکی ئاکاریی مرۆڤ لێکدانەوەیەکی لۆژیکیان بۆ دەکرد، ئەویش بە پاڵپشتی هەستو بیرکردنەوە. بەلام ئەگەر یەکێکی نائاسایی سەرسوڕهێنەر ببینن هەوڵدەدەن بە بەڵگە لۆژیکیەکان قەناعەتی پێبکەن بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی عاقڵ... ئەگەر ئەو (شێتە) گوێ لە بەڵگەو سەلماندنەکانیان نەگرێت لێ ی تورە دەبن و دەکەونە تانەو تەشەر لێدانی و هەندێك جار ئازارو ئەشکەنجەدانی... لەو کاتەدا لەدوو لایەنەوە زوڵمی لێدەکەن:

<u>یەکەم:</u> سزای دەدەن لەوکارەیدا کە تاوانی تێدا نیەو دەسەلاتی بەسەردا ناشکێت.

<u>دووەم:</u> زیان بە نەخۆشیە دەروونیەکەی دەگەیەنن بەپێچەوانەی پێداویستی و داواکاری نەخۆشیەکەی چارەسەری دەکەن.

بۆیە تاوان بەسزایەکی توندوتیژ چارەسەر دەکەن، "بەلام هەموو مرۆڤێك ئەگەر لەحاڵەتێکی سروشتیدا بێت و بزانێت ئەوکارەی ئەو دەیکات سزایەکی توندو تیژی لەدواوەیە ئەنجامی نادات (و)".

ئەو ڕاستیەیان لەیاد کردووە مرۆڤ کاتێك تاوانێك دەکات لەژێر کاریگەرێتی هۆکارە ناهەستیەکاندایە، کە هیچ پەیوەندیەکی بە بەڵگەو سەلماندن یاخود لۆژیکەوە نییە.

لەکۆتاییدا فرۆید هاتو نارنجۆکێکی لەو نێوەندەدا تەقاندەوەو گوتی: (مرۆڤ خاوەنی دوو عەقڵە: " دەرەوە و ناوەوە" ئەو هۆکارو ڕوداوانەش لەعەقڵی ناوەوەدا ڕوو دەدەن مرۆڤ هەستی پێناکات.

دەکرێت تیوریەکەی فرۆید بەخاڵی وەرچەرخانی مێژووی لێکۆڵینەوە دەروونیەکان دابنرێت.. ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵەرەکانی ئەم سەردەمەش باوەڕیان بە تیوریەکەی فرۆید هەیە، سەرەڕای جیاوازیان لەگەڵ فرۆیدا سەبارەت لایەنەکانی پێکهاتەی ئەو (عەقڵە).. بەواتایەکی دی بیریارو زاناکانی ئەم سەردەمە لەگەڵ فرۆیدا کۆکن لەبوونی ئەو عەقڵەدا، بەڵام لەسروشتی ناوەوەی ئەو هەیکەلەو چۆنیەتی پێکهاتەکەیدا ناکۆکن.... ئەمڕۆ ڕەخنە لەفرۆید دەگیرێ، چونکە زیاد ڕەویەکی زۆری کردووە لەڕۆڵی کاریگەرێتی سێکس لە ژیانی مرۆڤدا.. بەگوێرەی بۆچونو ڕوانینی بیرمەندە هاوچەرخەکان عەقڵی ناوەوە تەنها گەنجینەیەك نییە بۆ ئارەزووەسەرکوتکراوە سێکسیەکان، بەڵکو سەرجەم ئارەزووە سەرکوتکراوەسێکسیو ناسێکسیەکانیش لەخۆ دەگرێت.. بۆ نموونە: ئەگەر یەکێك دەستدرێژی کردبیتە سەر، یاخود ئیهانەی کردبێ، تۆش بەهۆی هەندێك بارودۆخی تایبەتیەوە نەتتوانی دەستدرێژی بکەیتە سەرو ئیهانەی بکەیتەوە، ئەوکاتە ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەکەت دەگوێزرێتەوە بۆ عەقڵی ناوەوەت و تێیدا جێگیر دەبێت، لەوێدا خۆی حەشار دەداو هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە بەشێوازو

وێنە جۆراو جۆرەکان بێتە دەرێو جارجارە هەناسە بدات. کەواتە تۆ لەوکاتەدا بەبێ ئەوەی هەست بکەیت، ئارەزوویەکی شاراوەو مۆڵدراو لەقولایی دەروونتەوە دەتبزوێنێت. لەوانەیە تۆ پاش ماوەیەك ئەو دەستدرێژیو ئیهانەیەت لەیاد کردبێت بەتایبەتی ئەگەر لەتافی لاوێتیدا ڕوی دابێت، بەلام هەمیشەو بەردەوام تۆ بەشێوەیەکی ناهەستی لەژێر کاریگەرێتی ئەودای، هەر کە پیاوێکی لەو شێوەیەت بینی کە کاتی خۆی ئیهانەی کردووی هەست بەرقو کینەیەکی زۆر دەکەی بەرامبەری. خۆ ئەگەر پرسیاری ئەوەت لێبکەن بۆ رقت لەو پیاوەیە؟ دەڵێیت (هەر لەخۆمەوە رقم لێیەتی)[1] شایانی باسە ئەوانەی لەهێزە دەروونییەکان دەکۆڵنەوە بەسەر دوو کۆمەڵەدا دابەش دەبن: ئەوانەی باوەڕیان بەوە هەیە روحێك هەیەو ئەو هێزە دەروونیانە دەجوڵێنێ و نکوڵی لە عەقڵی ناوەوە دەکەن. کۆمەڵەی دوەمیان دەڵێن: ئەو هێزە لە تایبەتمەندیەکانی کەسیەتی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێت، بۆیە جەخت لەسەر بوونی عەقڵی ناوەوە دەکەنو سوورن لەسەر ئەوەی عەقڵی ناوەوە کانگای هەڵقوڵینی ئەو هێزانەیە.

کۆمەڵی یەکەم وای دادەنێن عەقڵی مرۆڤ ڕوەو سەرەوە هەنگاو دەنێت، بەواتایەکی دی رووەو مەلەکوتی خودا، یان روح....

بەلام کۆمەڵی دووەم تەواو پێچەوانەی ئەو بۆچوونەن و لەو باوەڕەدان کە عەقڵ روەو خوارەوە دەڕوات و چینە شاراوەکانیشی لە قولایی دەروونەوە هەڵدەقوڵێن.

---

[1] عەرەب دەڵێ (هەر بۆ خوا رقم لێیەتی). (و).

ئەوانــەی یەکــەم باوەڕیــان بــە خــودا هەیــەو لایــەنی دووەمیــش بەمرۆڤ... ئێمە چ شتێك دەزانین كێ دەڵێ خوداو مرۆڤیش یەك شت نین؟ یەکێك لە حەکیمەکانی سەدە کۆنەکان دەڵێت: "کێ خۆی بناسێت، خودای ناسیووە".

بەهــەرحاڵ زۆربــەی لێکۆڵــەرەکان لــەم بابەتــەدا باوەڕیــان بــەبوونی عــەقڵی نــاوەوە هەیــە، هەرئــەویش ســەرچاوەی هــێزە دەروونیەکانــە. بەوشێوەیە لەڕوانینی ئەوانەوە، عەقڵی ناوەوە بواری دوو هێزی شاراوە لــەخۆ دەگرێــت: لەلایەکــەوە گەنجینــەی ئــارەزووە ســەرکوتکراوو خامۆشکراوەکانەو لەلایەکی تریشــەوە ســەرچاوەی هــەڵقوڵینی هــێزە نــا ئاساییەکانە. کەواتە لەیەك کاتدا جێگەی خوداو شەیتانیشە... هەندێك جار پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ مرۆڤ ڕووەو خێرو چاکە خوازی و داهێنان. هــەندێك جــاری دیــش روەو رێگــەی شــەڕخوازیو دەســتدرێژی دەیبــات. (هــایدن) دەڵێــت: "عــەقڵی نــاوەوە لەیــەك کــاتدا جێگــەی گەنجینەیــەکی ئاڵتونو خەرمانێکی پیساییە".

لەوانەیــە یــەکێك بڵێت: ئەگــەر عــەقڵی نــاوەوە ســەرچاوەی دووجــۆر تایبەتمەندی بێت. یەکێك چاكو یەکێك خراپ، مرۆڤ چۆن دەتوانێت لەیــەکدی جیایــان بکاتــەوە، بــۆ ئــەوەی ڕێگــەی ســەرکەوتن لــەژیانیدا بدۆزێتــەوە؟؟ وەڵامــی ئــەو پرسیارانەش یەکێکــە لــە گیروگرفتــەکانی ئــەم لێکۆڵینەوەیە... ئەگەر ئێمە ئامۆژگاری یەکێك بکەین بەبێ جیاکردنەوەی هــێزە ناهەســتیەکانی گوێڕایــەڵیان بێــتو بــەردەوام لــەژیانیدا پشــتیان پێبەستێت. لەوانەیە دوچاری هەڵەی بکــەینو زیــانی پێبگەیــەنین، بەو گوتەیــەی ئێمــە ڕووەو تــێرکردنی ئــارەزووە ســەرکوتکەرەکانو گــرێ

کپکراوەکانی هەنگاو هەڵێنێت بەبێ گوێدانە هیچ شتێك.. ئەو کاتە هێرش دەکاتە سەر ئازادیەکانی خەڵکانی دیو پێشێلیان دەکات.

پێویستە مرۆڤ زۆر بەوریاییەوە مامەڵە لەگەڵ هێزە شاراوەکانیدا بکات کە لە عەقڵی ناوەوەیدا هەڵدەقوڵێن، و بەتەواوی خۆی نەداتە دەست پەلکێشیەکانی.

زۆر جار مرۆڤ شتێك بەخەیاڵیدا دێت، یاخود لەزیهنیدا بیرۆکەیەك سەرهەڵدەدات، لەو نێوەندەدا تووشی ڕامان دەبێت، نازانێت لەهێزە دۆزەرەوەکانیەوە هەڵقوڵاوە یاخود لە ئارەزووە سەرکوتکراوەکانیەوە سەرچاوەی گرتووە. لەوکاتەدا پێویستی بە کلیلێك هەیە بۆ دۆزینەوەی ئەو نهێنییە.، بۆ ئەوەی چاکەو خراپە لەیەکدی جیابکاتەوە. نموونەکەی پێشوو دووبارە دەکەینەوە: تۆ بۆ یەکەمجار یەکێك دەبینی بەبێ‌سێو دوو رقت لێ دەبێتەوە.. لەوکاتەدا تۆ نازانی چ شتێك پاڵی پێوەناوی بۆ ئەو رقو کینەیەو دەکەویتە نێوان دوو لێکدانەوەوە: یان ئەو کەسە بێزراوە لەیەکێك دەچێت ڕۆژێك لەڕۆژان ئازاریداویو ئەو ئازارەش لە قولایی عەقڵی ناوەوەتدا کاریگەری بەجێ هێشتووە دژی هەر کەسێك لەو بچێت. یاخود تۆ لەو چرکەیەدا ڕقت لەو بۆتەوە، ئەویش بەهەمان شێوە ڕقی لەتۆ پەیدا کردووە. لەو نێوەندەشدا پێکدادانێکی ناهەستی ڕویداوە.. لەوانەیە ئەو دەستپێشخەری کردبێتو ئەو هەستەی لەڕێی شەپۆلە دەروونیەکانەوە بۆ تۆ گوازرابێتەوە، یاخود

گواستنەوەی ئەفکارەکان (بیرەکان)[1].

ئـــەوە گـــیروگرفتێکی گەورەیـــەو مـــن بانگەشـــەی ئەوەناکـــەم چارەسـەرێکی ڕاسـتەقینەی بـۆ بدۆزمـەوە.. هەرئـەوەندە دەتـوانم بڵێـم: مرۆڤ دەتوانێت پاش ڕاهێنانێکی زۆرو بەردەوام چارەسەرێکی تایبـەتی بۆ بدۆزێتەوە. مرۆڤی ڕوناکبیر تاڕادەیەك دەتوانێت پـەردە لـە رووی ئـەو شـتە هەڵداتـەوە کـە لەعـەقڵی نـاوەوەیدا هەیـە سـەبارەت بـە ئـارەزووە سەرکوتکراوەکانی... پاش ئەنجامدانی چـەندین تاقیکردنـەوەی جـۆراو جۆر دەتوانێت لەیەکدی جیایان بکاتەوە، لەنێوان ئەو شتەی زەرەرمەندی دەکات و ئەوەشی سوودی پێدەگەیەنێت.

لەوانەیە بتوانـین بڵێـین: هەرچـەندێك مـرۆڤ گـرێ دەروونیـەکانی کەمتر بێت، ئەوەندە دەتوانێت لەهێزە نائاساییەکانی سوود وەربگرێت. ئـەو کەسەشـی دەروونـی بەگرێو ئـارەزووە سـەرکوتکراوەکانی پـڕ بـوەو داپۆشـــراوە نـــاتوانێت لـــە هەڵســـوکەوتکردنی کەســـانی دیـــدا سـەرکەوتوبێت..چونکـە هـێزە نائاسـاییەکانی لەوکاتـەدا پـاك و بێگـەردو پـاراو نـین، لـەکارکردندا ئاوێتـەی ئـەو هـەموو گـرێو ئـارەزوو و سـۆزە سەرکوتکراوانەی بووە.. بۆیە ڕێگە لەخاوەنەکەی دەگرێت هەموو کارێکی داهێنەرانەی چاك بەرهەم بهێنێت.

---

[1] بیرمە ئەو پرسیارەم لە مامۆستایەکی ئاینی کرد: بۆچی جاری واهەیە هـەر لەخۆتـەوە ڕقـت لەیـەکێك دەبێتـەوە؟ .. فـەرمووی: (بەرلـەوەی خـودا مرۆڤـەکان دروسـت بکـات ڕۆحەکانی دروست کردووە، ئەو روحانەش ماوەیەکی زۆر لە (بـەرزەخ) دا ماونەتـەوە و یەکتریان ناسیوەو خۆشـی و ناخۆشـی لـەنێوانیاندا ڕویـداوە.. رەنگـە ئـەو کەسـەی تـۆ بـۆ یەکەمجارە ئەو دەبینی و ڕقت لـێی دەبێتەوە، لـەو کاتـەدا ناخۆشی و بەریـەك کـەوتنێك لەنێوان روحی تۆو ئەودا ڕویدابێت..).. بەهەرحاڵ کێ دەڵێ وانییە. (و).

دەڵێن محەمەدی پێغەمبەر (د.خ) لەهەڵبژاردنی هاوڕێکانیدا زۆر بەهێز بووە.. ئەو هەنگاوەش هۆکارێکی کاریگەر بووە بۆ سەرکەوتنە گەورەکانی لەژیانیدا.. هەروەکو زانراوە ئەو زاتە لەبەهێزترین دەروونە بێگەردو پاراو ئارامەکان بووە، بەهیچ شێوەیەك رق و کینەی بەرامبەر بەکەس هەڵنەگرتووە. هەر ئەو بێگەردی دەروونیەشی بووەتە هۆی چاکتر بەکارهێنانی هێزە نائاساییەکانی، ئەو هێزەش نهێنەکانی سروشتی مرۆڤی پێناساندووە.

ئەو کەسەی دەروونێکی ئاڵۆزی هەبێت، بەبێ بنەمایەکی ڕاست و دروست و لەخۆڕا خەڵکی خۆش دەوێت و رقی لەخەڵکیش دەبێتەوە.. ئەو بەدوی سۆزە سەرکوتکراوەکانی خۆیدا پەلکێش دەکرێت.. بۆیە ناتوانێت مرۆڤەکان بناسێت و بچێتە قوڵایی دەروونیانەوە.

# ﴿ کورتەی مەبەست ﴾

لەقوڵایی (نەست)ی مرۆڤدا هێزێکی داهێنەر هەیە، ئەگەر بەچاکی بەکارهێنرا مرۆڤ ڕووەو سەرکەوتن دەبات.. من لەوباوەڕەدام ئەو شتەی خەڵك بە (بەخت) ناوی دەبەن، ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو هێزە ناهەستیەیە.. زۆربەی زۆری کۆمەڵانی خەڵك بەبێ ئەوەی بزانن سەرچاوەکەی لەکوێوەیەو ماهیەتەکەی چیە لەژیانی ڕۆژانەیاندا سوود لەو هێزە وەردەگرن و هەر لەخۆوە دەیبەنەوە سەر بەخت، لەڕاستیشدا هیچ پەیوەندیەکی بە بەختەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵە هێزێکی ناهەستی نائاساییـن و لەقوڵایی دەروونـی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێن، مرۆڤیش وا دەزانێت لەدەرەوە بۆی دێت.

لێرەدا کۆتایی بەم پێشەکییە دوورو درێژە دەهێنین و داوای لێبوردن لە خوێنەران دەکەین.. من ویستومە بەم پێشەکییە دوورو درێژە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەیان بخەمە بەردەست.

داوا لەو کەسانەش دەکەم، ئەگەر ئەم پێشەکییە کاریگەرێتی لەسەر دروست نەکردوون بالەم ئاستەدا بوەستن و بەشەکانی تر نەخوێننەوە.. ئەو کەسانەش لەپێشەکیەکە ڕازین، بەشەکانی دیان دەخەمە پێش چاو.. بشمبوورن کە هەندێك جار دووبارە کردنەوەو دوفاقیزمی و سەفسەتەش دەبینین... چونکە من لە دەرکەی لێکۆڵینەوەیەکم داوە لەمەوبەر هیچ کەسێك بەم شێویە لیێ نەداوە.

* * * * *

# بەشی یەکەم
# چوارچێوە فیکریەکان

لەپێشەکیەکەدا گوتمان مرۆڤ لەڕوانگەی ئەو چوارچێوە فیکریەوە بواری ڕوانینەکانی دیاری دەکات و لەوێشەوە دەڕوانێتە گەردوون... هیچ کەسێکیش ناتوانێت نکوڵی لەبوونی چوارچێوە فیکریەکەی بکات.. هەمیشە مرۆڤ وەکو ئەسپی ژێر عارەبانە وایە بۆ ئەوەی تەنها بەردەمی خۆی ببینێت لەسەرووی هەردوو چاویەوە پارچەیەك قایشی بۆ دادەنێن... ئەوەشمان گوت لەو ڕووەوە هیچ جیاوازیەك نییە لەنێوان خوێندەوارو نەخوێندەواردا. خۆ ئەگەر جیاوازیەکیش هەست پێبکرێت لەپلەدایە نەك جۆر.

پرۆفیسۆر ولیم باریت دەڵێت: کاتێك ئەدیسۆن بۆ یەکەمجار (حیکایەتخوانی) داهێناو لەئەکادیمیای زانستی پاریسدا خرایە ڕوو، ئەو زانایانەی لەوێدا ئامادەبوون بەکارێکی مەحاڵیان دایە قەڵەم و دەیانگوت ناکرێت دەنگی مرۆڤ لەسەر کاسێتێکی کانزایی تۆمار بکرێت.. ئەدیسۆنیان بەوە تاوانبار کرد کە لەژێر مێزەکەدا پیاوێکی شاردۆتەوەو بەدەنگەکەی ئامادەبوان هەڵدەخەڵەتێنێت.

پرۆفیسۆر (تیت) لەزانکۆی (ئەدەنبەرە) کە بۆ یەکەمجار هەواڵی دروستکردنی تەلەفۆنی بیست، گوتی: دروستکردنی شتێکی لەوجۆرە کارێکی فیزیایی مەحاڵە.

دەگێڕنــەوە کــاتێك (ســەمەر) لەکۆتاییــەکانی ســەدەی هــەژدەدا، شـێوازە ناسـراوەکەی لەخـەواندنی موگناتیسـی دۆزییــەوەو بانگەشــەی ئــەوەی کــرد کــە گرنگییــەکی زۆری هەیــە لەچارەســەرکردنی هــەندێك نەخۆشیدا. زاناکان بەگاڵتە جاڕییەوە لێیان وەرگرت.

تەنانـەت یـەکێك لـە ڕۆژنامـە ئینگلیزیـەکان نوسیبووی: (ئیکسـیری موگناتیسـی: لـەرۆنی تـرس و تۆقاندن چـوار هۆقـەو لـەرۆحی وەهـم دوو ڕەتڵ تێکـەڵاو بکـەو بیانکـەرە شوشـەیەکی خەیاڵـەوەو چـەند ڕۆژێـك وازی لێبێنـەو پاشان هـەموو بەیانیـەك چـل تنۆکـی لـێ بخـۆرەوە. بـۆ هـەموو نەخۆشیەك چاکە).

دەتوانــین بڵێــین هــەموو شــتێکی نــوێ لەزانســتدا خوێنــدەوارو نـەخوێندەوار بـە گاڵتـە جاڕییــەوە وەری دەگــرن. مێــژووی مرۆڤایــەتی لێوانلێـوە لـە چـیرۆکی زانـاو لێکۆڵــەرو ... هتــد کــە لــەژێر زوڵــم و زۆرو چەوساندنەوەدا ناڵاندویانەو ڕووبەڕووی سوتاندن و گاڵتە پێکردن و رق و کینە بوونەتەوە لەئەنجامی ئەو شتە نوێیەی پێشکەش بە زانست و بواری کۆمەڵایەتیان کردووە.

لـێرەدا پێویسـتە خوێنـدەوارو ڕووناکبـیر لەیـەکدی جیابکەینـەوە: خوێندەوار تەنها ئەو شتانە فێر بووە کە لە چوارچێوە فیکریەکەی ناچێتە دەرەوەو لە منداڵییەوە لەسەری ڕاهاتووەو هیچ شتێکی نەخستۆتە سەر بوارە زانستیەکانی، جگە لە توندڕەوی و بەرتەسکی بواری ڕوانینەکانی . ئەو باوەڕی بــە یــەکێك لــە بۆچونــەکان یــاخود پێڕەوەکــان هێنــاوەو لــەو پێناوەشدا بەدوای ئەو زانیاریانـەدا گــەڕاوە کــە پاڵپشـتی ئــەو بۆچــوون یاخود پێڕەوەی دەکەن و شێلگیرانەش لەو پێناوەدا خەبات دەکات.

بەڵام ڕووناکبیر: بە نەرمو نیانی بۆچوونەکانی دەناسرێتەوە، هەروەها ئامادەباشی بۆ وەرگرتنی هەموو بیرێکی نوێو هەڵبژاردنی ڕاستییەکان لەو بیرە نوێیەدا.

ئەوەی جێگەی داخە ژمارەی ڕووناکبیرەکانمان زۆر کەمنو خوێندەوارەکانیشمان زۆرن.. لەوەش کارەسات تر خوێندەوارەکانمان توشی لەخۆبایی بوون هاتوون سەبارەت بەو زانیاریە کەمەی کەفێری بوون. هەر ئەوەش هۆکاری ڕەتکردنەوەو نکۆڵی لێکردنی هەموو ئەو دیدو بۆچوونو ڕوانینانەیە کەدژو پێچەوانەی زانیارییەکانی خۆیانە.

ڕێژەی ئەو ڕووناکبیریەی یەکێکی پێ دەپێوین، ڕادەی دان بەخۆدا گرتنێتی لەوەرگرتنی بۆچونو بیروڕای بەرامبەرەکەی. ئەگەر ئەو بۆچوونە پێچەوانە، یاخود جیاوازبێت لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆی.

ڕوناکبیری ڕاستەقینە هیچ کاتێك دڵنیانیە لە ڕاستگۆیی دیدو بۆچوونەکانی خۆی، چونکە ئەو پێوەرەی بۆچوونەکانی پێدەپێورێت جێگیرو چەسپاو نییەو لەتاکێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێت زۆرجار قەناعەتی بە بۆچونێکی دیاریکراو هەیە، بەڵام پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك قەناعەتی بەو بۆچوونەی خۆی لاواز دەبێتو لەوانەیە کودەتایەکیشی لەدژی ئەنجام بدات.

ئەگەر یەکێك بیەوێت ناوبەناو لە پێشکەوتنی دیدگای خوێندەوارەکانمان بکۆڵێتەوە، دوچاری سەرسوڕمان دەبێت.. دەبینی ئەمڕۆ گاڵتەی بە فیکرەیەك دێتو سبەینێش دەیپەرستێت. ئەگەر پرسیاری ئەو هەڵوێستەیان لێبکەی پێت دەڵێن: ((ئێمە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕاینو لەکۆتاییدا دۆزیمانەوە)). کێ دەڵێ پاش

ماوەیەکی دی ناچنە سەر فیکرەیەکی دیو ناپەرستن. لەهەموو قۆناغو گواستنەوەیەکیشدا باوەڕی تەواو و یەکلاکەرەوەیان بەوە هەیە کە ئەوان گەیشتوونەتە دوا حەقیقەتو لەمەودوا گۆڕانکاری تێدا ناکەن.

ئەو چوارچێوە فیکرییەی دەوری عەقڵی مرۆڤی داوە و لەوێشەوە دەڕوانێتە گەردوون، سەرجەم لایەن و پارچە وردو درشتی شورەکانی لەو زاراوەو گریمانانەوە دروست دەبن کە کۆمەڵگە بۆی دەگوێزێتەوەو لە قوڵایی عەقڵی ناوەوەیدا دەیچەسپێنێ.. کەواتە مرۆڤ بەبێ ئەوەی هەست بکات دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئەو زاراوەو گریمانانەوە.

مرۆڤ کاتێك دەڕوانێتە دەوروبەری خۆی هەست ناکات تێڕوانینەکانی سنووربەندو پێوەندبن، یەقینی وایە ئازادە لەبیرکردنەوەکانیدا... مەترسیەکەش لەوێوە دەست پێدەکات.. کە یەکێك دەبینێ پێچەوانەی دیدو بۆچوونەکانی خۆیەتی هەڵدەچێتو تورە دەبێو بەدوای تۆڵەسەندنەوەدا دەگەڕێت.. کاتێکیش دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەو کەسەی پێچەوانەی دیدو قەناعەتەکانێتی هەست ناکات کارێکی خراپی ئەنجامدابێت، ئەو لەو باوەڕەدایە لەپێناو ڕاستیدا تێکۆشاوەو دژی خراپەکاری خەبات دەکات.

زۆربەی ئەو شەڕو شۆڕو جەنگو چەوساندنەوانەی لە مێژوودا مرۆڤەکان دژی یەکدی بەرپایان کردووە لەپێناو پیرەوێك لە پیرەوە ئایینیەکان، یاخود سیاسیەکان لەئەنجامی ئەو چوارچێوە فیکریانەدا بووە کە چواردەوری عەقڵی مرۆڤیان داوە... مرۆڤێك یەکێکی دی دەچەوسێنێتەوە لەپێناو ئاین، یاخود بۆچوونێکیدا، دەبینی پاش ماوەیەك وەردەگەڕێ و دەبێتە لایەنگری ئەو کەسەی زوڵمی لێکردووە،

ئـەو کەسـانەش دەچەوسـێنێتەوە کـە ماوەیـەك لــەوەو پێـش لایــەنگری بۆچوونــەکانی بــوون، ســەرجەم دیــدو بۆچــوونو ڕوانینــەکانی خــۆی دەگۆڕێت تەنها ئەو شتەی وەکو خۆی دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت چوارچێوە فیکریەکەیـەتی. زۆر دەگمـەن نـەبێت یـەکێك نـاتوانێت لـەو چوارچێــوە فیکریـەی دەربـازی بێـت. چونکـە ئـەو چوارچێوەیــە لەنەســتی مرۆڤــدا حەشاردراوە، کەسیش ناتوانێت خۆی لەشتێك دەرباز بکات کە هەستی پێناکات.

هـەندێك کـەس نکوڵـی لـەبوونی ئـەو چوارچێوەیـە دەکـەن کـە دەوری عــەقڵیانی گرتــووە. بــەو کارەشــیان توندڕەوێتــی و تونــدو تیژیەکــەیان دەســـەلمێنن ((هەرچـــەندێك مـــرۆڤ بـــاوەڕی بـــەوە هـــەبێت کـــە لـــە بیرکردنەوەکانیدا ئازادە، ئەوەندە کۆیلایەتییە فیکیریەکەی پتر دەبێت)).

((ولیم جێمس)) فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەمریکا لـەو باوەڕەدایـە کـە عـەقڵی مـرۆڤ ((بەشێوەیەکی سروشـتی بەلایـەنگرو بەلاداشـکاندنەوە ڕوەو دیـاردەو شـتەکان دەناسرێت)). ((ئـەو فەیلەسـووفە لەوباوەڕەدایـە عەقڵ ناتوانێت بیرکردنەوەی بەرهەمهێنی هەبێت. ئەگەر لە ڕوانینەکانیدا لایەنگری نەکاتو بەلادا شکاندنەوەی نەبێت لە ڕێڕەوەکانیدا)). جێمس دەڵێــت: ((عــەقڵ نــاتوانێت ببێتــە خــاوەن توانایــەکی چــاك، ئەگــەر لەوشـتانەی بیریـان لێدەکاتـەوەو دەیانبینـێ هەڵنـەبژێرێتو ئـەوانی دی پشـتگوێ نـەخات)). بەواتایـەکی دی بەرتەسـك کردنـەوەو لـەقاڵبدانی دیدگاکانی.

بـا نموونەیــەکی ســادەو ســاکار لەســەر بۆچوونەکــەی جێمــس بهێنینەوە:

با وای دابنێین خۆپیشاندانێکی گەورە لە شەقامی سالم[1] ڕوودەدات. لەو خۆپیشاندانەدا سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵ لەژن و پیاو بەشداری تێدا دەکەن، هوتافەکانی دەگاتە کەشکەلانی فەلەك.

با وای دابنێین ژمارەیەك لە بینەران لەسەر باڵەخانەکانی عەلی نەمەڵی و ئوتێل ئاشتییەوە دەڕواننە خۆپیشاندانەکەو چاودێری ڕوداوەکان دەکەن... هەریەکێك لەو بینەرانە سەرنجی خۆی دەداتە بەشێك لە خۆپیشاندانەکەو بەشەکانی تری پشتگوێدەخات. بۆیە گەواهی دانی هەریەکێك جیاوازی دەبێت لەوانی دی سەبارەت بینینی خۆپیشاندانەکە. لاوێکیان سەرنجێکی ورد دەداتە جوانی هەندێك لە کیژە بەشداربوەکانی خۆپیشاندانەکە، کەواتە ئەو لاوە تەنها لایەنە سێکسییەکەی خۆپیشاندانەکە دەبینێ... ژنێکیش دەڕوانێتە جلوبەرگی ژنانی خۆپیشاندەر، کامەیان نوێترین جلی لەبەرکردوەو باشترین تەسریحەی قژی کردووە. پیاوێکی سیاسی هەموو شتێکی لەیاد کردووە و تەنها یەك شتی مەبەستە: ئایا ئەو خۆپیشاندانە چەند کاریگەری دەبێت لەسەر ڕوخاندنی ئەو وەزارەتەو یەکێکی تر بکەن بە وەزیر کە بەرژەوەندیەکانی ئەو بپارێزێت، ئەدیبێکیش تەنها گوێ لەو گوتارو هوتافانەیە کە دەگوترێنەوە بۆ ئەوەی هەڵەی زمانەوانی و ڕێزمانیەکانی بدۆزێتەوە. هەروەکو ئەو خۆپیشاندانە لەڕوانینی ئەوەوە تەنها شانۆگەریەکی زمانەوانی بێت. لاوێکی دی ڕوحی نیشتمانپەروەری وایلێکردووە لە بورکانێکی ئاگر زیاتر هیچی تر نەبینێ کە بەربوەتە لەشی. پەیامنێرە

---

[1] عەلی وەردی نوسیویەتی (شارع الرشید). ئێمە بۆ زیاتر ڕونکردنەوەو تێگەیشتن کردوومانە بە (شەقامی سالم).

ڕۆژنامەنووسەکەش تەنها خەمی ئەوەیە بزانێت چەند کەس دەکوژرێت و بریندار دەبێت.. سەرەڕای هەموو ئەوانەش بازرگان و خاوەن کۆگاو دوکاندارەکانیش دەستیان لەسەر دڵیانە نەبادا لەهەموو ئان و ساتێکدا تووشی تالانکردن بن.

کورتەی نمونەکە: هەریەکێك لەو بینەرانە لایەنێکی خۆپیشاندانەکە دەبینن و لایەنەکانی تر پشتگوێدەخەن. بەواتایەکی دی هەریەکەیان لەڕوانگەی ئەو چوارچێوە فیکریە تایبەتیەی خۆیەوە بۆی دەڕوانێت. ئەو ژنەی تەنها خەمی جلوبەرگی جوان بوو ڕقی لەو ئەدیبە دەبێتەوە کە هەڵە زمانەوانیەکان دەبینێ و پێکەنینی بەعەقڵی دێت. ئەو دەیەوێت هەڵەی بەرگدروەکە بزانێت، ئەدیبەکەش هەڵەی بکەرو فەرمان و ئاوەڵناو، ئەو لە کوێستان و ئەم لە گەرمیان... بەهەمان شێوە نیشتمانپەروەرەکە بەسیاسیە هەلپەرستەکە پێدەکەنێت، ئەو دەیەوێت ببێتە وەزیرو ئەمیش دەیەوێت سەروەریی شۆڕشگێڕەکانی زیندوبکاتەوەو شەقامی سالم بباتەوە سەردەمی شێخی نەمر.

هەریەکێك لەوانە بەگوێرەی ئەو ڕەنگەی لە دەرونیدایە واقیع دەنەخشێنێ و بەگوێرەی ئەو پێوەرانەی لەسەری گەشەی کردووە بابەتەکان دەپێوێ.

ئەو نموونەیەی لەسەر خۆپیشاندانەکە خستمانە ڕوو، بەسەر زۆربەی ڕووداوە دەروونیەکانیشدا جێبەجێ دەبێت کە ڕۆژانە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.. یەکێك لە هاوڕێکانت کتێبێك دەخوێنێتەوە و بەدڵی دەبێت و بەشان و باڵیدا هەڵدەڵێت، دوای ئەو تۆش هەمان کتێب دەخوێنیتەوەو شتێکی ئەوتۆی تێدا نابینی شایەنی پێداهەڵگوتن بێت و

بەپڕوپوچی تێدەگەی. لەوانەیە ئەم کتێبەی منیش هۆکارێك بێت بۆ پێدا هەڵگوتن و نکۆڵیکردنی نێوان تۆو هاوڕێکەت. تۆ دەڵێی کتێبێکی بەسوودەو هاوڕێکەشت دەڵێت هیچی تێدا نییەو پڕوپووچە. ئەو جیاوازیەی نێوانتان دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ڕوانینەکانتان..

جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر مرۆڤ لەزەوق و ئارەزوەکانیاندا ناکۆك بن. سەیرەکە لەوەدایە ئەو جیاوازیە تووشی نیگەرانی و دڵشکاندن و ڕەنجاندنیان بکات.

با نموونەیەکی تر بهێنینەوە: تۆو هاوڕێکەت دەچن بۆ بینینی فیلمێك. ئەو بەدڵی دەبێت و تۆش ڕەتی دەکەیتەوە. لەوانەیە هاوڕێکەت حەزی لە چیرۆکە سۆزدارو خۆشەویستیەکان بێت، بەڵام تۆ دەتەوێت فیلمەکە جەنگی، یاخود مێژوویی بێت، هەریەکەشتان خۆی بەڕاست دەزانێت و هاوڕێکەشی بەهەڵە.

دوو کەس لەسەر کچێك دەبێتە مشتومڕیان، جوانە یاخود ناشیرین، لەکۆتاییدا دەبنە شەڕو پێکدا هەڵپڕژان. هەریەکەیان ئەوی دی بە بێزەوق لەقەڵەم دەدات.. نازانن زەوقیش وەکو دیدی عەقڵ چوارچێوەیەك بوارەکانی دیاری دەکات.

یەکێك لە لێکۆڵەرەکان لەو بارەیەوە دەڵێت: ((هەموو پیاوێك ئەو شتەی لە کچێکدا خۆش دەوێت کە لەدایکی خۆی بچێت))، کەواتە شێوەی دەموچاوی دایکی لەقوڵایی دەروونیدا چوارچێوەیەکی ناهەستی دروست دەکات. تۆش ناتوانیت زەوق لەو جوانیە ببینیت تەنها لەڕێگەی ئەو چوارچێوە ناهەستییەوە نەبێت.

من سەرم لەو خەڵکانە سوور دەمێنێ کە لەسەر ئەو بابەتانە ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە.. لەجیاتی ئەوە چاکتر وایە ئەو پێوەرە ناهەستیانەی سەرچاوەی زەوقەکەیانی تێکداوە چارەسەر بکەن.

جێگەی داخە دادوەرەکانیش لە بەدواداچوونی گەواهیداندا هیچ گرنگییەك بەو لایەنە نادەن لەڕوانینی گەواهیدەرەکانەوە. ئەوان دەیانەوێت کاتێك چەند کەسێك دێنە دادگا بۆ گەواهی دان لەسەر ڕوداوێك کە بەچاوی خۆیان دیویانە هەموویان لەگەواهیدانەکەیاندا یەك دەنگ و هاوشێوەبن.

زۆربەی جار یەکێك سزا دەدەن لەسەر ئەوەی لە گەواهیدانەکاندا جیاوازیەکی کەمی هەبووە لەگەڵ هاوڕێکەیدا.

ئاگایان لەوە نییە لێکچوونی گەواهیدانی وەکیەکیان کارێکی سروشتی نیەو بیانوویەکی چاکیشە بۆ درۆکردن.

لەڕاستیدا هەر گەواهیدەرێك لایەنێکی جیاوازی ڕوداوەکە دەبینێت کە جیاوازەو بەدەگمەن نەبێت ئەوی تریان نایبینێت.

هەندێك جار یەکێك لە گەواهیدەرەکان ململانێی نێوان دووکەس دەبینێتو دەستدرێژی کردنەکە دەداتە پاڵ یەکێکیانو ڕاستیش دەکات.. بەڵام یەکێکی تر دێتو ئەوی تریان تاوانبار دەکات و بەدەستدرێژیکەری لەقەڵەم دەداتو ئەویش هەر ڕاست دەکات. چونکە هەریەکەیان لەڕوانگەی سۆزو ئارەزوو پێوەرە لۆژیکیە ناهەستیەکانیەوە دەڕوانێتە ئەو ململانێیە.. یەکێکیان لە وشەیەکی بریندارکەر کە لە یەکێکیانەوە دەرپەڕیوە چاو دەپۆشێو جەخت لەسەر وشەیەکی لەو سوکترو نەرمتر دەکاتەوە کە کەسی دووەمیان گوتویەتی. لەوکاتەدا ئەو

کەسە بەبێ ئەنقەستو بەبێ ئەوەی هەست بکات بەلای یەکێکیاندا دایدەشکێنێ.. ئەو کارە مێژوونووسەکانی لەمەوبەریشی گرتبۆوە. دەبینی یەکێك لە کەسیەتییەکانی مێژوو لەدیدی هەندێکیانەوە گەیشتۆتە پلەی خوداو لەدیدی هەندێکی دیانەوە فاسقێکی هیچو پووچەو شایەنی پێدا هەڵگوتن نیە. هەر یەکەیان لە شیکردنەوەی ئەو کەسیەتیە مێژووییەدا لەدیدی خۆیدا لایەنێکی ئەو کەسیەتیە دەبینێو لایەنەکانی دیکەی پشتگوێدەخاتو بەدرۆی دەخاتەوە.. ئەگەر پرسیاریشی لێبکەی بۆچی هەندێك هەواڵت بڵاوکردۆتەوەو هەندێکی تریشت پشتگوێخستووە پێت دەڵێت: ئەو هەواڵانەی بڵاوم نەکردوونەتەوە بە (ناماقوڵی) دەزانم. مەبەستی لە وشەی (ناماقوڵ) لە دەرەوەی چوارچێوە فیکریەکەیدایە.. هەروەکو باسیشمانکرد ئەو چوارچێوەیە پێوەری ماقوڵو ناماقوڵ لەیەکدی جیادەکاتەوە. لەهەمانکاتدا پێوەرێکی زاتیو ڕێژەییشە. بۆیە لە لێکۆڵینەوەی کەسیەتیە مێژووییەکاندا جگە لەو لایەنەی خۆیان دەیانەوێتو ئارەزووی دەکەن پتر نابینن.

لەسەردەمی ئەغریقەوە لەنێوان بیریارەکاندا سەبارەت بابەتە فیکریەکانی مرۆڤ جیاوازی هەیە.. ئایا بابەتە فیکریەکان حەقیقەت دروست دەکەن، یاخود حەقیقەت بابەتە فیکریەکان دروست دەکات؟؟ لەوەڵامیشدا دەبنە دوو بەشەوە:

بەشێکیان پێیان دەڵێن: (ئەفلاتونیەکان). کە لەوباوەڕەدان "عەقڵی مرۆڤ ئاوێنەی حەقیقەتە، بەبێ گۆڕانکاریو شێواندن". بەشی دووەمیان دەڵێن: "حەقیقەت ئەوەی عەقڵە، هیچ حەقیقەتێکیش لەدەرەوەی عەقڵدا نیە". لەوانەش سەفستائییەکان ناوبانگیان

پێ‌دەرکردوەو لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا لێیان دەدوێین بەبۆچوونی ئەوان مرۆڤ پێوەری حەقیقەتە، هەر ئەویش بەگوێرەی ئارەزوو و بەرژەوەندیەکانی خۆی دروستی دەکات. بۆیە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دی‌و لەشارستانیەتێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت... ئەو شتەی ئەمڕۆ بەحەقیقەت دەژمێردرێت دەشێت سبەینێ حەقیقەت نەبێ.

ئەو دوولایەنە لە تێگەیشتنی حەقیقەت لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەهەڵە دادەنرێن‌و لەبری ئەوانیش لۆژیکێکی نوێ هاتۆتە گۆڕێ. ناوەڕۆکەکەی دەڵێت: حەقیقەت لەیەک کاتدا (خودی و بابەتیە)، بە واتایەکی دی حەقیقەت بەو پێودانگە نوێیە لەیەک کاتدا فیکر دروست دەکات‌و فیکریش دروستی دەکات.. هەریەکەیان دەبێتە هۆکارو ئامانجێک بۆ ئەوی تریان.

(مانهایم) بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی ئەو قوتابخانە نوێیەی لۆژیك دەژمێردرێت‌و دەڵێت: "حەقیقەت لە دەرەوەی عەقڵی مرۆڤدایە، بەواتایەکی دی: لەدروستکردنی ئەو عەقڵە نییەو لە هەمانکاتیشدا چەندین ڕوکاری هەیە. کاتێك لە عەقڵ دەڕوانین لەزۆربەی کاتەکاندا تەنها روویەکی دەبینرێت. بۆیە ناتوانین وێنەیەکی تەواو و پڕاوپڕی سەبارەت وەربگرین. یاخود: عەقڵ لە حەقیقەتی دەرەکیدا بەشێك وەردەگرێ و خۆشی بەشێکی دی دەخاتە سەری، بۆ ئەوەی حەقیقەتەکە کامڵ بکات. هەر ئەوەشە هەریەك لە ئێمە حەقیقەتی تایبەت بەخۆی هەیەو هەروەکو جانتایەك لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێت.

دەتوانین حەقیقەت بچوێنین بە هەرەمێکی چەند ڕوو: کەمرۆڤ نەتوانێت لەیەك کاتدا لەڕوکارێکی زیاتر ببینێت. لەوانەیە یەکێك ئەمڕۆ

ڕوویەکی ببینێ و سبەینێ ڕوویەکی تری.. هەموو ڕۆژێکیش بەو بینینەی ڕووکارێکی حەقیقەت تووشی لەخۆبایی بوون و گومڕایی دەبێت. چونکە وا دەزانێت تەنها خودی خۆی حەقیقەت دەبینێ و خەڵکانی تر لەبینیی حەقیقەتدا بەهەڵەدا چوون.

(جۆن دیوی) لایەنگرێکی بەهێزی ئەو حەقیقەتەیەو لەو باوەڕەدایە: عەقڵی مرۆڤ ئاوێنەی حەقیقەت نیە و لەپێناوی حەقیقەتیشدا دروست نەبووە. بەڵکو ئامانجێکی گرنگترو سودبەخشتری لەپێشە، ئەویش زاڵبوونە بەسەر ململانێ و کێبەرکێی مانەوەدا. پێشینەکان لەو باوەڕەدابوون عەقڵ تیشکی هیدایەت و پێوەری حەقیقەتە، بەڵام (دیوی) ئەوانە بەهیچ و پوچ ناودەبات. لەدیدی (جۆن دیوی)یەوە عەقڵی مرۆڤ ئەندامێکی پێشکەوتووە. بۆ ئەوەش پێشکەوتووە یارمەتی بدات لە خەبات و هەوڵ و تێکۆشانی ژیانداو ململانێی مانەوەیدا. بۆیە دیوی تەنها ڕێژەی سوودمەندێتی و بەرژەوەندی لە حەقیقەتدا دەبینێ. بەڵام عەقڵ پابەندو پێوەندی ئارەزووە ژیاری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ..... هتد ی مرۆڤە.

کەسێك کاتێك کچێکی خۆشدەوێت، یاخود مەبەستی بیمەیەکی ئابوری و پێگەیەکی کۆمەڵایەتییە.. بەڵام ئەگەر حەقیقەت یارمەتی وەدەستهێنانی ئەو ئامانجە چێژ بەخشە ئارەزومەندانەیەی نەدات خۆشی ناوێت.. یەکێك لە گوتە بەنرخەکانی ڕۆژئاواییەکان دەڵێت: ((گوزەرانی مرۆڤ بگۆڕە، بیرکردنەوەشی دەگۆڕێت)). ئەو پەندەش تاڕادەیەکی زۆر لەڕاستییەوە نزیکە. چونکە هەژارێکی برسی حەقیقەت لە پارچە نانێکدا دەبینێ.

(دیـوی) دەڵێــت: (( عــەقڵ ئامرازێکــە بــۆ ژیــان)) کەواتــە مــرۆڤ پشتئەستوری عەقڵە بۆ وەدەستهێنانی بژێوی ژیان.

بـەڵام میسـالیەکان سـوورن لەسـەر داواکردنــی حەقیقـەتی رەهــاو بانگەشـــەی وەدەســـتهێنانی... ســـەرنج دەدەی یـــەکێکیان هـــەوڵدەدات قەناعـەت بـە بەرامبەرەکـەی بهێنێت کـە حەقیقـەت تەنـها لای ئــەو دەسـت دەکەوێت.. کاتێك دەبینێ بەرامبەرەکەی قەناعەت ناکات لێشاوی توڕەیـی بەسەردا دەبارێنێ.. ئاگای لەوەنیە بەرامبەرەکەشی وا دەزانێت حەقیقـەت تەنها لای ئەوە.

میسـالیەکان داوا لەبەرامبەرەکـەیان دەکـەن: لەسـەر بنــەمای لۆژیـك بیربکەنـەوە بۆ لـە حەقیقـەت گەیشـتن، لـەوێدا مەبەسـتی تەنــها حەقیقەتـە تایبەتیەکەی لەمەڕ خۆیـەتی. واتـای ئەمـەش: ئەو داوا لەبەرامبەرەکەی دەکات بـەلای ئەودا بشـکێتەوەو پاڵپشـتێك بێـت بـۆی لـەژیانیدا.. بـەڵام بەرامبەرەکەشـــی خـــۆی لـــەو گوتەیـــەی دەدزێتـــەوە. چونکـــە ئـــەویش حەقیقەتی تایبەت بەخۆی هەڵگرتووەو دەیەوێت تێیـدا سـەرکەوتووبێت. ئەوەش تەنها هۆکاری ململانێو شەڕو ئاژاوەو کوشتارە لە نێو کۆمـەڵانی خەڵکدا.

مێژوو ئەو راستیەی سەلماندووە هەموو ئاینـەکان بەهـەموو شـێوەو جۆرەکانیانـەوە، هــەتا لــەنێو خــودی خۆیــاندا دووبــەرەکیو ململانێیــان تێکـەوتووە، شـەڕیان کـردووەو خوێنیـان رژتـوەو خوێنیـان رژێــنراوە، بەواتایەکی دی: هەتا لەنێو خۆشیاندا بۆچوونو پێڕەوی جیـاواز سـەری هەڵنـــەدابێت ســـەرکەوتوو نـــەبوون، هـــەموو (بـــەرە)و پێڕەوەکـــانیش بانگەشەی ئەوە دەکەن کە حەق تەنـها لای ئەوانـەو دادپـەروەریش موڵکـی

تــەواوی داهێنەرانـــەی خۆیانــە.. جێگـــەی سەرســـوڕمانە هـــەندێك لـــە مێژوونووسان هۆکاری دووبەرەکی و ململانـێ و جیـاوازی لـە ئاینـەکاندا دەخەنە ئەستۆی یـەکێك لـە کەسـیـەتیـەکانی مێـژوو، بەرنەعلـەت و تانـەو تەشـەری دەدەن و تۆمـەتبارو تاوانبـاری دەکـەن. بـەو پێودانگـەی گـەلی ئیماندارو یەکڕیزی دووکەرت کردووە. نازانن دووبەرەکی سروشتێکە لـە عـەقڵی مرۆڤدا، دووبـەرەکی و ململانێش ڕوونادات هـەتا سـەرکەوتنەکان نەیەنە ئاراوە.

خـەباتی هـەموو کۆمەڵـەو گروپێـك لەسـەرەتادا یـەکگرتوو یـەکڕیز بووەو هیچ دووبـەرەکی و ململانێیـەك لـەنێوانیاندا نـەبووە، چونکـە لـەو کاتەدا بەرژەوەندی تاك و کۆمـەڵ یـەك شتە، بەڵام کاتێك گەشە دەکـەن و سەرکەوتنەکانیان دەستپێدەکات و دەستکەوتەکان تاڵان و دابەش دەکەن، هەروەها کاتێك هەندێك لە تاکەکان لەسەر حیسابی ئەوانی دی ڕادەبوێـرن و دەبنە خاوەنی سەروەت و سامان، لەوکاتەدا دەلاقەکان گـەورەتر دەبن و دووبەرەکییەکان دەست پێدەکەن.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کـە پێوەرێکـی عـەقڵی وردنیـە قەناعـەتی پێبکرێت. هەرچ تاکێك چووەتـە خودی خۆیـەوەو لایەنە سلبیەکانیشـی نـابینێت، تەنـها جـەخت لەسـەر ئیجابیـەکان دەکاتـەوە. بۆیـە کـاتێك رکابـەرێك دەبینـێ بەرامبـەر دیـدو بۆچوونـەکانی، تووشـی هـەڵچوون دەبێـت.. گیرو گرفتەکەش لـەوێوە دەسـت پێدەکـات: مـرۆڤ بـەگوێرەی سروشتی خۆی خۆپەرستە، ئەگەر هەرچەندێکیش خۆی بە میهرەبان و بەخشـندە دەربخـات، هەمیشـە بـەلای خۆیـدا دایدەشـکێنێت. کـە ئـەو کـارەش دەکـات لـەو باوەڕەدایـە مەبەسـتی چاکـەو خـێری گشـتی و

بەرژەوەندی کۆمەڵەکەیەتی.. عەقڵی مرۆڤ هەمیشە لەوباوەڕەدایە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لە بەرژەوەندی کۆمەڵەکەیدایەو یەك شتن. هەرچ شتێکیش سوود بەخاوەنەکەی بگەیەنێت لەڕوانینی ئەوەوە حەقێکی رەهایەو پێویستە سەرجەم کۆمەڵانی خەڵك شوێنپێی هەڵگرن.. هەر ئەویشە وامان لێدەکات گومان لەپاکی و بێگەردی ئەو مرۆڤانە بکەین کە بانگەشەی حەقی رەهاو دادپەروەری دەکەن، لێکۆڵینەوەکانی مێژوو، ئایین، دەوڵەتان چەندین نموونەی راستی ئەو بۆچوونانەی سەرەوەمان دەسەلمێنن.

هەموو شۆڕشگێڕێك، یاخود پێڕەوێکی ئاینی، سیاسی بانگەشەی ئەوە بکات حەق تەنها لای ئەوە، بەو بانگەشەیەی جەماوەرو چەك و تەقەمەنی کۆبکاتەوەو عەقڵیشی بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەو سەلماندنەکان کاربکات. لەوکاتەدا لەلایەکەوە دوژمنەکەی بەر شمشێر دەدات و لەلایەکی دیکەوە بە بەڵگەو سەلماندنە عەقڵیەکانی لە خشتەیان دەبات.

جێگەی پێکەنینە میسالیەکان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان بزانن کێ هۆکاری دووبەرەکی نێوان گەل و ئایینە. ئەوەیان لەیادکردووە کە هەموو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی لەباشترین و چاکترین حاڵەتەکانیدا تۆوی دووبەرەکی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، چونکە هەتا دووکەرت نەبێت سەرکەوتوو نابێت. هەروەکو (ئەمیبیا) تاکەرت نەبێت و نەبێتە دوو (ئەمیبیا) ناگاتە حاڵەتێکی دیاریکراوی گەشەکردن. هەریەکێك لەو دوانەش کە گەشەیان کرد، دەبنە دووکەرت و بەو شێوەیە بەردەوام دەبن.

سەرکەوتن لە بنەما سروشتییەکەیەوە تۆوی هەرەسی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە. لەهیچ ئایین یاخود بزوتنەوەیەکدا نەمانبینیو وە دوای

سەرکەوتنی کارەکانی وەکو خۆی بمێنێتەوە.. چینێك هەیە سوود لەو سەرکەوتنە وەردەگرێت و دەستکەوتەکانی بۆ خۆی کۆنترۆڵ دەکات. چینێکی دی دروست دەبێت بۆ بەرهەڵستکاری و ڕکابەری کردنی بۆ وەدەستهێنانی سوودمەندی و بەرژەوەندی، عەقڵیش لەو رکابەری و ململانێیەدا چەکێکە بەردەوام بەدەست هەموو دەستەو تاقم و حیزبێکەوە (هەموو حیزبێك بەوەی هەیەتی بەختەوەرە)[1].

ئەگەر مێژووی ئیسلام هەڵدەینەوە ڕاستگۆیی ئەو بۆچوونەی سەرەوەمان بۆ دەردەکەوێت. لەوانەیە دووبەرەکی لە ئیسلامدا بەر لەهەموو ئاینەکانی دی سەری هەڵدابێت. هۆکارەکەشی ئەو خێراییە زۆرەی سەرکەوتنی بانگەشەی ئیسلام بوو. هەروەکو دەشڵێن بابەتی خەلافەت سەرچاوەی سەرەکی سەرهەڵدانی دووبەرەکی بووە لەئیسلامدا. خەلافەت لەسەرەتای ئیسلامدا بەرگێکی خودا پەرستی ملکەچبوونی لەبەرکردبو، بۆیە ململانێکەشی زۆر لاوازبوو، بەشێوەیەك هەستی پێنەدەکرا.. بەڵام کاتێك خۆشڕابواردن و خۆشخواردن و جۆرەکانی تری لەزەت سەری هەڵداو جێ پێی خۆی کردەوە، هەموو دەرونەکان هەرەسیان هێناو عەقڵەکانیش چەندین مەزهەبیان دروست کردو تیپە ئایینیە جیاوازو جۆراو جۆرەکانیش دروست بوون، هەر هەموو ئەوانەش بۆ وەدەستهێنانی خەلافەت بوو.

دەتوانین بڵێین هەموو سەرکەوتنەکانی (تاك) تۆوی ڕوخانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە. کاتێك مرۆڤێك لەکارێکدا سەردەکەوێت، چوارچێوە

---

[1] ((كلُّ حزبٍ بما لَدَيهم فَرِحون)).

فیكریەكەشی دەگۆڕێت، بە دیدێكی نوێوە هەوڵدەدات لەگەڵ بارودۆخە نوێیەكەدا بیگونجێنێت.

ئەو گۆڕانكاریانەش هۆكارەكانی ڕوخانی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت. بۆ نموونە: (هێتلەر)، گەشبینیەكانی سەركەوتنە یەك لەدوای یەكەكانی ڕوەو لەخۆبایی بوون و گومڕایی برد..

گەشبینیش هەروەكو لەمەودوا لێی دەدەوێین یەكێكە لە هۆكارەكانی سەركەوتن، بەڵام كە لەسنووری خۆی تێپەڕی دەگۆڕێت بۆ هەرەس و ڕوخان و ژێر كەوتن.

هێتلەر كە خۆی بینی لە پلەی (عەریفێكەوە) گەیشتە سەركردەیەكی گەورەی گەلێكی مەزنی وەكو ئەڵمانیا، وردە وردە قەناعەتی بە پیرۆزی خۆی هێناو وایدەزانی هەرگیز لەبڕیارەكانیدا هەڵەناكات.. بەو شێوەیە ئەو گەلە مەزنەی ڕووەو هەرەس و تێكشكاندنێكی گەورە برد.

هەروەها بازرگانانی جەنگیش بەهەمان شێوە، ئەو پارە زۆرەی لە ماوەیەكی كورتدا وەدەستی دەهێنن تووشی لەخۆبایی بونیان دەكات و لەو باوەڕەدان هەرگیز تووشی هەژاری و نەبوونی نابنەوە. بۆیە ئەو لە خۆبایی‌بوونەیان تووشی هەرەس و داڕوخانی داراییان دەكات.

خاوەن بڕوانامە بەرزەكانیش لە كۆمەڵگە زۆرینە نەخوێندەوارو نەزانەكاندا هەروەكو بازرگانانی جەنگن، خۆیان لەبەرزترین پلەی سەركەوتندا دەبینن، بە بەراورد لەگەڵ دەورو پشتە نەزانەكەیاندا، بۆیە پاش ماوەیەكی كەم لەوەرگرتنی بڕوانامەكەیان دەستبەرداری خوێندنەوەو ئەفكارەكانیان دەبن و تووشی چەقبەستوویی

فیکـری دەبـن، بۆیـە دەبینـی لـەپێناو پلەوپایـەی زانکـۆو نزیکبوونــەوە لەپیاوانی دەسەڵات، پیلان‌و داو بۆ یەکتری دادەنێن.

چارەڕەشی مرۆڤ لەوەدایە هەندێك جار خودی خۆی دەستی لــە دروســتکردنی چوارچێــوە فیکریــەکانی‌دا هەیــە، یــاخود گۆڕینـــی بەگوێرەی هەندێك یاسای ژیاری و گەشەکردن کە ئەو هیچ دەسـەڵاتێکی تێدا نییە.

هــەروەکو لەســەرەوە گوتمــان چوارچێــوە فیکریــەکان ناهەســتین، مرۆڤیـش نـاتوانێت دەسـەڵاتی بەسـەر شـتێکدا هـەبێت کــە لــەدەرەوەی هەســتەوەرەکانیدا بــن.. ئێمــە لــەم بەشــەدا هــەوڵدەدەین چوارچێــوە فیکریەکان لە نەستەوە بخەینە بازنەی هەستەوە. تاوەکو خوێنەر بزانێت چ شتێك عەقڵی پێوەند کردوەو ڕوانین‌و دیدو بۆچوونەکانی سنووربەند کردووەو بەربەستی خستۆتە ڕێگەی سەرکەوتنەکانیەوە .

سـەرەتا دەبێـت ئـەو تیۆریانــە بناسـین کــە عــەقڵی مـرۆڤ پێوەندو پەیوەست دەکەن، بەواتایەکی دی: ئەو یەکە پێکهاتانە چین کە چوارچێوە فیکریەکانی مرۆڤ دروست دەکەن.

**دەتوانین بڵێین سێ‌جۆر پێوەند دەوری عەقڵی مرۆڤیان داوە:**

١- پێوەندە دەروونییەکان.
٢- پێوەندە کۆمەڵایەتییەکان.
٣- پێوەندە شارستانییەکان.

١- بەر لەهەموو شتێك دەبێت ئەو ڕاستیە بزانین کە مرۆڤ خـاوەنی دەروونێکـی ئـاڵۆزەو سـەرجەم ئـارەزووە سـەرکوتکراوەکان‌و سـۆزە

تێکشکاوەکان و ڕێڕەوە شاراوەکانی لەخۆ گرتووە.. بۆیە بیریشی پێوەندو پەیوەستی ئەو گرێ دەروونیانەیە.

هەموو مرۆڤێك بانگەشەی ئەوە دەکات ئازادانە بیر دەکاتەوەو لایەنگری هیچ پاڵە پەستۆیەك نییەو لەڕوانینەکانیدا توندڕەو نیە. ئەوە ڕاستە، چونکە نازانێت چ شتێك لە عەقڵی ناوەوەیدا خۆی حەشار داوە لە گرێ و سۆزو هەڵچوونە شاراوەکان. لەوانەیە لە یەکێك بپرسیت: بۆچی هێتلەرت لەهەموو سەرکردەیەك خۆشتر دەوێت؟ دەڵێت: لە بەر پاکی و گەورەیی و بەتوانایی زۆری هێتلەر. بەو وەڵامەی بیانوویەکی بۆ دروست دەکات هەتا پێت بسەلمێنێت ئەو خۆشەویستیەی ئەو لە حەقیقەتی هێتلەرەوە هاتووە. بەڵام لەڕاستیدا ئەو بۆیە هێتلەری خۆشدەوێت، چونکە چیرۆکی ئەو پیاوە هەندێك لە ئارەزوو و حەزە سەرکوتکراوەکانی تێردەکات لە هێزو دەستدرێژی و داگیرکاری و ...هتد. ئەو هاوڕێیەمان بەشێوەیەکی ناهەستی هەست بە کەمی (نقص) دەکات لە دەروونیداو لە هێتلەردا ئەو شتەی دۆزیوەتەوە کە ئەو (کەم)ی یەی بۆ پڕ دەکاتەوە.

٢- بیری مرۆڤ سەرەڕای ئەوەی پێوەندە دەرونیەکانی پێوەندە کۆمەڵایەتیەکانیش دایپۆشیووە، هەموو تاکێك لە کۆمەڵدا سەرەبە چین، شار، هۆز و .....هتد تایبەتیە. بۆیە بەحەق و ناحەق توندڕەوە بەرامبەر (چین، شار، هۆز)ەکانی تر، هەروەکو عەرەبی جاهیلی دەیانگوت: (پشتی براکەت بگرە باچەوساوە، یان چەوسێنەریش بێت).

کۆنـە جەندرمـەکانی عـێراق ڕێـزو حورمـەتێکی لەڕادەبـەدەریان لەسـەردەمی بەسـەرچووی عوسمـانی دەگـرت، هـەروەکو ئاشـکرایە دەسـەڵاتی عوسمانیـەکان قـێزەون و بـێزراوبوو، بـەڵام کۆنـە جەندرمەکانی ئەو کاتە وێنەیەکی جیاوازیان لەو واقیعە دەگێڕایەوە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ دروستبوونی چوارچێوە فیکریەکانیان. کـە لـەو سـەردەمەدا ئـەوان دەسـەڵاتدارو خـاوەنی دەسـتکەوت و خۆشگوزەرانی و پلەو پایەبوون. بۆیـە بەچاکترین و بەختەوەرترین سەردەم لـە مێـژووی مرۆڤایـەتیدا لەقەڵـەمی دەدەن. ئەوان لـە گۆشـە نیگایـەکی پێچەوانـەی کۆمەڵانی خـەڵکی ئـەو سـەردەمەوە دەڕواننـە عوسمانیەکان.. یەکێك لەو جەندرمانە جارێکیان دەیگوت: ((مەخابن خووڕەوشت و هەڵسوکەوتی فەرمانبەرەکانی ئەم سەردەمە گۆڕاوە، کارمەندی سـەردەمی عوسمانیـەکان چەند تـەڕپۆش و خـوو ڕەوشـت بەرزبوون، بەدەگمەن نەبێت تێکـەڵاوی خـەڵکی نـەدەبوون، بـەڵام کارمەندانی ئەمڕۆ چەند بەسادەو ساکاری لەگەڵ خـەڵکیدا دەدوێن، هـەمان جلوبـەرگی ئـەوانیش لەبەردەکـەن...)). ئـەو جەندرمەیـە بـەم شـێوەیە کۆتـایی بـە گوتـەکانی هێنـا: ((ئـەو سـەردەمە زێڕینـە بەسـەرچوو، لەوکاتـەدا حکومـەت حکومـەت بـوو، پیـاویش پیـاو)). مـن نـەمتوانی مشـتومڕی لەگـەڵدا بکـەم، چونکـە هـەموو جـۆرە گفتوگۆیـەك لـەو بارەیـەوە تـوڕەو نیگـەرانی دەکـردو دەمـاری دەسـووتاند. چونکـە چوارچێـوە فیکریەکـەی بەوشـێوەیە دروسـت ببـوو... ئـەو تـەواو بـە پێچەوانـەی منـەوە دەیڕوانییـە حکومـەت.. لەدیدی مندا حکومەت خزمەتکاری کۆمـەڵانی خەڵکەو کارمـەندانیش

کرێگرتەین. بەڵام ئەو پێچەوانەکەی دەبینیێ چونکە ئەو سەر بەکۆمەڵێك بوو منیش کۆمەڵێکی تر. ئەو لەچینی دەسەڵاتدارو منیش لەچینی فەرمانبەربەسەردا کراو. هەروەك گوتیشمان هەریەك لەو چینانەش چوارچێوە، یاخود دیدگایەکی تایبەت بەخۆی هەیەو لەو ڕوانگەیەشەوە دەڕوانێتە بارو دۆخەکان.

٣- ئەو پێوەندانەن کە هەموو کۆمەڵ و چینەکان لە چوارچێوەی شارستانیەتێکی دیاریکراودا بەشداری لە دروستکردنیدا دەکەن. بۆ نموونە: سارانشینەکان بەهاو ئامانجی تایبەت بەخۆیان هەیە.. و لەژیانیاندا باوەڕیان پێیەتی، سەرەڕای جیاوازیان لەتوندڕەوی هۆزو چینە کۆمەڵایەتیەکەیان. ئەو بەها کۆمەڵایەتیانەش دەچێتە قولایی نەستیانەوەو (تاك)ی تێدا گەورە دەبێت، بەشێوەیەك دەبێتە بەشێکی جیانەکراوە لە لۆژیك و شێوازی بیرکردنەوەی. ئەگەر گومانی لەرەوشتی خوشکەکەی کرد زۆر بەشانازییەوە دەیکوژێت و وا دەزانێت لەپێناو حەق و فەزیلەتدا خەباتی کردووە.. خۆ ئەگەر پێ ی بڵێیت بۆ ئەو کارەت کردووە، سەری سوڕدەمێنێ و بەبێ کەرامەت ناوت دەبا.. بەپێچەوانەشەوە لە ئەمریکادا باوك بەختەوەر دەبێت کچەکەی هاوڕێیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە.. لەماڵەکەی خۆیدا بەتەنیا جێیان دەهێڵێت بۆ ئەوەی یەکدی لەباوەش بگرن. ئەگەر پرسیاری ئەو کارەی لێبکەی پێت دەڵێت: ئەوە باشترین هۆکارە بۆ ئەوەی کەسیەتی ئەو کوڕە تاقی بکاتەوە..

ئەمریکیەکە کارەکەی بیابانن‌شینەکە بەوەحشیگەری ناودەبات‌و ئەویش ئەمریکیەکە بەبێ شەرەف لەقەڵەم دەدات‌و هەر یەکەشیان باوەڕێکی تەواوی بەو شتە هەیە کە دەیکات‌و دەیڵێت.

دوو سوارچاکی سەدەکانی ناوەڕاست لە تەنیشت پەیکەرێکی کۆندا وەستابوون، هەریەکەیان کەوتبووە لایەکی پەیکەرەکەوە، لەسەر ڕەنگی پەیکەرەکە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، یەکێکیان دەیگوت ڕەنگی زەردەو ئەوی دیان دەیگوت نەخێر شینە، لەڕاستیشدا هەردوکیان ڕاستیان دەکرد چونکە پەیکەرەکە لە لایەکەوە بۆیەی شین‌و لەلایەکەی ترەوە بۆیەی زەرد کرابوو. ئەو دوو سوارچاکە قارەمانە چرکەیەك بواری یەکدیان نەدا بۆ ئەوەی لە هەردوولاوە بۆ پەیکەرەکە بڕوانن، چونکە مەبەستی هەریەکەیان بەدرۆخستنەوەی ئەوی دیکەیان بوو. لەئەنجامدا شەڕە جنێو دەستی پێکردو پاشانیش شەڕە شمشێر.

زۆربەی مرۆڤەکان هەروەکو ئەو دوو سوارچاکە دەمەقاڵێ‌و مشتومڕو شەڕو کوشتار لەنێوانیاندا ڕوودەدات، هەریەکەیان لە گۆشە نیگای تایبەت بەخۆیەوە دەڕوانێتە حەقیقەت و داوا لە خەڵکانی تریش دەکات ئەوشتە ببینن کە ئەو دەیبینێ. گیروگرفت وململانێی مرۆڤایەتی بەرلەوەی کێشەو ناکۆکی نێوان حەق و ناحەق بێت، ململانێی نێوان پێوەرو دیدگا تایبەتیەکانە.. چەندین رکابەری و ململانێ کە خەڵك وادەزانن لەنێوان حەق‌و ناحەقدایە، لەڕاستیدا ململانێی نێوان حەق‌و حەقێکی ترە.. هەموو کەسێکی ڕکابەر لە ململانێیەکدا وا دەزانێت تەنها خودی خۆی حەقەو بەرابەرەکەی ناحەقە.. ئەگەر تۆش لە گۆشەنیگای هەریەکەیانەوە بڕوانیتە بابەتەکە دەبینی کەم یا زۆر ڕاستی لەگەڵدایە.

شتایل دەڵێت: ((ئەگەر هەموو شتێکت زانی، لە هەموو کەسێك دەبووری)). ئەو گوتەیەش لەهەندێك لایەنەوە ڕاستی پێکاوە. تۆش دەتوانی لە هەموو کەسێك ببووری ئەگەر لە گۆشەنیگای ئەوەوە بڕوانیتە شتەکان. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە کۆمەڵانی خەڵك لە هەڵسوکەوتی شێتەکان دەبوورن و ئەگەر تاوانێکیان کرد لۆمەیان ناکەن. تاوانباریش وەکو شێت وایەو خاوەنی عەقڵی تایبەتی خۆیەتی و ئەو عەقڵەش پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی تاوان.. ئەو گوتەیەمان داکۆکیکردن نییە لە تاوانبار و زۆربەی جار لەپێناو بەرژەوەندی گشتیدا تاوانبار شایەنی سزادانە. بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێین ئێمە کاتێك سزای تاوانبارێك دەدەین زوڵمی لێدەکەین بۆیە سزادانی تاوانبارێك لەپێناو بەرژەوەندی گشتیدا (شەڕێکەو دەبێت بکرێت)، خۆی لەخۆیدا زوڵمێکی کەمە، لەپێناو بەرژەوەندیەکی زۆردا.

لۆژیکی نوێ باوەڕی بە دادپەروەری ڕەها نیە، لەهەمانکاتدا باوەڕی بەمافی ڕەهاش نیە.. لەڕوانگەی ئەو لۆژیکە نوێیەوە دادپەروەریەك نییە سەرجەم کۆمەڵانی خەڵك بگرێتەوە، هەر کەسێکیش بانگەشەی مافی ڕەها بکات بەبێ ئەوەی هەست بکات، یاخود هەست نەکات دەیەوێت کۆمەڵانی خەڵك بخەڵەتێنێ، یاخود بەلای خۆی و کۆمەڵەکەیدا پەلکێشی بکات. لەواقیعدا ژیان ململانێی نێوان بەرژەوەندیە جیاجیاکانە، هەموو مرۆڤێکیش ئەگەر بکوژو ڕێگریش بێت، لە دوربینی تایبەتی خۆیەوە ئەو مافە دەبینێ... بۆیە لەوکاتەدا دادپەروەری دژی کەمینە بەلای زۆرینەدا دەشکێتەوە. بەواتایەکی دی هەندێك جار زوڵمکردنیش پێویستە.. کاتێك دوو ماف بەریەك دەکەون

یەکێکیان سەر بەڕێژەیەکی کەمەو دەیەوێت لەسەر حیسابی ژمارەیەکی زۆر وە دەستی بهێنێت.. لەوکاتەدا حەق بانگت دەکات زالم بیت بۆ ئەوەی مافەکەی دی سەرکوت بکەیت.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوکەسانەی خۆیان سوودمەندن وا دەزانن تێکڕای خەڵکی سوودمەند بووە... بۆیە ئارەزوو شەهوەتەکانیان بەسەر خەڵکی دیدا دەسەپێنن و دەیانەوێت خەڵکیش ملکەچیان بێت‌و بە پیرۆزیان لەقەڵەم بدات.

مێژوو ئەو ڕاستیەی سەلماندووە هەموو دیکتاتۆرێك لە جیهاندا لەوباوەڕەدا بووە دادپەروەرەو پیاوی چاکە، چونکە دەوروبەرەکەی هاندەرێکی بەهێزن بۆ ئەوەی ئەو بڕوایەی لەلا دروست ببێت... خەڵك دەچەوسێنێتەوەوماڵیان تالان دەکات...بەڵام چەوساوەو زوڵملێکراوەکان بەبێ دەنگی ئەو زوڵمە قەبوڵ دەکەن... ئەو هەرگیز هەست بەوە ناکات کە زوڵم دەکات‌و دەچەوسێنێتەوە. چونکە لەنێوان خۆی‌و خەڵکەکەدا پەردەیەکی ئەستووری دروستکردووە.. هەموو دیکتاتۆرێك بەخشندەیی و میهرەبانی‌و نیعمەتی خۆی بەسەر ئەوانەدا دەبارێنێ کە هونەری بەکارهێنانی زمانلووسیان هەیە، لەشاعیرو مێژوونووس‌و ...هتد، لەدەوری خۆی کۆیان دەکاتەوە و کۆشکەکەی لە سروودی پێداهەڵگوتن‌و شیعری نەمری پڕ دەکەن.

کەواتە ئەو لەو چوارچێوەیەوە دەڕوانێت کە دوو زمان‌و دووڕوو ماستاوچی‌و هەلپەرست بە نیعمەت‌و بەخشندەییەکەی درووستیان کردووە. لەدیدی ئەوانەوە دیکتاتۆرەکە دادپەروەرێکی بێوێنەیە.

زۆربــەی جارەکــان مێــژوو، چیرۆکــە تراژیدیاکــان هەڵدەگێڕێتــەوەو بەدێڕە پیرۆزەکان دەنووسرێت.. مێژوو ئەو مێژوو نووسانە دەینوسنەوە کە دیکتاتۆرەکان لە بەخشندەیی و سەروەتو ساماندا خنکاندوونی.. ئـەوان تەنـها چاکـەو میـهرەبانیو بەخشـندەییان لـێ دیـوە. هـەموو مرۆڤێکیش ڕوداوەکـان بـەو پێـوەرە دەپێـوێ کـەخۆی حـەزی لێدەکات. بەڵام خـەڵکی ڕەشوڕووت و نەدار ئەنجامی زوڵمو زۆری ئـەو دیکتـاتۆرە دادپـەروەرە دەچێـژن، گوتـەو وشـەی بریقـەدارو (شـیعری شـاعیرانی هەلپەرست و چیرۆکی چیرۆکنوسانی دووڕوو) هەڵیان دەخەڵەتێنێ.. بۆیە وەکو پەپوولەیان لێدێت، بەبێ ئەوەی هەست بکەن خۆیان فڕێدەدەنە ناو ئاگرەوە.

ئەگەر لەو نێوەندە زۆرینـەی چەوساوەکاندا یەکێك هەبێت دەنگی ناڕەزایی شیعر، چـیرۆك، پەخشـانو ....هتـد هـەڵبڕێت. دیکتاتۆرەکـە ڕووەو خـۆی کێشـی دەکـاتو نیعمـەتی میـهرەبانی بەسـەردا دەبـارێنێت.. ئەگـەر نیعمەتەکەشـی ڕەتکـردەوە و بـەزمانی بـرا چەوسـاوەکانی دوا، ئەوکاتە پیاوە ئیماندارەکانی دیکتاتۆر بە لادەر و یاخی بوو جودا خوازو ...هتد تاوانباری دەکەن.. ئالەو خاڵەدا ململانێی فیکریی شێوەیەکی تر وەردەگرێت. هەموو بزوتنەوەیـەکی کۆمەڵایـەتی لەسـەرەتاکەیدا بەجودا خـوازلەقەڵـەم دەدرێـت. ئەگــەر هەڵسوڕێنەرانیشــی لــە خەباتەکــەدا سەرکەوتنیان وەدەستهێنا دەبن بە پاڵەوانی مێژوو..

لەمیســردا و لــەکاتی لەســەر کــارلابردنی مــەلیك فــاروقدا (دوا پادشاکانی میسر)، بە هەموو زمانێکەوە بە فاروقدا هەڵیاندەگوت... بەڵام لە دواییدا ئەو ڕاستییە دەرکـەوت کـە فـاروق سـەروەتو سـامانی گـەلی

دەدزی و بڕێکـــی زۆریشـــی بەســـەر خـــاوەن قەڵـــەمو ڕۆژنامـــەکان و زمانلووسەکاندا دابەش دەکرد. گەلی بەتالانبراویش نەیدەتوانی دەنگ هەڵبڕێ چونکە ئەوانەی بەناوی فاروقەوە دەدوان هەڕەشەیان لێدەکردن. ئەو کەسانەشی فاروقیان لەسەر عەرش لابرد پاشان لەدیدی ئەو گەلەوە بوون بە پاڵەوانی مێژوو، بەرلەوەش لەژێر هەڕەشەی لەسێدارەداندا بوون.

لەهەموو سەردەمێکدا مێژوو بەو شێوەیە بووە، لەولایەنەوە هیچ جیاوازیەك نییە لەنێوان سەردەمی زێڕین و سەردەمی (خەڵوزین) هەر کاتێك و لەهەر سەردەمێکدا مێژووی یەکێك لەپادشاو فەرمانڕەواکانم دەخوێندەوە دەمگوت: دەبێت دادپەروەریەکەی چەند کەسی گرتبێتەوە؟ دەگەیشـتمە ئـەو ڕاسـتیەی کـە تەنـها هونـەر زانـانی زمـانلووس و هونەرمەندانی سەماو گۆرانی سوودیان لەو دادپەروەریەی وەرگرتووەو ڕەشو ڕوتانی ولاتیش بێبەش کراون. هەموو سەردەمێکی مێژوو زێڕینییە بۆ ئەو کەسانەی چێژ وەردەگرن و خەڵوزیشە بۆ ئەوانەی ئازار دەچێژن.

لۆژیکی نوێ دان بە بوونی خێری ڕەهاو دادپەروەری ڕەهادا نانێت، هەموو کەسێك لە ڕوانگەی خۆیەوە، یاخود لەڕێگەی چوار چێوە فیکریەکەیەوە بۆ خێر، یاخود دادپەروەری دەڕوانێ هەر کەسێکیش بانگەشـەی خـێرو دادپـەروەری ڕەهـای کـرد دڵنیابـە دەیـەوێت هەڵتبخەڵەتێنێ و فێڵت لێبکات.. ئەو کەسانەی دەیانەوێت لەزانستو ئەدەبدا داهێنەربن پێویستە خۆیان لەورێگەیە بەدوور بگرن.. جێگەی داخێکی زۆرە ئەو ئەدەبەی لە خوێندنگاکانماندا دەخوێنرێت لێوانلێوە لەڕێڕەوی ئورستوکراتیانە، بەلام لە جیهانی شارستانیەت وپێشکەوتندا

دەبینین ئەدەبی (هۆگۆو تولستۆی و ڤۆڵتێرو دستوفسکی و بەرناردشۆ) دەخوێنرێت ئەو ئەدەبەی ڕەنگدانەوەی ئازارەکانی چەوساندنەوەو هەژارەکانی جیهانە. کاتێك شاکارە ئەدەبیەکانی ڕۆژئاوا دەخرێنە سەر زمانە جیاجیاکانی دونیا، هیچ بەهایەك لەدەست نادەن، چونکە ئەدەبێکی ئازادەو لەهەموو شوێنێکدا بانگەشەی مرۆڤایەتی دەکەن بەبێ هیچ پێوەندێکی دەروونی، یاخود خۆی بەهیچ کۆمەڵگەو شارستانیەتێکەوە نابەستێتەوە. بۆیە دەبینین لە هەموو دڵێکدا خۆشەویستن و بە هەموو گەلێکیشدا بڵاودەبنەوە.

بۆ نموونە: ئێمە لەهەموو زمانەکاندا چێژ لە ئەدەبی (بەرنادشۆ) وەردەگرین، بەڵام کاتێك بمانەوێت ئەدەبی (بوحتوری) وەربگێڕینە سەر زمانێکی دی لەڕووڕەشی و شەرمەزاری زیاترمان بۆ نامێنێتەوە.

دەڵێن ئەدیبی عەبقەری ئازاری ملیۆنان مرۆڤ لە دەروونیدا ڕەنگ دەداتەوە، ئەو قسەیە زۆر ڕاستەو ئێمەش دەمانەوێت شتێکی بخەینەسەر:

ئازاری ملیونان کەس بەس نییە بۆ ڕەنگدانەوە لە دەروونی عەبقەریەکدا، بەڵکو ئەو ئازارە هەر کەدەچێتە قوڵایی ئەو دەروونەوە دەست دەکات بە پیتاندن و هەڵهێنان و کارلێکردن بۆ ئەوەی لەسەر شێوەو وێنەیەکی جیاواز لەوێنەکەی خۆی بێتە دەرێ. ئەدیبی عەبقەری تەنها بە تۆمارکردنی واقیع قایل نابێت، بەڵکو دەیەوێت کارلێك و ئاوێتە بوون و گونجاندنێك دروست بکات لەنێوان بەشەکانی (واتا) داو لەوێشەوە شاکارە نەمرەکانی بەرهەم دەهێنێت.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوەو ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بابەتی ئەم كتێبەوە هەیە:

**عەبقەریەت چیە؟**

وەڵامی ئەو پرسیارە زۆر گرانە، تا ئێستاش لێكۆڵەرەكان لەسەر پێناسەی عەبقەریەت ناكۆكن و جیاوازیەكی زۆریشیان لەنێواندایە. هەر یەكەیان لێكدانەوەیەكی بۆ دەكات و كەم تا زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی دیدا.

بەڵام زۆربەی ئەو كەسانەی لەو بابەتەیان كۆڵیوەتەوە لەیەك خاڵدا یەك دەگرنەوە كە هاوشێوەییەك هەیە لە نێوان دەركەوتەكانی عەبقەریەت و شێتیدا.

زاراوەی (عەبقەریەت) لە زمانی عەرەبیدا دەچێتەوە سەر (دۆڵی)[1] (عەبقەر).. كە عەرەبە جاهیلیەكان لەو باوەڕەدابوون پڕی بووە لە جنۆكە... لەزمانی ئینگلیزیشدا وشەی (جینس) هەیە، كە لەوانەیە لەوشەی (جنِّي) عەرەبیەوە وەرگیرابێت. لێكۆڵینەوە نوێیەكانی بواری دەروونناسی دەڵێن: كاتێك مرۆڤێكی عەبقەری بەرهەمێكی بەرز دەخوڵقێنێ لەو ئانوساتەداهەست بە خودی خۆی ناكات.. ئەو دەكەوێتە حاڵەتێكی تایبەتیەوە كە هاوشێوەی فەنابوون، یاخود لە هۆشخۆچوونە. هەندێكی دی لە لێكۆڵەرەكان دەڵێن: كەسی عەبقەری لەحاڵەتی ناهەستیدا كەسیەتیەكی تری هەیە، كە جیاوازە لە كەسیەتیە ئاساییەكەی خۆی، كاتێكیش لە بابەتەكەی دەبێتەوە دەگەڕێتەوە حاڵەتی ئاسایی خۆیو سەری سووڕدەمێنێ لەبەرزیو باڵای ئەو

[1] وادي.

بەرهەمەی کە نوسیوویەتی، یاخود دایهێناوە.. لەخۆی دەپرسێت چۆن توانیویەتی ئەو بابەتە بەرهەم بهێنێ؟..

کیتس: ئەدیبی ناسراوی ئینگلیز دەڵێت: لەکاتی نووسیندا هەست دەکەم لە ناوەوەدا یەکێکی ترم، هەتا لە نووسینەکەشم نەبمەوە هەست بە بەرزی و جوانی ئەو بیرو بۆچوونانە ناکەم کە نووسیومن.

بەهەرحاڵ لە بەشی داهاتووی ئەم کتێبەدا لەو بابەتە دەدوێین بەڵام ئەوەی مەبەستمانە خوێنەر بیزانێت "(عەبقەریەت) دەرچوونە لە خود، و چوونە ناوەوەی جیهانێکی ترە" کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ڕەهەندەکانی نازانین و هەندێك جار بەجۆرێك لە جۆرەکانی شێتی لە قەڵەم دەدرێت. چونکە لە حاڵەتی ئاساییەوە دەگوێزرێتەوە بۆ حاڵەتێکی تایبەتی و لەوێشەوە بە دوربینێکی وردەوە دەڕوانێتە ژیان کە هیچ مرۆڤێك لەوەوبەر پێی نەگەیشتووە.

ئەو کەسەشی پابەندی چوار چێوە فیکریەکەی خۆیەتیو لەسەر بنەماکانی پێکهاتە کۆمەڵایەتی و شارستانیەکانی ڕاهاتووە زۆر زەحمەتە ببێتە تاکێکی عەبقەری. هەروەکو لەمەو بەر گوتمان چوارچێوە فیکریەکان لە گرێ دەروونی و دابو نەریتە کۆمەڵایەتیو بەها شارستانیەکان پێك هاتووە.. ئەوانەش لە ڕێگەی داهێنانێکی ئازاددا دەبنە بەربەستێکی پتەو.

زۆربەی جارەکان کەسی عەبقەری پێکەنینی بەخودی خۆیو کۆمەڵ و دەوروپشتەکەشی دێت و هەندێك جاریش لەهیچ شتێك شەرم ناکات.. ئەو لەسەرجەم پێوەندەکان ڕزگاری بووەو بە ئاسماندا دەفڕێت و ئەو شتانە دەبینێ کە خەڵکی ئاسایی نایبینن..

هـێزە دەروونیـە نائاسـاییەکان لــە قولاٚیــی دەروونــی عەبقەریــەوە هـەڵدەقوڵێن، هـەڵقوڵینێکی ئازاد... ئەو شتەش عەبقەریـەکان دروسـتی دەکەن توند ڕەوو دووڕوو چاولێکەران ناتوانن بەرهەمی بهێنن.

سێ کەس لە گەورە فەیلەسوفەکانی ڕۆژکاری ئەمڕۆ لـە عەبقەریـەت یان کۆڵیوەتەوەو گەیشتوونەتە ئەنجامێك، تا ڕادەیەك لە یەکدی نزیکن:

((عەبقەریـەت دەرچوونـە لـەخودو ڕۆچوونـە بـۆ قولاٚیـی جیـهانێکی بەرزو بالاٚو فراوانتر)).

ئەو فەیلەسوفانەش: (شوبنهاوەری ئەڵمانی و برجسۆنی فەرەنسی و توینبی ئینگلیزی)ن.

شوبنهاوەر لەو باوەڕەدایـە: عەبقـەری لەیـەك خاڵدا جیاوازی هەیـە لەگەڵ کەسێکی ئاساییدا. ئەویش (کەم خۆبەستنەوەیە بەو پێوەندانـەی کۆمەلاٚنی خەڵکی پەیوەست کردووە لەپێناو ژیان و ململانێی مانـەوەدا). بەلای شوبنهاوەرەوە: ئیرادەی ژیان پاڵنەری سەرەکییە بۆ ئەوەی تاکێکی ئاسـایی ڕووەو کـارو بیرە جـۆراو جۆرەکـان ببـات.. بۆیـە لەڕێگـەی ئـەو ئیرادەیـەوە دەڕوانێتـە بابەتـەکان. بـەلاٚم کەسـی عەبقــەری لــەوە بــەرزو بالاٚترەو هەوڵدەدات ژیان لەسەر بنەمایەکی بابەتی تەواوەوە بناسێت.

شـوبنهاوەر دەڵێـت: عەبقەریـەت لـە فیکــردا کــارێکی بابەتیانــەی تــەواوە.. ئـەو هێزەیـە وا لـە خاوەنەکـەی دەکـات بـەرژەوەندیو ئـارەزوو ئامانجو کەسیەتی خۆی لەپێناو مەعریفەو تێڕوانین و ڕامان لەگەردوون پشتگوێدەخات. بەپێچەوانەی خەڵکانی ئاساییەوە، چونکە مەعریفە لای ئەو خەڵکە ئاساییە دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئیرادەی ژیانـەوەو بەدوای بەرژەوەندی تایبـەتی خۆیـدا هـەنگاو دەنێت.. بـەلاٚم لای کەسـی عەبقـەری

مەعریفە ژیان ئاراستە دەکات... هەروەها شوبنهاوەر دەڵێت: ئەوەش تاکە هۆکارێکە بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵك لە عەبقەری تێنەگەن و ئەویش لەوان تێنەگات. ئەو لەکاتی ڕۆیشتنندا لە ئاسمان دەڕوانێت و دەکەوێتە چاڵەوە.. بە بۆچوونی شوبنهاوەر مرۆڤ هەرچەندێك کۆمەڵایەتی تر بێت، ئەوەندە لەعەبقەریەت دوور دەکەوێتەوە.. بەلای شوبنهاوەرەوە ژن خاوەنی توانایەکی گەورەیە، بەڵام ناتوانێت ببێتە کەسێکی عەبقەری، چونکە ناتوانێت لەخودی خۆی بچێتە دەرەوە، ئەو لەڕێگەی سۆزو ئارەزووەکانیەوە دەڕوانێتە بابەتەکان.

برجسون دەڵێت: مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی بەلای کۆمەڵەکەی خۆیدا دەشکێتەوە.. بەڵام عەبقەری خۆی بە موڵکی سەرجەم مرۆڤایەتی دەزانێت و سنووری ئەو کۆمەڵە دەبەزێنێت کەتێیدا گەورە بووەو بەگژ ئەو داب و نەریتانەشدا دەچێتەوە کە ئەو کۆمەڵگەیەی لەسەر دروست بووە.. ئەو بەزمانی خۆشەویستیەوە دەدوێت.

برجسون لەو باوەڕەدایە: عەبقەری سروشتێکی سۆفیگەرانەی هەیە، لەوکاتەدا دەچێتە ساتەوەختی داهێنانەکانەوە لە هەستەوەرەکانی دەچێتە دەرەوەو هەروەکو سۆفیەکان دەگاتە حاڵەتی بورانەوەو لەسەرخۆ چوونەوە.. ئەو لەو کاتانەدا لەگەڵ ئەو پاڵنەرە بزوێنەرانەدایە کە گەردوون دەجوڵێنێ.

(توینبی)یش لەو خاڵەدا وەکو برجسون بیر دەکاتەوە و دەڵێت: عەبقەریەت هۆکاری پێشکەوتنی شارستانیەتەکانی مرۆڤایەتییە. لەڕوانینی (توینبی)یەوە کەسێکی ئاسایی موحافیزکارێکی چەق بەستووەو خۆی پێوەندی دابو نەریتە بۆ ماوەییەکان دەکات بەڵام

عەبقەری لەو باوەڕەدایە، ئەو هەڵگریو گەیەنەری پەیامێکە، زۆربەی جارەکانیش حەز دەکات لە گەیاندنی ئەو پەیامەیدا ببێتە قوربانی و وەکو عاشقێکی گڕگرتوو هەنگاو دەنێتو لەپەیامەکەی زیاتر لە دونیادا هیچ شتێکی تر نابینێت.

توینبی لەوباوەڕەدایە کۆمەلانی خەڵك لە بنەمای سروشت و بیرکردنەوەیاندا هاوشێوەن، لە هەر شوێنێکدا بژین، شارستانیبن یاخود بیابانشین بن. بەگوێرەی ئەو گوتەیەی توینبی پیاوێکی سەرجادەی ئەوروپی لە سروشتی بیرکردنەوەیدا هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ پیاوێکی سەرجادەی ئەفریقیاو ئاسیا. هەردووکیان باوەڕیان بە خورافات هەیەو خۆشباوەڕن. جیاوازی نێوان مەدەنیەت و ژیانی سەرەتایی لەزۆربونی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی عەبقەریەکاندایە.. مەدەنیەت بوار بۆ عەبقەری دەڕەخسێنێ هەرچی شتێك ئارەزوو دەکات بیڵێو لەهەموو بوارەکاندا داهێنان بکات.. بەلام لە کۆمەڵگەی مرۆڤە سەرەتاییو دواکەوتوەکاندا هەر کەسێك لە بوارێکدا داهێنەر بێت کە لەوەوبەر نەیانبینیبێ و نەیانناسیبێ بەدرۆی دەخەنەوەو نکوڵی لە داهێنانەکەی دەکەنو دەکەونە گاڵتە پێکردنو ئازاردانی.

لەدیدی (توینبی) یەوە مەدەنیەکان ڕێز لە داهێنەر و عەبقەرەیەکان دەگرن.. بەلام دواکەوتووەکان ڕووەو ژیانی موحافیزکارانەو چاولێکەری دەڕۆن.. ئەو جیاوازیەش لەرێڕەوی رێزدایە نەك جۆرەکەی، و رووەو جیاوازیەکی گەورەتری شارستانیەت دەیانبات.

# کورتەی بەشی یەکەم

عەقڵی مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاسایی سروشتێکی لایەنگری هەیە، کەسێکی ئاساییش هەرچەندێك هەوڵبدات ناتوانێت خۆی لە بیرەکانی دەرباز بکات، چونکە ئەو پێوەندانەی بیری پەیوەست کردووە رۆچوەتە قولایی عەقڵی ناوەوەی. عەبقەریش تەنها مرۆڤێکە دەتوانێت خۆی لەو پێوەندانە دەرباز بکات و بەئاسمانی داهێنان و دۆزینەوەدا بفڕێت.

لەسەر ڕووی زەویدا مرۆڤێك نیە توانیبێتی بەشێوەیەکی تەواو خۆی لە پێوەندو چوارچێوە فیکریەکانی دەرباز بکات.. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین : هەرچەندێك عەقڵ لە چوارچێوە فیکریەکانی ڕزگاری بوو، ئەوەندە تواناکانی لە بواری داهێناندا فراوانتر و گەورەتر دەبێت.

کەواتە : عەبقەریەکان بەگوێرەی ڕێژەی ڕزگاربونیان (زۆر یا کەم) لە چوارچێوە فیکریەکانیان خاوەنی داهێنانن. دەربازبوونی ڕەها مەحاڵە، هەروەکو عەبقەریەتی ڕەهاش مەحاڵە.

# بەشی دووەم
# لۆژیکی ئەرستۆتالیسی

زۆربەی زۆری خوێندەوارەکانمان هەر کە دەمیانکردەوە باس لە لۆژیك دەکەن، هەرچەندە ئەو بەڕێزانە شتێك دەربارەی ماهیەتی لۆژیك نازانن... بەقسەی یەکێك دەڵێن لۆژیکییەو بەیەکێکی دی دەڵێن چەند نالۆژیکییە. ئەگەر پرسیاریان لێبکەی بۆچی؟ ڕویان وەردەگێڕن‌و بەبێ وەڵام جێت دەهێڵن.

سەبارەت بەپێناسەی لۆژیك، واناسراوە: زانستی ئەو یاسایانەیە زیهن لەهەڵەی بیرکردنەوە دەپارێزێت.. هەندێك جاریش بە تەرازوو ناوی دەبرێت، بەو پێوانگەی بیرەکانی مرۆڤی پێ‌دەپێورێت‌و ڕاست‌و هەڵەی پێ لەیەکدی جیادەکرێتەوە لەمەوبەر مرۆڤ تەنها یەك لۆژیکێکی ناسیوە، ئەویش لۆژیکی ئەرستۆتالیسە لەو باوەڕەشدا بوون هەمیشە نەمرەو هەرگیز گۆڕانکاری‌و لەبری دانان لەخۆ ناگرێت.

(کانت) دەڵێت: ((لەڕۆژگارەکانی ئەرستۆوە لۆژیك هەنگاوێك نەچۆتە پێش‌و هەنگاوێکیش نەهاتۆتە دواوە، هەروەکو ئەو شتەی هەبووە تەواوکەرێکی کامڵ بێت)).

بیریارە عەرەبەکانیش ئەو لۆژیکەیان وەرگرتووەو بەشێوەیەك لە خۆبایی‌بوون هەندێکیان ئەوەندە توند بوون لە بەرزی‌و جوانیدا هاوشانی گوتەی خواو بەتەواوکەری قورئانیان چواندووە.

لــەڕۆژگاری ئــەمڕۆشماندا ئــەو لۆژیکــە لەزۆربــەی خوێندنگــەو زانکۆکانماندا دەخوێنرێت و بە تەواوکەری کۆمەڵە زانستە بنەڕەتیەکان دەژمێردرێت کە پێویستە پیـاوانی ئـایین بـیزانن بـۆ ئـەوەی لـە گوتـارو مشتومڕەکانیاندا بەکاری بهێنن دژی رکابەرەکانیان.

ئەو لۆژیکە ڕۆچووەتە قولایی عەقڵمانەوەو بەشێوەیەکی ناهەستی کەوتوینەتـە ژێـر کاریگەرێتیـەوە... زۆر لـە ئێمـە لـەژیانیدا بنـەماکانی لۆژیکی نەخوێندووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمان ئەو ڕێڕەو و بیرکردنەوانە دەیجوڵێنـێ کـە لۆژیکـی ئەرسـتۆ تـالیس داوای دەکـات. ئـەویش لـە ئەنجامی کاریگـەرێتی ئـاو و هـەوای فیکـری گشـتیەوە لەسـەر زیـهنمان، بەرێژەیەکی دیاریکراو دێتە بەرهەم. ئێمـە هـەر لـە منالْیمانـەوە دەبینـین گـەورەکان مشـتومڕ دەکـەن و دەنووسـن و دەخوێننـەوە، ئـەو ژێیـەی گەورەکانمان ئاوازی لەسەر دەژەنن لەعـەقڵی ناوەوەمـاندا تۆمـار دەبێـت و بە درێژایـی ژیانمـان لـەژێر کاریگـەرێتی ئـەو ژێیـەدا دەبـین جـا هەسـتی پێبکەین یاخود هەستی پێنەکەین.

هەر ئەو میحوەرەشە لۆژیکی ئەرستۆیی بە دەوریـدا دەسوڕێتەوەو پێی دەگوترێت: (پێوەر syllogism) . ئەو پێـوەرەش زنجیرە بەندێکی یەك لەدوای یەکە لە زانراوە وە بۆ نەزانراو، یاخود هـەروەکو لۆژیکیـەکان دەڵێن: لە پێشەکیەکانەوە بۆ ئامانجەکان، بەگوێرەی بنەما، یاخود ئـەو پێوەرەی داڕێژراوە. ئەوان لە گوتەیەکی بەناوبانگی کۆندا دەڵێن: (هەموو مرۆڤێك لەناو دەچێت، کەواتە سوکراتیش لەناو دەچێت). ئـەو ڕێڕەوە لەبیرکردنـەوەدا هـەر ئـەو سروشـتەیە کـە لۆژیکـی ئەرستۆیی پێناسـراوە.. هەر ئەویشە لەزۆربەی مشتومڕو گفتوگۆکاندا بالاْ دەستە. بەشێوەیەکی

لەڕادەبەدەریش لە ناوەندە ئاینیەکانماندا بڵاوبۆتەوە. تۆ کاتێك لەگەڵ یەکێکدا دەکەویتە گفتوگۆیەکەوە هەر ئەوەندە دەزانی ئەو پێوەرە لۆژیکیە یەکلا کەرەوەیە دەدات بەنێو چاوانتدا.

گەورەترین گیروگرفتەکانی لۆژیکی ئەرستۆ ئەوەیە کە واقیعی ژیان لە خۆ ناگرێت و دەتوانین ناوی بنێین لۆژیکی (بورجی عاج).. ئەگەر لە مێژووی ئەو لۆژیکە بکۆڵینەوەو ئەو بارودۆخە فیکریو کۆمەڵایەتیانە هەڵسەنگێنین کە لەسەری دروست بوون دەگەینە ئەو ڕاستیەی ئەو ناولێنانە ڕاستو درووستە.

لەسەر دەمی ئەغریقیەکاندا دەستەیەك لە مامۆستا گەڕۆکەکان سەریانهەڵدا، کە پێیان دەگوترا (سۆفستاییەکان). بە واتای (حەکیمەکان)... ئەو دەستەیە ناوبانگیان بەوە دەرکردبوو کە خەڵکی فێری هونەری قسەکردن دەکەن. لە وکاتەدا هونەری قسەکردن ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو، چونکە دەسەڵاتی ئەغریقیەکان نیمچە دیموکراتیەکی تێدا بوو، هەموو تاکێك پێویستی بە باڵا دەستی هەبوو لە قەناعەت پێکردنی کۆمەڵانی خەڵکدا.. سۆفستاییەکان فەلسەفەیەکیان هێنایە گۆڕێ کە ناوەڕۆکەکەی دەڵێت: ((حەقیقەت رەها نییەو ڕێژەییە، تاقە پێوەری حەقیقەتیش مرۆڤە بە سەرجەم بەرژەوەندی و ئارەزوو وشەهوەتەکانیەوە)).

سۆفستاییەکان بەکرێیەکی دیاریکراو خەڵکیان فێری هونەری قەناعەتپێکردن و بەڵگە هێنانەوە دەکرد. ئەگەر مرۆڤ [بەگوێرەی بانگەشەی ئەوان] سەرچاوەی حەقیەقەت بێت و حەقیقەتیش بەگوێرەی بەرژەوەندی و ئارەزووی ئەو مرۆڤە لە گۆڕاندا بێت، ئەوا پێویستە

هەموو مرۆڤێك هونەری قەناعەتپێکردنی هەبێت بۆ ئەوەی خەڵکانی دی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت لەکاتی مشتومڕو ڕکابەری و گفتۆگۆکاندا.. یاخود کاریگەرێتی هەبێت لەسەر دادوەرەکان بۆ دەرچواندنی بڕیارێك لەگەڵ بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی ئەودا بگونجێت.

سوفستاییەکان لە فەلسەفەکەیاندا سەرکەوتنێکی گەورەیان وەدەستهێناو موشتەریەکی زۆرو پارەیەکی چاکیان دەستکەوت. بەهەموو وڵات دا ناوبانگی فەلسەفەکەیان بڵاوبوەوە، تا لە کۆتاییدا پیاوێکی پۆڵایین و بلیمەتیان لێ‌پەیدا بوو.. لەوانەیە ئەو پیاوەش لە پلەی پێغەمبەرەکاندا بووبێت. ململانێ و رکابەریەکی بەهێزی فەلسەفەکەیانی کەوتە ئەستۆ و کۆتایی پێهێنان..

ئەو پیاوەش ناوی سوکرات بوو. دەڵێن سوکراتیش لەسەرەتاوە سۆفستایی بووە، بەڵام لێیان جیابوتەوەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد سروشێکی بۆ هاتۆتە خوارەوەو پەیامێکی پیرۆزی پێ سپێردراوە بۆ ڕزگارکردنی جیهان لەشەڕی فەلسەفەی سۆفستایی.

سوکرات بەردەوام بە شەقام و بازاڕەکاندا دەسوڕایەوەو خەباتی دەکردو تێدەکۆشا بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی تا لە کۆتاییدا گەیشتە ئەوەی حوکمی مردنیان بەسەردا سەپاند. (چیرۆکی سوکرات لە مێژوودا دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەیە) دوای سوکرات یەکێك لەقوتابیەکانی کە ناوی ئەفلاتون بوو جێگەی گرتەوە و هەوڵی دەدا پەیامی مامۆستاکەی تەواو بکات.. ئەفلاتوون لە بازاڕو شەقامەکانەوە گواستیەوە ژووری وانە گوتنەوەو، لە گفتوگۆی سەرزارەکیەوە بۆ لاپەڕەکانی کتێب. دوای مردنی ئەفلاتونیش دروشمی فەلسەفە نوێیەکە

گەیشتە ئەرستۆتالیس، کە لەوەو دوا نازناوی (مامۆستای یەکەم)ی پێبەخشرا...

ئەرستۆ گرنگیو کاریگەرییەکی گەورەو بێوێنەی هەبووە لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا. ئەرستۆ ئەو لۆژیکە ناسراوەی دارِشت کە بەناوی خۆیەوە ناونراو هەر خۆشی خستیە چوارچێوە کۆتاییەکەیەوە.

ئەو لۆژیکەی ئەرستۆ لێدانێکی بەهێزبوو بۆ بزوتنەوەی سۆفستاییەکان و سەرکەوتنێکی گەورەی یەکلاکەرەوەش بوو بۆ ئەو فەلسەفەیەی برِوای بەحەقیقەتی رِەهاو توانای عەقلی مرۆڤ هەیە لە دۆزینەوەو تێرِوانین و رِامان لە شتەکان. سۆفستاییەکان لە بەرامبەر ئەو فەلسەفە نوێیەدا تێکشکاندنێکی ئەوتۆیان بە خۆیانەوە بینیو رِیزەکانیان بەشێوەیەك لێك ترازا شتێك نەما بەناوی فەلسەفەی سوفستاییەکان.. لۆژیکی ئەرستۆ سەرکەوتنێکی یەکجارەکی و یەکلاکەرەوەی وەدستهێناو کۆمەلانی خەڵکیش لە هەموو لایەکەوە بەرەورِووی دەچوون، کار گەیشتە ئەو رادەیەی دەستەواژەی سەفسەتە، یاخود سوفستایی بوو بە لەکەیەك و هیچ بیریارێك هیوای نەدەخواست ئەو ناوەی لێبنرێت.

هەروەکو (مانهایم) دەڵێت: حەقیقەت لەیەك کاتدا رِێژەیی و رەهاشە، یاخود بەواتایەکی دی: لەیەك کاتدا خودیو بابەتیشە. بەلام سەرکەوتنی لۆژیکی وای لەبیریارەکان کرد تەنها لایەنێکی حەقیقەت ببینن، ئەویش لایەنی (رەها)ییەکەیەتی.

بەو شێوەیەش لایەنەکەی دیکەیان پشتگوێخست کە گرنگی و رادەی سودمەندێتی لەوی تریان کەمتر نەبووە. دەتوانین بڵێین لۆژیکی

ئەرستۆ هۆکارێکی بەهێزبوو بۆ دابڕانی بیریارەکان و گۆشە گیرییان لە تێکڕای خەڵکی ئاسایی.. لەلایەنی بیرکردنەوەشەوە کۆمەڵانی خەڵکی بە سەر دوو چیندا دابەشکرد: چینێك روەو (بورجی عاج) هەڵکشان و چێژیان لە تێڕامانی حەقیقەتی موجەڕەد دەبینی. چینێکی دیش لەگەڵ ڕێژەی ژیاندا و بەگوێرەی حەقیقەتە گۆڕاوەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆیان دەگونجان.. لەژێر کاریگەرێتی ئەو لۆژیکەدا پیاوانی بیر، رقیان لە پیاوانی (کار) دەبوەوەو هێرشیان دەکردنە سەر شێوازی ژیان و بیرکردنەوەشیان.. لە لۆژیکی ئەرستۆدا پیاوی بیر بە هەورەکاندا هەڵدەگەڕێو لەوێدا کۆشك و تەلار دروست دەکات. هیچ شتێك لە گیروگرفتەکانی ژیان نازانێت و نایەوێت بیریشی لێبکاتەوە. هەموو ئەو کارانە بەشتێکی کاتی دەزانێت و پێی وایە هیچ پەیوەندییەکیان بە حەقیقەتی ڕەهاوە نییەو لەگەڵ سروشتی بیرکردنەوەی ڕاست و دروستدا ناگونجێن.

ئەو کەسەی مێژووی زانستە جۆراوجۆرەکان بخوێنێتەوە توشی سەرسوڕمان دەبێت کاتێك دەبینێ زانستی کۆمەڵناسی ماوەیەکی زۆر دوای زانستە سروشتیەکانی دی هاتۆتە ئاراوە. گرنگترین و کاریگەرترین هۆکارەکانی دواکەوتنو سەرهەڵنەدانی زانستی کۆمەڵناسی بڵاوبوونەوەی لۆژیکی ئەرستۆیە. کە گرنگی بە حەقیقەتە ڕەهاکان دەدات و حەقیقەتە ڕێژەییەکانیشی پشتگوێخستووە... زانستە کۆمەڵایەتیەکان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان بخزێنە واقیعی گۆڕاوی کۆمەڵایەتیو پەردە لەسەر یاساکانی هەڵبدەنەوە. بەڵام پیاوانی لۆژیك ئەو دابەزینو داخزینە بەشیاوی پیاوانی فیکر نازانن.. بیریار لەدیدی

ئەوانەوە زۆر بەرزو بالاَترە لەوەی کاتە بەنرخەکانی لە ئیشوکاری کۆمەلاَنی خەڵك دا بەفیڕۆ بدا.

فەیلەسووفەکانی ئەغریق خاوەنی کۆیلەبوون و پێویستیان بەوە نەبوو بیر لە بژێوی ژیان بکەنەوە و بەدوای پاروەناندا بگەڕێن، ئەو کۆیلانە ڕەنجیان دەداو کاریاندەکردو هەموو پێداویستیەکیان بۆ فەیلەسووفەکانی ئەغریق ئامادە دەکرد... ئەوانیش هەموو کاتیان لە بیرکردنەوەی بوونی (ژیان) دا تەرخاندەکرد. ئەگەر کۆیلەکانیش ئەو کاتەیان بۆ برەخسایەو وەکو سەردارەکانیان بیریان بکردایەتەوە ئەوکاتە لۆژیکێکی تایبەت بە خۆیان دەبوو. کە پێچەوانەی لۆژیکی سەردارەکانیان بێت.

ئێمەش لەوبارەیەوە دەڵێین: لۆژیکی سۆفستاییەکان نزیکتربووە لە تێگەیشتنی ژیانی واقیعی. بیریارو فەیلەسووفە ئەرستۆییەکان رق و کینەیەکی زۆریان بەرامبەر لۆژیکی سۆفستاییەکان هەڵگرتبوو، چونکە سەفسەتە ئەوانی لە بورجە عاجیەکانیان دەهێنایە خوارەوە.. ئەوان دەیانوویست خەڵکی ڕەشوورووت لەبیرو زاراوەکانیان تێنەگەن، هەر بۆیەش دژایەتیەکی زۆری سۆفستاییەکانیان دەکرد.. فەیلەسووفە موسڵمانەکانیش لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەسەر هەمان ژێ کاریان دەکرد. ئەوان وەکو هاوڕێ ئەغریقیەکانیان خاوەنی کۆیلە نەبوون، بەلاَم بەگوێرەیئەو بارودۆخەی تێیدا دەژیان لۆژیکی ئەرستۆیان خۆشدەویست. زۆربەی جارەکان فەیلەسووفە موسوڵمانەکان نامەیان بۆ میرو سوڵتانەکان دەنووسی و داوای دیاریان لێدەکردن. بەو شێوەیەو

بەبێ ئەوەی هەست بکەن بە گوێرەی لۆژیکی خاوەن کۆیلەکان بیریان دەکردەوە.

ئەو فەیلەسووفانە لە کۆمەڵانی خەڵك بێزار بوون و بێزیان لە عەقڵیەت و عەقیدەکەیان دەبووەوە. توندڕەویان گەیشتە ئەو ڕادەیەی یەکێکیان پێشنیاری بۆ هاوڕێ فەیلەسووفەکانی کرد ئەم جیهانە جێبهێڵن و ڕوبکەنە جیهانێکی تایبەت بە خۆیان، بۆ ئەوەی لە ئاوو هەوایەکی خاڵیدا حەقیقەتە نوێیەکانی گەردوون تاوتوێ بکەن.. ئەوەیان لەیاد کردبوو ئەو جیهانەی ئەوان لێی بێزارن، جیهانێکی ڕاستەقینەیەو، ئەو جیهانە میسالیەش ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن بوونی نییەو لە واقیعدا جیهانی وەهم و خەیاڵە.

تاقە بیریارێك لە ئیسلامدا ڕوبەڕووی ئەو جۆرە بیرکردنەوە میسالیە بووبێتەوە ئیبن خەلدون بوو. ئەو فەیلەسووفە عەبقەریە هەوڵی دەدا هەرەس بە لۆژیکی ئەرستۆیی بهێنێ و لە جێگەکەیدا لۆژیکێکی نوێ بێنێتە کایەوە کە پشتئەستووری واقیعە کۆمەڵایەتیە گۆڕاوەکە بێت. لەو کاتو سەردەمەدا بیریارەکانی دی لە ئیبن خەلدون نە دەگەیشتن.. لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا ئیبن خەلدون هیچ جۆرە گرنگیەکی پێنەدرا. ئەگەر لەم دواییانەو لەوڵاتانی ڕۆژئاواداو بەهۆی چەند هەوا داریەکیەوە نەبوایە هیچ کەسێك ئیبن خەلدون و بیرو بۆچوونە فەلسەفیەکانی نەدەناسی.

هەروەکو لەمەوبەر ئاماژەمان پێدا ئێمە تا ئێستاش لەژێر کاریگەرێتی لۆژیکی ئەرستۆییداین، کاریگەرێتیەکی گەورەو لەڕادەبەردەر. هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش لە ڕوانگەی گۆتەو یاساکانیەوە دەڕوانینە بابەتو ڕووداوەکان.

هەندێك جار لۆژیكی ئەرستۆیی بە لۆژیكی فۆتۆگرافی وەسف دەكرێت ئەوەش كاتێك بەراورد دەكرێت لەگەڵ ئەو لۆژیكە نوێیەی پێی دەگوترێت لۆژیكی سینەمایی لۆژیكی ئەرستۆ دەیەوێت وێنەیەكی جێگیرو رەهای بابەتەكان بگرێت و بە وێنەیەكی كۆتایشی دادەنێت. بەلاَم ژیان لە جوڵەیەكی بەردەوامدایەو فۆتۆگرافیش لە حەقیقەتەكەیدا تەنها ساتەوەختێكی ڕابردەیە، لۆژیكیەكانی لەمەوبەر بە خێر یاخود شەڕ حوكمیان بەسەر شتەكاندا دەدا. بێئاگابوون لەوەی لەوانەیە ئەو شتە لە سروشتەكەیدا و دوای ئەو بڕیارەی ئەوان گۆڕانكاری بەسەردا بێت. خێر ببێ بەشەڕو شەڕیش ببێ بەخێر. چارەڕەشیش بۆ ئەو گەلەیە. دەسەلاَتدارەكانی بەو لۆژیكە فەرمانڕەواییان دەكەن.. گەل لە هەوڵو تێكۆشاندا بێت بۆ پەیدا كردنی پارووی ژیان و ئەوانیش لە كۆشكەكانیانەوە حوكمیان بەسەردا بكەن و دەسەلاَتە چەسپاوو یەكلاییەكانیان بەسەردا بسەپێنن.

دەڵێن: ئەو یاسایانەی یاسادانەران دایدەڕێژن ئەگەر بەشێوەیەكی تەواو جێبەجێ بكرێت بە هێزترین هۆكار دەبێت بۆ چەوساندنەوە... ئەو گوتەیەش لە راستیەوە نزیكە، چونكە یاسا بەشێوەیەكی رەها چەسپاو و جێگیرە، بەلاَم واقیعی ژیان لە گۆڕانكاریەكی بەردەوامدایە.. ئەو دەسەلاَتدارە چەند دڵڕەقە كاتێك كاروبارەكان بەپێوەرە یاساییە توندو تیژەكان دەپێوێ و ئاگای لەڕێڕەوی واقیعی كۆمەلاَیەتی نییە.. لەوڵاتی خۆشماندا چەندین لەو دەسەلاَتدارانە دەبینین بەزەیی و سۆز مامەڵە لەگەڵ كۆمەلاَنی خەڵكدا دەكەن زۆربەی جارەكان حوكم بەسەر هەژارێكدا دەسەپێنن. ئەگەر ئەو هەژارە بەهۆی بارودۆخێكی توندو تیژ و

بێڕەحمانەی ژیانەوە هەڵەیەکی کردبێت. هەر بەوەشەوە دەستبەرداری نابن بەڵکو رق و کینەیەکی زۆریشی بەرامبەر دروست دەکەن و بۆ کوێ بچێت چەندین بەربەستی لەڕێدا دروست دەکەن.. ئەگەر تۆش روبەڕویان بوەستیتەوەو شتێکیان لەسەر بڵێی و بنووسی پێت دەڵێن (یاسا پیرۆزەو) ئەمری بەوەکردووە.

لۆژیکی ئەرستۆیی لەیەك کاتدا بۆ گوتاردان و ئاژاوە گێڕانیش بەکاردێت، ئەو گوتار دەرەی لە مینبەرەکانەوە کۆمەڵانی خەڵك لەمەترسیەکان ئاگادار دەکاتەوەو هانیان دەدات، ئەو ئاژاوە چیەش بە دوای نەنگی خەڵکدا دەگەڕێت بەمەبەستی رەخنەلێگرتنیان ..هەردووکیان لۆژیکی ئەرستۆیی بەکاردەهێنن بۆ خۆپاراستن و هێرشکردن.. ئەو کەسەی هۆگری ئەو لۆژیکەیە گوتار بۆ خەڵکی دەداو لە خۆشی بەدووری دەگرێت.. ئەو لە ڕەوشتی تاکەکان رەخنە دەگرێت و تاوانباریان دەکات کە دژینەیەکی لۆژیکیان لە ناخدایە. بەڵام ئەو دژینەیە لەخۆیدا نابینێت. ئەو هەڵسوکەوتو خوو رەوشتە لەزۆربەی پیاوانی ئاییندا دەبینرێت. ئەو شوێنانەش رێنمایی ئایینیو دابەشکردنی کارە خێرخوازیەکان لە خۆدەگرێت هەمان هەڵسوکەوتیان هەیە.. لەو دەوروبەرانەدا زانستەکانی لۆژیك و رێزمان و فیقە و گۆتە..و هتد دەگوترێنەوە، ئەو زانستانەی پێوەرە لۆژیکیەکان بەکاردەهێننو زیهنی خاوەنەکەی لەسەر ئاژاوە گێڕی و دوژمنکاری ڕادەهێنن.

لەو ئاوو هەوایەدا دەبینین هەمیشە مشتومڕی توندوتیژ لە ئارادایە، دەوروبەرەکەش چاودێری مشتومڕەکان دەکەن تا بزانن کامیان توندوتیژترە و پتر دەنگ هەڵدەبڕێتو زمانی درێژ دەکات. لە ئەنجامدا

دوو فاقیزمیەك لە کەسیەتی دەوروبەرەکەدا دروست دەکات. هەموو تاکێکی ئەو دەوروبەرە دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئەو ئاوو هەوا فیکریەوە. بۆیە ئارەزووی بەلای مشتومڕەکەدا دەشکێتەوە و هەوڵدەدات ئەویش لە مشتومڕی رکابەریدا بە هەر شێوەیەك بێت سەرکەوتن وەدەست بهێنێت.

ئەو تاکە لە حەقیقەتدا سەفستایی و لە لۆژیکدا دەبێتە ئەرستۆتالیسی ئەو لە عەقڵی ناوەوەیدا حەقیقەتی لە یادکردووەو لە کارەکانیشدا گرنگی دەدات بە سەرکەوتنی، بەڵام لە عەقڵیدا بانگەشەی خۆشویستنی حەقیقەت دەکات و دەیەوێت پێی بگات. پێوەرە لۆژیکیەکان لە خزمەتی سۆزەکانیدا بەکار دەهێنێت. بۆ نموونە: ئەگەر رقی لەیەکێك بێت و ببینێ ئەو کەسە پێدەکەنێت. بەو لۆژیکەی لەسەری راهاتووە دەڵێت: ((پێکەنینی بەبێ هۆ نیشانەی بێ ئەدەبیە، فلانەکەس بەبێ هۆ پێدەکەنێت، کەواتە ئەو بێئەدەبە)).

لەوانەیە تەنها بەو بڕیاری (بێئەدەب) کردنەی بەرامبەرەکەی دڵی ئاو نەخواتەوە، بۆیە پەنا دەباتە بەر دەستدرێژیەکی دیو پێوەرێکی لۆژیکی نوێی بۆ دروست دەکات و دەڵێت:

((بێئەدەبی زیان بە ئایین دەگەیەنێت، هەموو زیانبەخشێکیش بۆ ئایین پێویستە دژایەتی بکرێت، کەواتە پێویستە دژایەتی فلانە کەس بکرێت)).. بەپشتبەستن بەو پێوەرە، زمانی درێژدەکات و جنێو دەدات، ئامادەشە توندترین سزای بەرامبەرەکەی بدات، ویژدانیشی مردووە چونکە بەڵگەو بیانووە لۆژیکیەکانی هانی دەدەن بۆ ئەو هەنگاوەی.

**کەواتـە:** پێـوەرە لۆژیکیـەکان چەکێکی کاریگـەرن بەدەست مرۆڤـەوە تـا لەڕێگەیـەوە ئـەو شـتەی دەیـەوێت و ئـارەزوی دەکـات بـەکاری بهێنێت.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە پێوەری لۆژیکی ئەو چەکەیە لەلایەن هەموو (بەرە، تیپ، دەستە، تاقمێکەوە) بەکاردەهێنرێت و دەیکات بە پاڵپشـتێك بـۆ بیروبۆچوونـەکانی. لەهـەمان کـاتدا دژی بـیرو بۆچوونـە پێچەوانەکانیش بەکاری دەهێنێت.

هـەموو دەسـتەو تاقمـە ئاینیـەکانیش ئـەو لۆژیکـە بـۆ پشـتیوانی پێڕەوەکانیان بەکار دەهێنن. هەریەکەشیان لەوباوەڕەدایە گەیشتوەتە ئەو حەقیقەتـەی کـە هیـچ گومـانێك لـە خـۆ نـاگرێت. خـۆ ئەگـەر لەبەڵگـەو بیانووەکـانی هـەر دەسـتەو تاقمێکیـان بکۆڵینـەوە دەبینـین بەزنجیرەیـەکی لۆژیکـی بەیەکـەوە بەسـتراونەتەوە. کەواتـە تـۆ لـەو نێوەنـدەدا دەستەوەستانی لەوەی ئایا کام لەو دەستەو کۆمەڵـە ئایینیانـە لەسـەر حەقن.

(تۆماس) ئاماژە بەوە دەکات کە لۆژیکی کۆن، لۆژیکی عـەقیدە بـۆ ماوەییەکانە. نەك لۆژیکی مەعریفەی گەشەکردن. لۆژیکێکە بۆ هێرشکردن و خۆپاراستن بەکاردێت، نەك بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتە نوێیەکان.

ئەوەی جێگـەی سـەرنجە هـەندێك لەوانـەی لەسـەرەتای بەمـەدەنی بوونـی ئیسـلامدا گومانیـان لا دروسـت ببـوو لۆژیکـی کۆنیـان لـە بـۆ چونەکانیاندا پەسەند دەکرد. هەمیشە ئەو گوتەیەیان دووبارە دەکردەوە: ((هەر شتێك بە مشتومڕ بچەسپێت، هەر بەو مشتومڕەش کـەم دەکـات))، بەڵگەو بیانوی ئەو گومانانەش لەم بەیانەیاندا دەردەکەوێت.

((ئێمـه لەسـەرجەم ئـایین و دیـدو بۆچـوون و گوتارەکـاندا دەبینـین هەموویان لە مشتومڕی یەکدیدان، لەوانەیە لە کۆڕو مەجلیسێکدا بەهۆی هـێزی هونـەری قسـەکردنەوە یـەکێکیان سـەربکەوێت و یـەکێکی دی بدۆڕێـت.. ئـەو دووانـە وەکـو ئـەو جەنگاوەرانـەن کـە سـەرکەوتن و ژێرکەوتنیان لـە پێشدایە.. لایـەنێکیان بـەدوای فەلسـەفەدا ڕۆیشـتوون و مەلەوانیان تێداکردووەو گەیشتوونەتە ئەو ڕادەیەی هەڵوێستەیەك لەسەر حەقیقەتەکان بکەن. ئـەوانی دیش زانستی گۆتـەو هونـەری قسـەکردنیان گرتـووەو تێیـدا تواونەتـەوەو شـانازی بـەوەوە دەکـەن ڕێگـەی حـەق و ناحەقیان لەیـەکدی جیاکردۆتـەوە.. هـەردوو لاشـیان (فەلسـەفەو کـەلام) جیاوازیـەکی گـەورە هەیـە لـەنێوانیاندا.. یـان شـوێنکەوتوی ئـەو ئـاوو هەوایـەن کـە لەسـەری دروسـت بـوون، یـاخود شـوێنپێهەڵگری ئـەو ئارەزووانەن کە بە (حەق)ی دەزانن.. ئەگەر سەلماندنەکانیشیان خاوەنی حەقیقەت بوونایـە، بـەو شـێوەیەو بـەدرێژی کـات و سـەردەمەکان ئـەو جیاوازیـەی نێوانیـان دروسـت نـەدەبوو، ئـەو هـەمووەش بانگەشـەی فەسادی سەلماندنەکان و گونجاندنەکانن)).

هـەروەکو گوتمـان لۆژیکـی ئەرسـتۆ بیریارەکـانی لـە واقیعـی ژیـان دابـڕی و ڕووەو کەشـکەڵانی فەلـەك بـەرزی کردنـەوە. کـاتێکیش ئـەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو یاسا فیکریانە بەسەربکەینەوە کە ئەو لۆژیکە لە تیوریەکانیدا پشتی پێدەبەستێت. ئەو یاسایانە بەشێوەیەکی یەکلاکـەرەوە پێچەوانـەی یاسـاکانی واقیعـن. لـە کۆنـدا بیریارەکـان بێئاگابوون لەو دژینەیە. ئەوان دەڵێن: ((کامڵ بوون لە مەعریفەدا دابڕانە لە بەخت)). بەڵام ئـەوان هەستیان بەوە نـەدەکرد کـە هۆکـاری بەدبەختی

تەواو لە مەعریفەدا لەو بیرکردنەوەیەوە هەڵدەقوڵێت کە بەگوێرەی یاسا ئەندێشەییەکانی بیردەکاتەوەو هیچ پەیوەندیەکی بە واقیعی ژیانەوە نییە.

ئیبن خەلدون لەو باوەڕەدایە خەڵکی سادەو ئاسایی لە ژیانیاندا زیاتر سەرکەوتوترن لە بیریارەکان. چونکە خۆیان لەگەڵ واقیعەکەدا دەگونجێنن، بەبێ ئەوەی پەنا ببەنە بەر پێوەرێکی لۆژیکی، یاخود بیرکردنەوەیەکی ڕێکوپێك و نەخشە بۆ داڕێژراو... بەڵام یاسادانەرو لۆژیکیەکان خۆیان ڕاهێناوە لەسەر (چوونە ناو واتاکان و دابڕانیان لە هەستەوەرەکان هەروەها لە قاڵبدانێکی تەواو لە زیهندا. هەمیشە دیدو بۆچوون و روانینەکانیان لە زیهندایەو ناکەوێتە قاڵبی پراکتیك و بەراوردکارییەوە. هەر بۆیە ڕووبەڕوی هەڵەی زۆر دەبنەوە).

بەو گوتەیەی ئیبن خەلدون پێشی زەمانەکەی خۆی کەوتووە، لەدیدی ئەوەوە لۆژیك وێنەیەکی ڕاستەقینەی ژیان نادات بەدەستەوە و ڕێگریشە لەبەردەم سەرکەوتنی خاوەنەکەیدا... مێژوو ئەوەی سەلماندووە کە تێکڕای بیریارە کۆنەکان لە ژیانیاندا سەرکەوتوو بەختەوەر نەبوون، تەنها ئەوانە نەبێت کە میرێك، یاخود دەوڵەمەندێك دەستی گرتوون.

لەم سەردەمەشدا زۆربەی بیریارەکان جەخت لەسەر ئەو بۆچوونەی ئیبن خەلدون دەکەنەوە، لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا یاسای بیرو یاسای واقیع لەیەکدی جیا دەکرێنەوە. هەوڵدەدرێت بۆ هەریەك لەو دووجۆرە ئەو بوارانە دەستنیشان بکرێت کە لە گەڵیاندا دەگونجێت.. سەرنەکەوتوویی لۆژیکە کۆنەکان لە ئەنجامی جیانەکردنەوەی ژیانی بیرو ژیانی واقیعدا بووە.. ئەوان بە عەقڵی خۆیانەوە دەفڕنە ئاسمانی بیرو لاشەکانیشیان

لەسەر زەمینی واقیعدا داوای ژیان و گوزەرانیان لێدەکردن. لە ئەنجامی ئەوەشدا کەسیەتیەکەیان ڕووبەڕووی دووفاقیزمی و کەرتبوون دەبووەوەو لە هەموو بوارێکدا تووشی زیان و رووخان دەهاتن.

لۆژیکە کۆنەکانی مێژوو سێ یاسایان دارشتبوو، بە یاساکانی (بیر) لە قەڵەمیان دەدا. ئەو سێ بنەمایەیان بە بنکەیەکی نەمری ئەوتۆ دەزانی کە هیچ گومانێك لە خۆنەگرێت. ئەگەر لەو سێ یاسایەی لۆژیك بکۆڵینەوە، رادەی ئەو دەلاقە فراوانەمان بۆ دەردەکەوێت کە دەکەوێتە نێوان لۆژیك و واقیعەوە.

**<u>یاسای یەکەم:</u> بە یاسای خۆیەتی ناو دەبرێت:**

بەگوێرەی ئەو یاسایە: هەموو شتێك تەنها خودی خۆیەتی. دەتوانین ئەو یاسایە بە یاسای حەقیقەتی چەسپاو لە قەڵەم بدەین. ناوەڕۆکەکەش بە جێگیریی، یاخود (چەسپاوی بناغەی گەردوونە).

(جون دیوی) ئاماژە بەوە دەکات کە فەیلەسووفەکانی ئەغریق لەو باوەڕەدابوون یەکێك لە مەرجەکانی حەقیقەت ئەوەیە جێگیر و چەسپاو بێت و نەگۆڕێت. ئەگەر گۆڕانکاری بەسەردا هات ئەو کاتە واتای حەقیقەت لەدەست دەدات و دەبێتە وەهم.

لەوانەیە بنەمای ئەو یاسایەیان لەڕوانینیانەوە بووبێت بۆ ماددەی چەق بەستوو و نەگۆڕ. ئەوان کاتێك گەردوونیان بینیوە پڕبووە لە ماددەی چەسپاو و بێجووڵە.. واشیان زانیوە بناغەی گەردوونیش چەسپاوو جێگیرە. بەڵام ئەمڕۆ ئەو بیرە سەرەوخوار هەڵگەڕاوەتەوە. لەم دواییانەدا و لە ئەنجامی زانستی فیزیادا ئەو ڕاستیە چەسپیووە کە ماددە

لەجووڵەیەکی بەردەوامدایە. ئەو هێمنی و چەقبەستوییەی ماددەش کە دەیبینین تەنها لەوەهمی هەستەوەرەکانماندایە.

ئەو بیرو بۆچوونەش لە زانستی فیزیاوە گوێزرایەوە بۆ زانستەکانی دەروونناسی و کۆمەڵایەتی.. ئەمڕۆ چەمکی کۆمەڵگە تێگەیەکی خاوەن جووڵەیە. هەروەها کەسیەتی مرۆڤیش بە جووڵاو دەناسرێت.

بیریارەکانی سەدە بەسەرچووەکان ئەگەر شتێکی جولاویان دیتبا لە هۆکاری جووڵەکەیان دەپرسی. بەڵام بیریارەکانی ئەمڕۆ بەپێچەوانەوە پرسیار لە شتە بێجووڵەو جێگیرو چەسپاوەکان دەکەن. چونکە بەلای ئەمانەوە جووڵە سیفەتێکی بناغەییە لەسەرجەم شتەکاندا.. لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئێمە لەشتە جووڵاوەکان تووشی سەرسوڕمان نابین، بەڵکو کاتێك شتێکی بێجوڵە دەبینین پرسیار لە چەسپاوییەکەی دەکەین.

ئەم چەمکە نوێیە کودەتایەکی گەورەی لە بۆچوونەکانماندا بەرپاکرد بەرامبەر بە ژیان و چۆنیەتی خۆگونجاندن و هەڵسوکەوتەکانمان.

<u>یاسای دووەم:</u> **بە یاسای "نادژینەکان ناودەبرێت" :**

هەموو شتێك لە دیدی ئەو یاسایەوە یان دەبێت حەق، یاخود ناحەق بێت.. هیچ شتێك لەیەك کاتدا حەق و ناحەق نییە. ئەوەش رەهایی حەقیقەت دەگەیەنێت.

لەبەشی رابردووی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بەوەکرد کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا حەقیقەتی رەها بوونی نییە. ئەگەر هەشبێت عەقڵی مرۆڤ

ناتوانێت لـێی تێبگات. چونکە گرێدراوی کۆمەڵێك پێوەندی دەروونی و کۆمەلایەتی و شارستانییە.

(هیگـڵ) ئامـاژە بـەوە دەكـات کـە: ((لێکـدژی)) شـتێکی بناغەییـە لەسروشتی گـەردووندا.. هـەموو شـتێك لـەدیدی هیگڵـەوە لەیـەك کـاتدا "ئـەوەو ئـەویش نیـە". کەواتــە هــەموو بــیرێك لــە قولایــی پێکهاتــەیدا پێچەوانەیەکی هەیە.

ئیـبن خـەلدون ئامـاژەی بـەو بۆچوونـەی هیگـڵ کـردووە و بەسـەر مێـژووی خێزانـە موڵکدارەکـان و ئـەو دەوڵەتانـەی حوکمـی ئیسـلامیان کردووە بەراوردی دەکات.

بەبۆچوونی ئیبن خـەلدوون هـەموو خـێزانێکی موڵکدار لەسەرەتاوە چاکەخوازو چاکساز بووە، بەلام لە کۆتاییدا بوون بە تێکدەرو شەڕخواز.. کەواتە هیچ خێرخوازێك نییە (چاك)ێکی رەها بێت.

ئیبن خەلدوون بەشێوەیەکی زۆر جوان باس لـە گۆڕانکاری خێزانـە فەرمانڕەواکان دەکات، لەچاکە خوازییەوە بۆ شەڕخوازی.

دامەزرێنـەری خێزانەکـە بەشـێوەیەکی ئاسـایی پیـاوێکی چاکـە، گەروانەبێت ناتوانێك موڵکێك پێکەوە بنێت و بەسـەر ڕکابـەرەکانیدا زاڵ بێت. بەلام کوڕی ئەو دامەزرێنـەرە ناتوانێت شـوێنپێی باوکی هـەڵگرێ لەچاکـە خوازیـدا، چونکـە بـێ ڕەنـج و تێکۆشـان و لـە ئـاوو هەوایـەکی خۆشـگوزەرانی و رابواردنـدا گـەورە بـووەو چـواردەوری بـە خزمـەتکارو کارەکەر گیراوە. ئـەو خۆشـڕابواردنە لـە سروشـتی توندوتیـژی و هـێزو دوربینی دووری دەخاتەوە کە باوکی پێوەی ناسرابوو.. دوای ئەو کوڕی کوڕەکەی دێت، ئەویش پتر رادەبوێرێ و کەمتر چاکـەخوازو خـێر خـوازە،

بەلام کوڕی کوڕی کوڕەکەی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکەی دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە هێندە خۆشگوزەرانە هەروەکو ژن بەناسکی و لارو لەنجەوە بەنێو کۆمەڵگەکەیدا هاتوو چۆ دەکات[1].

دەتوانین ئیبن خەلدون بە (هیگڵ)ی عەرەب دابنێین. فەلسەفە کۆمەلایەتیەکەشی زۆربەی جارەکان بە دەوری ئەو دیالەکتیکەدا دەسورێتەوە کە لەسەر (دژینە) دروست بووە. بەوکارەشی ئیبن خەلدون لۆژیکە کۆنەکەی سەرەو لێژ کردۆتەوە.

ئەو دیالەکتیکەی ئیبن خەلدون لێی دەدوێت بەتەنها کاریگەرێتی لەسەر دەرکەوتە کۆمەلایەتیەکان نییە، بەڵکو دەتوانین بەسەر دەرکەوتە دەرونیەکانیشدا جێبەجێیان بکەین زیادڕەوی ناکەین ئەگەر بڵێین هەموو مرۆڤێك لە هەندێك قۆناغی ژیانیدا بەو(خول)ە دەروونیەدا تێدەپەڕێت کە هاوشێوەی ئەو خوولە کۆمەلایەتیەیە ئیبن خەلدون باسی دەکات. جێگەی داخە زۆربەی لاوەکانمان درك بەو راستیە ناکەن کە ژیانی ئەوان هەمیشە لە گۆڕانکاریەکی دژینەدایەو بەدەگمەن نەبێت لێی دەرباز نابن.

بۆ نموونە: یەکێك لەئێمە کیژێکی جوان دەبینێ، کوتوپڕ حوکمێکی رەهای بەسەردا دەدات و وادەزانێت ئەگەر ئەو کچە بخوازێت دەرکەی بەختەوەری هەمیشەیی و تا هەتایی لەڕوودا دەکرێتەوە .... ئەوەی لەیاد کردووە کاتێك دەیخوازێت ئەو خوولە دەروونیەی دەیهاڕێت و لە کۆتاییدا پێچەوانەی یەکەمجاری لێی دەڕوانێت[2].

---

[1] ئەوەی سەرەوە گوتەی ئیبن خەلدونە. (و).

[2] نوکتەیەکی کوردی خۆمان هەیە دەربارەی ئەو خوولە دەرونییە و دەڵێت: کاتێك کچ و کوڕێك دەزگیران دەبن و لەمانگەشەوێکدا لە ئاسمان دەڕوانن کچەکە بە کوڕەکە دەڵێت:

لاوەکانمان لەئەنجامی ئەو بڕیارە بەپەلەیاندا ڕووبەڕوی چەندین هەرەس دەبنەوە.. لەسەر بنەمای ئەو ئەحکامانەش بناغەی کارەکانیان بنیات دەنێن‌و لە کۆتایشدا دەڕواننە یەك لایەن و لایەنەکانی تری پشتگوێدەخەن. یەکێك لەو گەنجانەی لە لوتکەی لاوێتیدا کچێکی خۆشدەویست.. لێم پرسی: چۆن کچێکە؟ گوتی: چاکترین کچی سەر ڕووی زەوییە.. پاش گواستنەوەی بینم‌و هەمان پرسیارم لێکردەوە. گوتی: خراپترین ژنی سەرڕووی زەوییە!! لەڕاستیدا ئەو کچە لەیەك کاتدا چاك و خراپیش بووە، بەڵام ئەو هاوڕێیەمان بەر لەگواستنەوەی تەنها لایەنە چاکەکانی بینیوەو دوای گواستنەوەش تەنها لایەنە خراپەکانی[1].

---

ئەوە چیە گیانەکەم.. ئەویش دەڵێت: ئەوە دەمووچاوی تۆیە حەیاتم. بەڵام پاش خواستنی و بۆڵەبۆڵ دەستپێدەکات، شەوێکی وەکو ئەوی دی دوبارە دەبێتەوە، ژنەکە هەمان پرسیار لە پیاوەکەی دەکات.. ئەویش پێی دەڵێت: کوێرایتە ئەوە هەزاران ساڵە مانگە..(و).

[1] بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی لێکۆڵینەوەکەی د. عەلی وەردی و قوڵبوونەوە لە پەیوەندیەکانی تاك و ڕۆڵی عەقڵی ناوەوە لەو دیالەکتیکەدا بە تایبەتی لەو نمونەی سەرەوە کە هێناویەتەوە سەبارەت پێش و پاش گواستنەوە ناچارین بگەڕێینەوە سەر بابەتێکی زۆر گرنگ و هەستیار لە ژیانی تاکەکاندا کە ئەویش خۆشەویستیە و لە هەردوو لایەنی دەروونناسی‌و زانستیەوە ئەنجامی ئەو تەبایی‌و پێکەوە ژیانە، یاخود ناتەبایی‌و وەڕس بوونە شیبکەینەوە:

لە تێڕوانینی دەرونناسیەوە خۆشەویستی بە هەرچی شێوەیەك بێت لە ئەنجامی ئەو دژینەو شێوازەکانی چارەسەرکردنییدا دەبێت، ئەو دژینەیەش لە عەقڵی ناوەوەی مرۆڤدا دروست دەبێت و لە پەیوەندی تاکە کەسەوە لەگەڵ دەوروپشتەکەیدا سەرهەڵئەدات.

**<u>یاسای سێیەم:</u> بە یاسای (ناوەندی بالاکراو) دەناسرێت:**

**بەگوێرەی ئەو یاسایە جیهان لە دوولا، یاخود بەرە پێکهاتووە سێیەمیان نییە.. لایەنی حەق و لایەنی ناحەق، یاخود لایەنی جوانی و لایەنی ناشیرینی، یان لایەنی خێرو لایەنی شەڕ یان...هتد.. هەموو شتێکیش دەکەوێتە یەکێك لەو دوو لایەنەوە. ئەگەر یەکێکیانی بەجێهێشت بێ سێو دوو دەچێتە لایەکەی دیکەوە.**

---

فرۆید وای دەبینێ کە بناغەکانی خۆشەویستی لە غەریزە سێکسیەکاندایەو سەرچاوەکانی خۆشەویستیش لە دەرکەوتەکانی ڕەنگدانەوەی وزە سێکسیەکانەوە بۆ بابەتە جیاوازەکان پەیدا دەبێت. لەو بارەیەشەوە دەڵێت: ((ناوەڕۆکی ئەو شتەی پێی دەڵێن خۆشەویستی بەشێوەیەکی سروشتی لەسێکسەوە سەرچاوە دەگرێت، ئامانجەکەشی گەیشتنە بە کرداری جووتبوونی سێکسی. ئێمە لەو بابەتەدا جیاوازی لە نێوان خۆشەویستی دەروونی لەلایەك و خۆشەویستی دایك و باوك و منداڵ لەلایەکی ترەوە ناکەین. هەروەها هاوڕێیەتی و مرۆڤایەتی و دڵسۆزی بۆ بابەتە دیاریکراوەکان یاخود بیروباوەڕە ڕەهاکان.. ئەو هەموو ئارەزووانە دەربڕینێکن بۆ سەرچاوەی جموجوڵە غەریزەییەکان، کە جیاوازیان لەگەڵ خوشەویستی سێکسیدا ئەوەیە تەنها لە ئامانجەکانیاندا جیاوازن. بەڵام فرۆید هۆکاری ڕاستەقینەی پەیوەندیەکانی هاوڕێیەتی و وەفاداریو بیروباوەڕی ڕەهاو... هتد پشتگوێخستووە چونکە بە هیچ شێوەیەك بەلای هۆکارە ڕاستەقینەکاندا نەچووە، کە دەبنە هۆی دروستکردنی ئەو دەرکەوتانە . چونکە مرۆڤ بە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەورو بەرو چۆنیەتی کارتێکردنی ڕادەی ئابووری و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەو ڕادەی ڕووناکبیری، کۆمەڵێك پەیوەندی لەلا دروست دەبن، خۆشەویستی سێکسیش یەکێکە لەو دەرکەوتانەی کە بەهۆی کارلێکە دەروونیەکانی مرۆڤەوە کەم : یاخود زیاد دەکات، بیروباوەڕو بۆچوونە جیاجیاکان لە بارودۆخە ئابووریە جیاوازەکانەوە سەر هەڵدەدەن.. کەس ناتوانێت نکۆڵی لەوەبکات کە سێکس گرنگی و بایەخێکی زۆر ی هەیە لەژیانی کۆمەڵگە جیاوازەکاندا هەر کاتێك کەرتکردن و جیاکردنەوەی لایەنە فیکری و لەشیەکانی مرۆڤ هاتە ئاراوە هەر سۆزێك خزمەت بەجێیەك یاخود دەسەڵاتێك دەکات. لەبواری زانستیشدا: ئەوە سەلمێندراوە کە پەیوەندیەکانی مرۆڤ بەتایبەتی

لەو لۆژیکەدا نێوانی (نێوان)نییە.. عیساش لەکۆندا گوتوویەتی:

((ئـــەو کەســـەی لەگـــەڵماندا نییـــە، دژی ئێمەیـــە.. ((پێغەمبـــەری موسڵمانانیش گوتویەتی: من غشنا فلیس منا)) (و). بەرهەرحاڵ ئــــــەو

خۆشەویستی پێویستی بە توانا بزوێنەرەکان هەیە. (بارديس) لەساڵی ١٩٧٥ دا تیوریەکی لەو بارەیەوە داناو بەشێوەیەکی هێمایی ئەم هاوکێشەیەی بۆ خۆشەویستی داناوە:

پ.ل + پ. ن. ل = چ

پ. ل : پێداویستیە لەشیەکانی مرۆڤە.

پ. ن. ل: پێداویستیە نالەشیەکانی مرۆڤە.

چ : چەندایەتیەکی جێگیرو چەسپاو.

مەبەستی بارديس لە وتیوریە ئەوەیە بۆ ئەوەی چەندایەتیەکی چەسپاو و جێگیر و تەباو یەکسان لەنێوان ژن و پیاودا دروست بێت لە دوای گواستنەوە دەبێت. پێداویستسە لەشیەکان (سێکس بەهەموو لایەنەکانیەوە) لەگەڵ پێویستیە نالەشیەکان (سۆز، وەفا، ... هتد) لە هاوکێشەکەدا یەکسانبن بەواتایەکی دی: سەرکەوتن یان داڕوخانی پێداویستیەکی لەشی یان نالەشی دەتوانرێت بە پێویستیەکی لەشی یان نالەشی جێگەی بگرێتەوەو بگۆڕێت... کاتێك خۆشەویستی لە هەردوو بەشەکە (ژن و پیاو) بەر لەگواستنەوە بە ڕادەیەکی زۆر بەهێزبوو بەمەبەستی تێرکردن و دەستنیشانکردنی پێداویستیە لەشیو نالەشیەکان ئەوا تێرکردنێکی تەواو نییە. بە واتایەکی دی کۆمەڵێك پێداویستی دوای گواستنەوە زیاد لە ڕادە تێر دەکرێن و کۆمەڵێکی دیش پشتگوێدەخرێن ئالەم خاڵەیەدا هۆکاری لەیەك بێزاربوون و جیابوونەوەی زۆربەی ژن و مێردەکان، بەڵام لەو کۆمەڵگایانەی ڕووناکبیریەکی چاکی سێکسی و بوارە دەروونیەکانیان نییە و لە هۆکارەکانی تیناگەن چەندین بیانوو لەلایەن پیاو بۆ ژنەکەیو بەپێچەوانەوە دەهێنرێتەوە بۆ جیابوونەوەو تەڵاقدان. بۆیە ئەگەر هەموو پیاوو ژنێك توانیان دوای گواستنەوە چەندایەتیەکی جێگیر لەنێوان پێداویستیە لەشیو نالەشیەکانیاندا دروست بکەن هەرگیز تەڵاق ڕوونادات وەکو ئەو برادەرەمان لێنایەت کە بەر لە گواستنەوەپاڵنەرە سێکسیەکانی وای لێدەکات مانگ بچوێنێتە ڕومەتی دەزگیرانەکەیو دوای گواستنەوە و تێرکردنی لایەنە سێکسیەکەی ئەو هەڵچونانەی دامرکێنێتەوە و لایەنەکەی دی (سۆزو وەفاو ....هتد) پشتگوێ بخات.

یاسایەش لۆژیکی گوتاردان و ململانێی نێوان پێڕەوەکانە.. تۆ یان دەبێت (لەگەڵ)، یاخود (دژ) بە حەقیقەت بیت.. ئەگەر تاڵە موویەکیش لە حەقیقەت لاتدا، پێویستە شەڕت لەگەڵدا بکرێو لەناو ببرێیت.

(شیلەر): فەیلەسووفی بەناوبانگی ئینگلیز سەبارەت بەو لۆژیکە دەڵێت: ((حەقیقەت لە ڕوانگەی لۆژیکی رەهاوە یەك شتە، دیدو بۆچوونەکانیش پێویستە هاوهەڵوێست بن.. تۆ یان دەبێت لەگەڵ حەقیقەت بی یاخوود دژی بیت. ئەگەر دژی وەستایتەوە دەبێ لە ناوبچی، ئەگەر لە گەڵیشیدا بیت هیچ کەسێك ناتوانێت دژت بوەستێتەوە.. ئەگەر یەکێك مشتومڕو ململانێی لەگەڵدا کردی دەربارەی حەقیقەت و تۆ لە ئەنجامدا ڕقت لێ‌هەستاو دژایەتیت کرد. ئەوە تۆ لەسەر حەقیت.. بەواتایەکی دی دەتوانین بڵێین ئەگەر تۆ دەروونی خۆت لە هەست و بەها مرۆڤایەتیەکانیش داماڵی. ئەوکاتە حەقیقەت هی تۆیەو حەقیش هەر بەلای تۆوەوەیە.

زانستە نوێیەکان ئەو یاسایەیان لە بنەماکەیەوە هەڵتەکاند. بۆ نموونە: لە فیزیادا ئەوشتە ئاشکرابوو کە مادده: (شوێنێکی دیاریکراوی نییە)، بەڵام لە کۆندا دەیانگوت: ((مادده لێرەدا هەیەو لەوێدا نیە)). لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا زاناکان لەو باوەڕەدان: (لە بۆشایی گەردووندا سنورێك نیە بۆ بوونی مادده).

بۆ نموونە: ئەو قەڵەمەی ئێستا لە نێو پەنجەکانی مندایە، چونکە لەوزە کارەبایەکان پێکهاتووە، لە هەموو شوێنێکدا هەیە.. کەواتە بواری موگناتیسیە کارەبایەکەی لە هەموو گەردووندا هەیە.

ئێمە کاتێك هەست بکەین و بڕیار بدەین ئەو قەڵەمە تەنها لە نێو پەنجەکانماندایە، ئەوکاتە لەژێر وەهمی هەستە سنووردارەکانماندایین. بواری قەڵەمەکە لێرەو لەوێدا بەپلە جۆراو جۆرەکان هەیە. بەڵام هەرچەندێك لێی دوورکەوێتەوە کاریگەرێتی موگناتیسی کارەباییەکەی کەمتر دەبێتەوە.. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەم قەڵەمەی ئێستا لە (سلێمانی) پێی دەنووسم لەهەمانکاتدا لەهەولێر[1] نیە. بەپێچەوانەوە لەوێشدا هەیە، بەڵام هەستەکانمان تەنها لە سنوورێکی دیاریکراودا هەست بە کاریگەرێتی ماددە دەکات. ڕاستە ئەو قەڵەمە لە هەولێر یەکێکی دی هەست بە بوونی ناکات، چونکە بوارە موگناتیسی‌یە کارەباییەکەی لە هەولێر زۆر لاوازە و پێنج هەستەوەرە ناسراوەکانی مرۆڤ درکی پێناکات.

ئەو تیورە لە فیزیادا پێی دەگوترێت: تیوری (بوارەکان)، پێچەوانەی یاسای (ناوەندێتی باڵاکراو)یشە.. ئەو ڕێگە بەجیاکردنەوەی بابەتەکان نادات بەسەر دوو لایەنی جیاوازدا.. ((بوون))[2] لەدیدی ئەو تیورەوە درێژ بوونەوەیەکی بێجیاکردنەوەیە. کەواتە جیاوازی نێوان (بوون)و (بوون)ێکی تر جیاوازی پلەیە نەك جۆر.

بۆ نموونە: ئێمە بەشێوەیەکی ئاسایی مرۆڤ بەسەر دوو ناولێنانی جیاوازدا دابەش دەکەین: (شێت و عاقڵ). سنوورێکی یەکلاکەرەوەی جیاکراوەیان نییە... بەگوێرەی بۆچوونی ئەو زانستە هەموو مرۆڤێك پلەیەکی شێتی هەیە.

---

[1] بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە مەراکشمان کردووە بە هەولێر.

[2] بوون: الوجود.

جیاوازی نێوان شێت و عاقڵیش تەنها لە پلەی شێتیەکەیاندایە (زۆر یاکەم) ئێمە کاتێك لە عەقڵی خەڵکی دەکۆڵینەوە هیچ جۆرە جیاوازیەکی چۆنایەتی نابینین.. دەتوانین سەرجەم تاکەکان بە پەیژەیەکی بەیەکەوە گرێدراو دابنێین، هەرئەوەش لەزاراوەی زانستیدا پێی دەگوترێت (بەردەوام continuam). زۆربەی ئەوانەی ئێمە بە عاقڵیان دادەنێین جیاوازیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ شێتەکاندا نییە.. لەوانەیە ئەوان لە حەقیقەتدا شێت بن. بەڵام لەبەر هۆکارەکانی (دەوڵەمەندی، پلەوپایە، هۆز، عەشیرەت) کۆمەڵگە لە شێتەکانی جیاکردونەتەوەو پشتیوانیان لێدەکات.. لەوانەیە هەندێك لەوانەی بەشێت لەقەڵەم دەدرێن لەوانە عاقڵترین، بەڵام کۆمەڵگە لەبەر هەژاریو نەخۆشی و..هتد ڕقی لێیانەو پشتگوێی خستوون و پێیان دەڵێت شێت. خەڵکی بەشێوەیەکی سروشتی بەلای جیاکردنەوەی دووەمدا دەچن. بەو شێوەیەش سنوورێکی جیاکراوەی یەکلا کەرەوەیان لەنێوان تاکەکاندا دروست کردووە لەلایەنی عەقڵ، یاخود هەڵسوکەوتو پەلەو پایەو... هتد. هەرچەندێك تاکەکان لە ڕاستیدا وێکچوونێکی لێکنزیکیان لەنێواندا هەیە.

لەو هەموو شتانەی سەرەوە کەلێی دواین، دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە یاساکانی بیر لە لۆژیکە کۆنەکاندا پشتیان پێبەستبوو لەگەڵ واقیعی ژیاندا یەکی نەدەگرتەوە. بۆیە تووشی نەخۆشی دووفاقیزمی کەسیەتی دەبوون. دەبینی بە گوێرەی لۆژیکی ئەرستۆ مشتومڕ دەکەن و دەنووسن و دەدوێن. کاتێکیش ڕووبەڕوی داواکاریەکانی ژیان دەبنەوە داوای ڕزق و پلەو پایە دەکەن و ئەو لۆژیکە لە یاد دەکەن و لەگەڵ واقیعی شارستانیەتدا هەنگاو دەنێن. بەو پێودانگە دەبنە خاوەن دوو کەسیەتی.

لەبیرکردنەوەدا یەکێکیان بەکار دەهێنن و لە کارکردندا ئەوی تریان. بۆیە لەئەنجامی ئەو جیاوازیو دووفاقیزمیە بەبێ ئەوەی هەست بکەن دەبن بە دوو کەس.

جێگەی داخە بیرکردنەوەی ئاینیش بەهۆی ئاوێتە بوونی لەگەڵ لۆژیکی کۆنداو بە پشتبەستن بە یاساکانی بیر تووشی دووفاقیزمی هاتبوون.

بۆ نموونە: پیاوێکی ئاینی دەبینی لەلایەکەوە لە مینبەری مزگەوتەکانەوە باس لە زوڵم و زۆر و دادپەروەی دەکات. لەلایەکی ترەوە و لە کۆڕو مەجلیس و گەڕەك و شاردا ڕێزێکی زۆر لە دەوڵەمەندو چەوسێنەران دەگرێت.. مێژوو چیرۆکی چەندین خەلیفەو میرمان بۆ دەگێڕێتەوە کە موڵك و ماڵی ئیسلامیان لە کڕینی کەنیزەك و دروستکردنی کۆشك و تەلاردا خەرج کردووە. ئەگەر یەکێکیش عەزابی خودایی بیر بخستنایەتەوە چاوەکانیان پڕ دەبوون لە فرمێسك و نوێژو ڕۆژوویان پتر دەکرد.. ئەو خووەیان ژیانیانی داگیرکردبوو بە بێ‌ئەوەی هەست بەو جیاوازییە گەورەیە بکەن شەوانیان لەگەڵ گۆرانیبێژان و سەماکەراندا ڕۆژ دەکردەوەو ڕۆژیش لەگەڵ پیاوانی شەرع و ئاینیدا ئێوارەیان دەهێنا. پیاوانی ئاینیش تووشی ئەو دووفاقیزمیەی سەردارو سەرکردەو خەلیفەو میرەکانیان هاتبوون و پیرۆزبایی کۆشك و کەنیزەکە نوێیەکانیان لێدەکردن، بەڵێنیشیان دەدانێ خودا لەو دنیاشدا کۆشك و تەلاری بەرزترو کەنیزەکی زۆرتریان پێدەبەخشێ. هەڕەشەیان لەو ڕەشو روتانە دەکرد کە سەرکردەکان سەروەت و سامان و هۆکارەکانی ژیانیان لێ‌زەوت کردبوون و دەیانگوت ئاگری دۆزەخ دەیانسوتێنێ ئەگەر

گوێڕایەڵی خەلیفەو ئیسلام نەبن.. هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان ئەو دووفاقیزمیە لەپیاوانی ئاینیدا هەرماوە. ئەوان بەشێوەیەکی تەواو ڕێز لە زاڵمەکان دەگرن و لە مینبەرەکانیشەوە ڕەخنە لەزوڵم و چەوساندنەوە دەگرن. زۆرجار دەبینین ئامۆژگاری کۆمەڵانی خەڵك دەکەن دوای هەنگاوەکانی کۆمەڵگەو نوێکارییەکانی نەکەون، بەڵام خۆیان و ژن و کوڕو کچەکانیان دوا مۆدێلی سەردەم دەپۆشن و لەگەڵ ڕێڕەوی کۆمەڵگەی مەدەنیدا هەنگاو دەنێن.... دەبینی یەکێکیان لە مینبەرەکانەوە گوتارێکی شێلگیرانە سەبارەت بە خوێندنگە، یاخود سینەماو سفوور دەدات و پاشماوەیەك خۆی و ماڵ و منداڵی ڕوودەکەنە ئەو کارانەی کە لەمەوبەر لۆمەی دەکردن.

دەگێڕنەوە بەقاڵێك ڕۆژێك لەڕۆژان کوڕەکەی نایە بەرخوێندن، مەلایەك چووەلای و پێی گوت ئەوە کارێکی باش نییە.. بەقاڵە بەستەزمانەکەش کوڕەکەی لەقوتابخانە دەرهێنا.. پاش ماوەیەك مەلا کوڕی خۆی ناردە قوتابخانەو پاشان کردی بە فەرمانبەر.. کاتێکیش قوتابخانەی کچان کرایەوە بەقاڵە داخ لەدڵەکە کچەکەی ناردە قوتابخانە.. هەمان مەلای پێشوو هاتەلای و پێی گوت: گوناحە کچ بچێتە قوتابخانەو بخوێنێ. بەقاڵەکە پێی گوت: جەناب ئەمجارەیان هەوڵبدە یەکێکی تر بخەڵەتێنە.

ئەوەی جێگەی باسە، ئەو مەلایە نەیویستووە بەقاڵەکە بخەڵەتێنێ ئەو لەهەردوو جارەکەدا و لە گوتارو وەعزەکەیدا ڕاستگۆبووە لەگەڵ خۆیدا. بەڵام بەبێ ئەوەی هەست بکات کەسیەتیەکی دووفاقیزمی هەبووە ئەو کاتێك نەیهێشتووە بەقاڵەکە کوڕەکەی بخاتە بەر خوێندن زۆر

شێلگیرو سوور بووە لەسەر داواكەی، بەڵام نەیدەزانی پاش ماوەیەك كوڕەكەی خۆشی دەخاتە بەر خوێندن.. ئەوەش گیروگرفتێكی دەروونیەو زۆر لە ئێمە لێی تێناگات. ئەو كەسەی لەبیركردنەوەكانیدا لۆژیكی ئەرستۆ تالیسی بەكاربهێنێت. جا ئەگەر پیاوی ئایین، یاخود كەسێكی ئاسایش بێت بەگوێرەی پێوەرە لۆژیكیەكانی حوكم بەسەر شتەكاندا دەدات كە بەشێوەیەكی یەكلاكەرەوە ئیمانی پێهێناوە.. بەڵام هەروەكو روونمانكردەوە هەموو شتێك یان ڕوداوێك بەگوێرەی یاسایەكی (دژینە)ی ئەو پێوەرانە بەڕێوە دەچێت. هەموو بیریارێك چاری نیەو دەبێت هاوتەریبی بڕوات، چونكە پێویستە بژێت... كەواتە لەسەرەتاوە دژی دەوەستێت و پاشان لەگەڵیدا دەڕوات.. بۆیە دەبینین زۆر جار بەجلوبەرگێكی هەڵخەڵەتێنەرەوە لە بینەرانەوە دەردەكەوێت. بەڵام لەواقیعدا مەبەستی هەڵخەڵەتاندنی كۆمەڵانی خەڵك نیەو نەشیویستووە كەس هەڵخەڵەتێنێ، بەڵكو دووفاقیزمیەك كەسیەتیەكەی داگیركردووە، ڕووەو ئەو هەنگاوە، بێ ئەنقەست پاڵی پێوە دەنێت.

لەسەر ئەو پێودانگە پیاوانی ئایین شەڕی پۆشاكی مەدەنیو نوێخوازو سفور دەكەن. زۆربەی ئەوانەشی جلوبەرگی نوێیان حەرامكرد، دوای ئەوە بینیمان خودی خۆیان، ڕێگەیان بە منداڵەكانیاندا ئەو جلو بەرگانە بپۆشن. ئەو كردەوەیەش ڕاستیەك دەسەلمێنێ ئەوانە چۆن و بەچ شێوازێك بیریان كردۆتەوەو بەچی شێوازێكیش كاردەكەن.

ئەوان بەگوێرەی لۆژیكی حەقیقەتی جێگیرو چەسپاو بیردەكەنەوە بەڵام ژیان لەگۆڕانكاری و پێشكەوتندایە و هیچ جلوبەرگێكیش تاهەتایە وەكو خۆی نامێنێتەوە.

ئێمە پێویستمان بە لۆژیکێکی نوێ هەیە لەگەڵ پێداویستی ڕێڕەوەکانی ژیانی واقیعیدا بگونجێت، بەو لۆژیکە نوێیەش لە دووفاقیزمی کەسایەتی، یاخود عەقڵی‌ی دەربازمان دەکات.

ئەو کەسەی گیرۆدەی لۆژیکی ئەرستۆیی بێت زیان بەخۆی دەگەیەنێتو لەسێ لایەنەوە بەربەست دەخاتە ڕێگەی سەرکەوتنەکانیەوە.

١- دوژمنی زۆر دەبێتو هاوڕێو خۆشەویستی کەم دەبن، ڕێبوارانی ئەو لۆژیکە بەشێوەیەکی سروشتی حەز بە مشتومڕی توندوتیژ دەکەن، هەروەکو روونیشمانکردەوە روانینێکی بەرتەسکیان هەیە بۆ حەقیقەت، هەر کە نەگونجاندنو دژینەیەکی کەم لە وتەو کرداری یەکێکدا دەبینن کوتوپڕ لەسەر شێوازی پێوەرە دوو دەمەکەیان ڕەخنەی لێدەگرنو دەستدرێژی دەکەنەسەر. ئەوەیان لە یادکردووە کە لە سروشتی مرۆڤدا (دژینە) سفەتێکی بنەڕەتیە. خودی ئەو کەسەی رەخنە لە خەڵکانی دی دەگرێت گیرۆدەی ئەو نەخۆشیە بووە... ئەوەش نازانێت کە لەزۆربەی جارەکاندا مشتومڕ هیچ سودێکی نیەو ناگاتە ئەنجامێکی قەناعەتپێکەر، هەرچەندێك بەڵگە لۆژیکیەکانیش بەهێزو سەلمێنەریش بت.. ئەو وادەزانێت ئەگەر یەکێك لە مشتومڕێکدا بەسەریدا زاڵ بوو نەنگیەکی گەورەیە بۆی.. بۆیە دەبینی ماوەیەکی دوورو درێژ لە مشتومڕەکەیدا بەردەوام دەبێت. جا ئەگەر لەسەر حەق یاخود ناحەق بێت.. ئالەو کاتەدا دەکەوێتە نێوان دوو هەڵوێستەوە، یان بەسەر بەرامبەرەکەیدا زاڵبێت و دەیکاتە دوژمنی سەرسەختی خۆی، یاخود بەرامبەرەکەی بەسەریدا زاڵبێتو دڵتەنگو نیگەرانی و بێهیواییەکی زۆر دایدەگرێت.. لە ڕاستیدا مرۆڤ بە مشتومڕەکاندا بدۆڕێت چاکترە لەوەی سەرکەووتوبێت، چونکە

سـەرکەووتنی راسـتەقینە لـە مشـتوومڕی لۆژیکیـدا نیـە. هـەموو سەرکەوتنێك لەڕووکەشیدا، دۆڕاندنێکە لەناوەوە. چونکە ئاگری ڕق و کینە لەدڵی دۆڕاودا دروست دەکات.

تکا لـە خوێنـەر دەکـەم بەقسـەی ئـەو کەسـانە هەڵنەخەڵـەتێت کـە بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن حەقیقـەتیان خۆشـدەوێت و دەیانـەوێت بەهـەر نرخێك بێت پـێ‌ی بگـەن.. ئـەوە بانگەشـەیەکی زۆر درۆزنانەیـە.. مـرۆڤ حەیوانـەو کوڕی حەیوانـەو دەچێتـەوە سـەر بنەچـەی حـەیوانیش.. ئـەو لـەکانگای دڵیـەوە حـەز بەسـەرکەوتن دەکـات و ڕقـی لەژێرکەوتنـە.. سەرکەوتن هێمای مانەوەیە لەشەڕی ژیاندا.. بە دەگمەن نەبێت یەکێك نیە لەژێر کەوتندا چێژ لە حەقیقەت ببینێ.

شوبنهاوەر دەڵێت: ئیرادەی ژیان لە ڕەوشتی مرۆڤدا مەبەستێکی سـەرەکییە. داواکردنـی حەقیقـەتیش لەزۆربـەی کاتـەکاندا خسـتنە ڕوویەکی ناوەندیەو هەندێك جار بۆ شەڕی هەڵخەڵـەتاندن بەکاردێت. بۆ نموونە: تۆ ئەگەر لە مشتومڕێکی لۆژیکیدا سەرکەوتنت بەدەستهێنا وا دەزانی ڕێنمایی ئەو کەسەت کردووە بۆ ناسینی حەقیقەت.. ئاگات لەوە نییە کەسی دۆڕاوت ڕووەو تاریکستانی شەوە زەنگ بردووە. چونکـە ئەو کەسە ڕقت لێوەردەگرێت و ئەو ڕق و کینەیەشی دەگوێزرێتـەوە بـۆ قولایـی عـەقڵی نـاوەوەی و لەهـەموو ئـان و سـاتێکدا لـە چـاوەڕوانی سەرهەڵدان و هاتنە دەرەوەو تۆڵە سەندنەوەدایە.

لەنێو بازرگانەکانی ڕۆژئاوادا پەندێکی ناسراو هەیەو دەڵێت: ((هەمیشە کڕیارەکان لەسەر حەقن)). بازرگانانی ڕۆژئاوا لەهیچ کاتێکدا مشتومڕ لەگـەڵ کڕیارەکـاندا ناکـەن، هـەرچی شـتێکیش کڕیـار دەیلێێـت ئـەو

بەڕاستی دەزانێت... زۆر جار لەپێناو ڕازیکردنی کڕیارەکاندا لەحەق و ناحەقدا بازرگانو دوکاندارەکانی ڕۆژئاوا تووشی زیان دەبن. بەلام لەکۆتاییدا هەر ئەوان قازانجیان کردووەو (موشتەریەکی زۆریان لە خۆیان کۆکردۆتەوە).

بەلام بازرگانان و دوکاندارانی خۆمان، چونکە پەروەردەی لۆژیکی ئەرستۆن، هەمیشە لەگەڵ کڕیارەکاندا حەز بە مشتوومڕ دەکەن.. ئەو بازرگانەی داوای حەقیقەت لە کڕیارەکانی دەکات، حەقیقەتی بازرگانیەکەی لەدەست دەدات و تووشی زەرەرو زیانێکی گەورە دەبێت.

٢- شوێنکەوتووانی مشتومڕی لۆژیکی لەلایەکی ترەوە زیان بەخۆیان دەگەیەنن.. ئەوان لەهەموو کاتێکدا سەرجەم کۆمەلانی خەڵك بە لۆژیکیی لەقەڵەم دەدەن و داواشیان لێدەکەن پێوەری ئەرستۆیی بەکاربهێنن.. کاتێك یەکێك دەبینن پێچەوانەی ئەو دیدو بۆچوونانەی ئەمەمان ڕەفتار دەکات، بە توڕەییەوە دەنگ بەرز دەکەنەوەو هەڕەشەی تۆڵە سەندنەوەی لێدەکەن.

کۆمەلانی خەڵك لەژیانی ڕۆژانەیاندا دوورن لە لۆژیك و ڕێڕەوی پێوەری حەق و دادپەروەری ناگرنەبەر، بەڵکو ئەوان بەدووی دەرکەوتەو دابو نەریت و هەڵچوون و داچوونەکاندا هەنگاو دەنێن.

لەوانەیە بازرگانێك لە بابەتێکی فرۆشراودا گەورەترین دەستکەوتو قازانجی هەبێت، بەلام بازرگانێکی دی لەهەمان بابەت دا کە دەیفرۆشێ زیانێکی زۆر دەکات.. ئەگەر بەدووی هۆکاری ئەو سوودو زیانەی هەردووکیاندا بگەڕێین. دەبینن یەکەمیان خاوەنی ڕوویەکی خۆشو

زەردەخەنەیەکی شیرین، یاخود سەرنجێکی سۆزداریان جوڵەیەکی سەرنج ڕاکێشی شانو شەوکەتێتی... بەڵام دووەمیان دەمو دانێکی گەورەو تێکشکاو کە پێدەکەنێت لەجیاتی ئەوەی کڕیارەکان کۆبکاتەوە دووریان دەخاتەوە... بازرگانی بەدبەختی زەرەرمەند زۆرجار پرسیار لە هۆکاری دوورکەوتنەوەو نەبوونی کڕیارەکانی دەکات خودی خۆشی وەڵامێکی قەناعەتپێکەری نییە.. ئەو کاتێك لە ئاوێنەدا بزەیەك بەڕووی خۆیدا دەدات وادەزانێت زەردەخەنەکەی سەرنج ڕاکێشەو نیگاو ڕوانینەکانی جوانن، چونکە هەموو مرۆڤێك ڕۆچووەتە ناخی خۆیەوەو ناتوانێت هەڵسەنگاندنێکی بابەتیانە بۆ خودی خۆی بکات. بۆیە سەرنەکەوتنی لەبازرگانیو (دوکانداریدا) دەگێڕێتەوە بۆ پێوەرە لۆژیکیەکان و بەڵگەو سەلماندنە عەقڵیەکان.

بۆ نموونە دەڵێت: خەڵکی دەستپیس و فێڵکەرن. بەو بیانوەش دەیەوێت پەردە لەسەر ڕووی سەرنەکەوتنەکانی خۆی دابداتەوەو، لەوباوەڕەدایە دونیا جێگەی پیاوی چاكو بێگەردو دەستپاكو چاکە خوازی وەکو ئەوی تێدا نابێتەوە.

پێوەرە لۆژیکیەکان زۆرجار پاڵ بەخەڵکیەوە دەنێن ئەو کارانە ئەنجامبدەن کە نە ئەو لەگەڵ ئەماندا دەگونجێو نە ئەمانیش لەگەڵ ئەودا هەڵدەکەن. ئەو کاتێك یەکێك دەبینێ لە کارێکی بازرگانیدا سەرکەوتووە یەکسەر پەنا دەباتە بەر پێوەرە لۆژیکیەکەی و دەڵێت: ئەو کەسە لەو پرۆژەیەدا سەرکەوتووە منیش لەهەموو ڕوویەکەوە لەو چاکترو شیاوترو لەبارترم.. کەواتە حەتمەن منیش لەوکارەدا سەردەکەوم.

ئەگەر بەگوێرەی لۆژیك ئەو پێوەرە لێکدەینەوە ڕاستەو قەناعەتپێکەرە.. بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەو لۆژیکەیە. سەرکەوتنی پرۆژەیەك کۆمەڵێك هۆکاری جیاجیاو ئاڵۆزی هەیە، ژیانیش بەشێوەیەکی ئاسایی ناکەوێتە ژێر جیاکردنەوەیەکی دوولایەنە... بەراورد کردنی دووکەس لە ئەنجامدانی پرۆژەیەکدا ڕاستە، ئەگەر یەکێکیان چاکترو گونجاوتر بێت لەوی تریان. لەوانەیە ئەو (چاکتر)ەی مەبەستمانە لە بەراوردکاری نێوانیاندا بەکاری بێنین هۆکاری سەرنەکەوتن و زەرەرمەندیەکەی بێت. لەوانەیە یەکێکیان زیرەکترو ڕەوشتبەرزتر بێت، بەڵام ئەو زیرەکیو ڕەوشتبەرزیەی دیسانەوە لەوانەیە هۆکاریسەرنەکەوتنی بێت لە بازاڕدا، ئەو دوو ڕەوشتەی وایلێدەکات لەڕێڕەوەکانی بازاڕو واقیع بەرزتربێت و لێیان تێنەگات بەو شێوەیە زیهنی خۆی بەو کارانەوە دەلکێنێ کە لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتی خەڵکدا ناگونجێت... بۆیە تووشی ئەو هەرەس و ڕووخانە کوتوپڕیە دەبێت لە بازرگانیدا.

٣- بیرکردنەوەی لۆژیکی مرۆڤ ڕووەو ڕووخانو هەرەسی تەواو دەبات. چونکە بەربەست دەخاتە نێوان (تاك) و بەکارهێنانی هێزە دەروونیە نائاساییەکانیەوە .

هێزە دەروونیەکان لە قوڵایی نەستی مرۆڤەوە بە شێوەیەکی کوتوپڕ هەڵدەقوڵێن.. ئەو هێزانەش پێویستیان بە پێشینە فیکریەکان، یاخود پێوەرە لۆژیکیەکان نییە. بەشێوەیەکی دی دەتوانین بڵێین: پێویستیان بە (خاوبونەوە) هەیە کە هیچ جۆرە ڕاچەنینێکی فیکری لەگەڵدا نەبێت.

گیرۆدە بووانــی بیرکردنــەوەی لۆژیکــی هیــچ کــارێك ئــەنجام نــادەن ئەگەر بەشێوەیەکی ورد بیری لێنەکەنەوە. کــاتێك ئــەو بیرکردنەوەیــەش ســەرتاپای لەشــی دادەگرێــت، ئیلهامــە کوتوپــڕ و ســاتە وەختیــەکانی لەدەست دەدات. ئەو ئیلهامانــەی پــەردەی غــەیب دەبەزێنن... من بــەو گوتەیــەی ســەرەوەم خــەتێکی ڕاستو چــەپ لــە هــەموو کارەکــاندا بەســەر لۆژیکدا ناهێنم، بەڵام دەمەوێت سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕابکێشم کە لــە زۆربەی کارەکانیدا زیانی پێدەگەیەنێت.

بازرگانی سەرکەوتوو کاتێك پەیمانێکی بازرگانی گرێ دەدات پشت بە هۆکارە لۆژیکیــەکان نابەستێت، بــەڵکو خــۆی دەداتــە دەســت هۆکــارە نەستیەکانیەوەو بەگوێرەی هەستە داهێنەرەکانی کار دەکات.

یــەکێك لــە بەناوبانگترین پــەندەکانی نێــو بازرگانــان دەڵێــت: ((بــەر لەوەی بچیتە بازاڕەوە پێویستە عەقڵت لەسەر ڕەفەکە بەجێ بهێڵی)). ئەو پەندە لەڕاستیەوە نزیکە، چونکە ئەو کەسەی لە مامەڵە بازرگانیــەکاندا لۆژیکی ئەرستۆیی بەکار بهێنێت رۆژێك لــەڕۆژان بــازار جێدێڵــێ، یــاخود بەواتایەکی دی: دەبێ بچێتە سەر مینبەرو لــەڕیزی گوتــاردەر یــان ئــاژاوە چیەکاندا خۆی ببینێتەوە.

ناپلیۆن دەیگوت: ((دوای ئەوەی دەکەومە تەنگو چەڵەمەوە، ئینجا بــیر لـــەخۆ دەربـــازکردن دەکەمـــەوە)). ئـــەو خـــۆی دەهاویشـــتە نـــاو ڕووداوێکەوە و چوار دەوری دەگیرا پاشان بیری لەچارەسەر دەکردەوە.. هەموو مرۆڤێك بەر لــەوەی بکەوێتــە کێشــەو گیروگرفتێکەوە بەشێوەیەکی ڕاستو دروست حەقیقەتەکەی ناناسێت.. بــەڵام کە ڕووبەڕوی بــووەوەو چارەی نــەما، ئەوکاتــە عــەقڵی چارەســەرێکی بەپەلــەو ســەرکەوتووی بــۆ

دەدۆزێتەوە.. بەواتایەكی دی: دەكەوێتە تەنگ‌و چەڵەمەیەكەوە و پاشان خۆی دەداتە دەست هێزە ناهەستیەكانیەوەو ئەویش ڕێگەی دەربازبوونی بۆ ڕووناك دەكاتەوە.

ئەو كەسەی باوەڕی بە لۆژیكی ئەرستۆیە دان بەو بۆچوونەی سەرەوەدا نانێت.. ئەو بەرلەوەی بكەوێتە هەر گیروگرفتێكەوە لێی دەكۆڵێتەوەو پێوەرە لۆژیكیەكانی بەكار دەهێنێت‌و جیاكردنەوەو دووفاقیزمیەكەی جار لەدوای جار دەخاتە گەڕ... بۆیە دەبینی ئەو لەبیركردنەوەو پێوەرە لۆژیكیەكانیدا نوقووم بووەو كەسانی سەرپل و سەرشێت پێشی كەوتوون‌و دەستكەوت‌و سوودو قازانجیان بۆ خۆیان بردووە، ئەویش دەكەوێتە ناو لۆمەی دونیاو كۆمەڵانی خەڵكەوە.

(ویلیم مارستۆن) لە بەشێكی ئەو كتێبەی بەناونیشانی ((هەنگاوێك هەڵێنە بۆ پێشەوە)) نووسیویەتی و دەڵێت: (زۆربەی ئەو كەسانەی لەژیانیاندا سەركەوتنی گەورەیان وەدەستهێناوە، هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەستپێشخەرییەی لە دەروونیانەوە پاڵی پێوەناون بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە. زۆربەمان رۆژێك لە رۆژانی ژیانمان هەستمان بەوە كردووە هێزە دەروونیەكانمان ڕێنیشاندەرمان بووەو سەرتاسەری ژیانمانی گۆڕیوە. ئەو هێزە كوتوپڕانەی كە جارجارە عەقڵ ڕووناك دەكەنەوەو بەهەمان خێراییش ون دەبن).

ئەو پاڵنەرە ناهەستیانەی (مارستون) لێیان دەدوێت‌و ناوی ناون (ڕووناك كەرەوەكان) لە كاروبارو هەڵسوكەوتی ڕۆژانەدا یارمەتیدەرو ڕێپیشاندەری مرۆڤن و هیچ بیركردنەوەیەكی لۆژیكی هەر چەندێك وردو ڕێكخراوو نەخشە بۆ داڕێژراویش بێت ئەو كارە ناكات.

ئەو کەلتوورەی لەڕۆژگارەکانی یۆنانەوە بۆمان بە جێماوە و فێری ئـەوەی کردوویـن کەبیرکردنەوەیـەکی ڕێکخـراو و نەخشـە بـو داڕێـژراو، سەرچاوەی هەموو سەرکەوتنێکن لەژیاندا .. هەرئەو کەلتوورەش تووشی زیانێکی گەورەی کردووین .

ڕۆژێـك برادەرێکـم دوچـاری گـیروگرفتێك وهەڵوێسـتێکی ناڕەحـەت ببوو ، نەیدەزانی چیبکات و بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕا . پێم گوت : ((بەگوێرەی ئەو ڕێنماییانە بکە کە هەر لـە خۆتـەوەو کوتوپڕ بە خـەیاڵتدا دێن)). ئەو هاوڕێیەم گاڵتـەی بەعـەقڵم هات و وایزانـی پـیٚی ڕادەبوێرم و خراپەی ئەوم دەوێت .

ئـەو هاوڕێیـەی مـن یـەکێك بـوو لـەقوربانیانی لۆژیکـی یۆنـانی کـۆن ...پاش ماوەیـەك پـیٚی گـوتم : ((مـن بـەگوێرەی ڕێنماییـەکانی عـەقڵ و بیرکردنـەوەی ڕاسـت و دروسـت هـەنگاو دەنێم )). لەئەنجامدا شـڵەژاوی و سەرلێشـێوا ویەکـەی پـتربوو . ئەوهاوڕێیـەم بەبیرکردنـەوەی نەخشـە بـۆ داڕێـژراوی پێشـوەختی ڕێگـەی لـە ڕووناککـەرەوەکانی دەگـرت ، کـە لـە قولاٚیـی دەروونیـەوە هـەڵدە قـوولاٚن . هـەر وەکـو ئـەو پەردەیـەی بـەر لـە تیشکی ڕۆژ دەگرێت .

یـەکێکی دی لـە نەنگیـەکانی بیرکردنـەوەی لۆژیکـی پشـت بـە ئامادەکارییەناسـراوەکان و زانیارییـە پێشـوەختەکان دەبەسـتێت. بۆیـە ناتوانێت لەڕووداوەکاندا درك بەو شتانە بکات کە لە و دیـوی (کـات) و (شوێن)ەوەن.. بەلاٚم هێزە نەستیە کوتوپڕەکان لـە قولاٚیـی عـەقڵی ناوەوە هـەڵدەقوڵێن . عـەقڵی ناوەوەش هـەر وەکـو لەمـەودواش لیٚ‌ی دەدوێـین بـە

سـنوورەکانی کـات وشـوێنەوە پــەیوەندیدار و پەیوەسـت نیـەو توانـای بینینی (غەیب) و ئەو دیوی پەردەو بەزاندنی دوریەکانی هەیە .

ئەو بازرگانـەی لەسـەر رووی خـۆی و بـەبیٚ بیرکردنەوەیـەکی قـووڵ پەیمانێکی بازرگانی دەبەستێت ، زۆر سەرکەوتووتر و سوودمەندترە لەو بازرگانـەی لـە هـەموو هـەنگاوێکدا بـیر دەکاتـەوە و نەخشـە دادەڕژێـت .. یەکەمیان لەحاڵەتی بێهۆشی و لەهۆش خۆچوونەوە ئاڕاستە دەکرێت .لە و ڕێگەیەشەوە بەشێوەیەکی ناهەستی ئاگای لە هەڵچوون و داچوونەکانی بـازاڕە .بـەبیٚ ئـەوەش هەسـت بـەخۆی بکـات هــەنگاو دەنێـت .. بــەڵام دووەمیـان بیرکردنـەوەکانی ڕێگرێـك دەبـن لەبـەردەم زانینـی ڕوداوەکـانی (غەیب)دا.بۆیەهەمیشە دەستەوەستان و دوو دڵ وراڕایە .

هێزە نا هەستیەکانی مرۆڤ هەندێك جاریش هەڵە دەکەن ، چونکە هیچ ڕێنیشاندەرێك لە بووندا نییە هەڵە نەکات ..کاتی حەقیقەتە ڕەهاکان بەسـەرچووەو ئـەمڕۆ زەمـانی شـتە تێکڕایـیو گریمانەکانـە.. هـێزە ناهەستیەکان هەڵە دەکەن و ڕاستیش دەپێکن.. بەڵام ڕاستیەکانی زۆرترە لە هەڵەکانی. ئەو کەسەشی بەدوایدا بڕوات هەندێك جار شکست دێنـیو زۆرجاریش سەرکەوتوو دەبێـت، لـە کۆتایشـدا دەگاتـە ئـەو مەبەسـتەی خۆی دەیەوێت.

سەرنج بدەرە یـەکێك لەیاریزانـە لێـهاتووەکانی (تێنـس)، چـۆن لـە جووڵـەکانیدا رادەمێنـیو ڕوەو تۆپەکـە دەڕوات و وەری دەگـریٚ و لــیٚ دەدات و جارلــەدوای جــاریش شــوێنەکەی خــۆی دەگۆڕێــت.. ئــەو بەشێوەیەك دەچێتـە نـاو یارییەکەیـەوە هەسـت بـە چـوار دەووری خـۆی ناکـات... ئەگـەر ئـەو یاریزانـە لـە شـوێنکەو توانـی ئەرسـتۆ بایـەو

لەیاریکردنیدا بۆ هەموو جووڵەیەکی بیرکردنەوەیەکی لۆژیکی و ڕامانێکی قووڵی بکردایە، بێگومان پاش ماوەیەك لە برسا دەمرد.

یاریزانی شارەزا لەکاتی یاریکردندا خۆی لەیاد دەکاتو خودی خۆیو تۆپەکە دەبنەیەك شت.. دەبینی بەرلەوەی تۆپەکەی بۆ بێت رووەو ڕێڕەوی تۆپەکە دەڕواتو دەگاتە ئەو شوێنەی کە پێویستە لێی بێت... کە لێشی بپرسی چۆنت زانی تۆپەکە رووەو ئەو شوێنە دێت ؟ هیچ وەڵامێکی پێ نییە .. ئەو لە جوڵە کتوپڕەکانیدا کۆمەڵێك هۆکار پاڵی پێوە دەنێن خۆشی نازانێت لە کوێوە دێن .

چەندین بەڵگەو نموونەی دی هەن لە سەر ئەوانەی لەکاتی کار کردن، یان قووڵبوونەوە لەناو هونەر و زانستەکاندا، یا لەکاتی داهێناندا لە خودی خۆی دادەبڕێت و جاری واش هەیە لە تەنیشت تۆوە وەستاوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو لە جیهانێکی تردایە.

پارێزەرێك دەناسم، دوچاری نەخۆشی مشتومڕی لۆژیکی بووە. کارمەندێك، یاخود دادوەرێك نییە ئەو مشتومڕی لەگەڵدا نەکردبێت. هەموو جارێك خودی خۆی و گوێگرەکەشی بێتاقەت و نیگەران دەکات، بۆیە لەهیچ هەنگاوێکیدا سەرکەوتوو نەبووە.

پارێزەری سەرکەوتوو لە بابەتەکانیدا بەگوێرەی پەیام و گوتە سروشتیو لەخۆوەکانی هەنگاو دەنێتو دەدوێت.. لەو کارەیداو بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات، بیرکردنەوەکانی دادوەر دەخوێنێتەوە، هەرچی شتێکیش ئەو دەیەوێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە مێشکی دادوەرەوە وەری دەگرێت.

دەڵێن هەندێك لە گوتار خوێنە بەناوبانگەکان لەکاتی قسەکردندا خۆیان لە یادکردووەو بە چلەی زستان عارەق بەنێوچاویاندا هاتۆتە خوارێ.. جارێك لە یەکێکیان پرسی: تۆ چۆن ئەوەندە لە قسەکردندا شارەزای؟. گوتی: من کاتێك دەچمە سەر تەختەکە نازانم چی دەڵێم .. ئەو لەو کاتەدا هەروەکو ڕادیۆ وایە کە لە ئیزگەوە شەپۆلەکان وەردەگرێت.. ئەو دەکەوێتە حاڵەتی ونبوون و لەسەرخۆ چوون. بەو شێوەیەش زیهنی خاڵی دەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو شەپۆلە دەروونیانەی کە لە ئامادەبوان و گوێگرانەوە ڕووەو ئەم دێت.

گوتاردان، یاخود سازکردنی سیمینار و مێزگەرد و کارە هاوشێوەکانیان، پێویستیان بە ئیلهامەکانی نەست هەیە. گوتار خوێنی چاك بەرلەوەی دەست پێبکات هەندێك زانیاری و سەردێڕی بابەتەکانی لەلاپەڕەیەکی بچوکدا دەنووسێ، بەڵام کاتێك لە سەرکورسیەکە دادەنیشێ، یاخود ڕادەوەستێ خۆی بەهیچ شتێکەوە نابەستێتەوە کە پێشتر بیری لە گوتنی کردۆتەوە.. کاتێکیش بەشێوەیەکی کوتوپڕ لە گوتەکانی دەوەستێ، پەنا دەباتەوە بەر ئەو زانیاریە کورتکراوانەی لەلاپەڕە بچوکەکەدا نووسیویەتی، چونکە زیهنی گوتار خوێن وەکو ڕادیۆ جارجارو بەشێوەیەکی کوتوپڕ دەوەستێ. لەوساتە وەختە تەنگانەیەدا پێویستی بە شێوازێك هەیە تا بەخۆیدا بچێتەوەو دەستپێبکاتەوە.

جێگەی داخە هەندێك کەس دەیانەوێت لەهەموو شتێکدا بدوێن و لەهەموو بۆنەیەکیشدا خۆیان هەڵقورتێنن. ئەوان وا دەزانن لێهاتوویی و شارەزایی قسەکردن، پیشەسازی و دروستکراوێکی لۆژیکیەو هەموو

کەسێك دەتوانێت لەگوتەکانیداو لەسەر بنەمایەکی فیکری ڕاستو دروست بەکاری بهێنێت.

ئەوان کاتێك گوتار خوێنێکی چاك دەبینن دەیانەوێت لاسایی بکەنەوە. ئەوان درك بەنهێنی ئەو حەزە ناهەستیە ناکەن کە لە ئانوساتێکدا لەنێوان گوتەی قسەکەرێك و دەروونی گوێگراندا دروست دەبێت.

ئەو شتەی قسەکەرێك دەیڵێت زیاتر پەیوەندیەکی دەروونیە هەتا واتاو مەبەستێکی لۆژیکی. ئەو شتەشی لە شوێنێك و هەڵوێستێکدا دەگوترێت، چاك نییە لەشوێنێكو هەڵوێستێکی تردا بگوترێت. خۆئەگەر وێکچوونێکی شێوەییش هەبێت لەنێوان هەردوو شوێنو هەڵوێستەکەدا.

دەگێڕنەوە لەسەردەمی عەرەبی جاهیلیدا (عەنتەرەی عەبسی) بە پاڵەوانێکی لەرادەبەدەر ئازاو دڵڕەق ناسرابوو.. ڕۆژێك لێیان پرسی: ((تۆ لەناو عەرەبەکاندا قارەمانترین و دڵڕەقترین کەسی))؟ ئەویش گوتی: نەخێر.. گوتیان: ئەدی چۆن ئەو ناوبانگەت پەیدا کردووە؟. عەنتەرەش گوتی: لەسەر سێ بنەما کە لەشەڕدا بەکاری دەهێنم:

**یەکەم:** من کاتێك پێشدەکەوم، کە هیچ هەنگاوێك نەبێت بۆ چوونە پێشەوە... کاتێکیش دەگەڕێمەوە هەنگاوێك نەبێت بۆ گەڕانەوە.

**دووەم:** ناچمە هیچ شوێنێکەوە، هەتا دەرکەی چوونە دەرەوەی نەبینم.

**سێیەم:** یەکەمجار هێرش دەکەمە سەر لاوازەکان و لێدانێك لێیان دەدەم دڵی ئازاکان بلەرزێنێ، پاشان دەگەڕێمەوە سەر ئازاکانو تێکیاندەشکێنم.

ئـەو سـێ بنەمایـەی ئەگـەر بەڕاسـت یـاخود درۆ دراونەتـە پـاڵ عەنتـەرەی عەبسـی شـایەنی ئەوەیـە هـەموو گوتـار خوێـن و کۆڕگـێڕو وانەبێژێك بیگرنەبەر.

گوتارخوێن نابێت لەهەموو شوێنێکدا خۆی هەڵقورتێنێ، یاخود لەهـەموو ڕوداوێکدا بەبۆنـەو بێبۆنـە دەنگـە زوڵاڵەکـەی هـەڵبڕێ پێویسـتە وەکـو عەنتـەرە کـاتێك پێشـبکەوێت هـەنگاوێك نـەبێ بـۆ پێشـکەوتن، کـاتێکیش بگەڕێتـەوە هـەنگاوێك نـەبێت بـۆ گەڕانـەوە. هـەروەها خـۆی نەخاتـە هەڵوێسـتێکەوە هـەتا دەرکـەی چوونـە دەرەوەی خـۆی ئامـادە نـەکات.. چونکـە لـەکاتی قسـەکردندا بـۆی دەگەڕێتـەوە.. هـەندێك جـار دەکەوێتـە هەڵوێستێکی خراپـەوە چاو بـە نێو گوێگرانـدا دەگێڕێت بـەبێ ئـەوەی بتوانێـت یـەك وشـە بڵێـت. هـەر وەکـو گوتیشـمان گوتـارخوێن و قسەکەری چاك بە بیرێکی دیاریکراو، یاخود سەرە دێڕەکان خۆی ئامادە دەکات لەکاتی پێویستیشـدا دەگەڕێتـەوە سـەریان، ئـەو سـاتەوەختەش بـەهێڵی گەڕانـەوەی جـەنگاوەرەکان دادەنرێـت لـەکاتی شکسـتیاندا.. پێویسـتە گوتـارخوێن یەکـەم چرکـە لەدەرگـەی هـەر بیرێك بـدات کـە دێتـە مێشکیەوە، ئەو شتەش کە لۆژیکیەکان پەنای بۆ دەبەن لە جیاکردنەوەو ڕێکخسـتنی بیرەکانیـان بەشـێوەیەکی زنجیرەبـەندی یـەك لـەدوای یـەك و لەسەر ئەو شێوازەی پێشوەخت ئامادەیان کردووە لـێ‌ی بدوێن خۆی لـێ لابـدات چونکـە تووشـی لاوازی هەڵوێسـتی قسـەکردنی دەکـات و ڕێگـەی لێدەگرێـت بـۆ بـەکارهێنانی هـێزە دەروونیـە داهێنـەرەکانی.. (عەنتـەرە) لەشەڕی پاڵەوانبازیدا یەکـەمجار لـە لاوازەکـانی دەداو پاشـان بـە هێزەکـان بـۆی نـەرم دەبـوون.. بیرەکـانیش وەکـو پاڵەوانـەکان پێویسـتیان بەهـەمان

شێواز هەیە. لەسەرەتادا زۆرگران دێنە بەرچاو، بەڵام هەر کە لەدەرکەی یەکێکیانتدا ئەوانی تریش یەك لەدوای یەك خۆیان دەدەن بەدەستەوە.

نووسەرەکانیش لەنووسینەکانیاندا پێویستیان بە هەمان ڕێگەو شێواز هەیە.. شارەزایانی هونەری نووسین دەڵێن: ((یەکەم شت کە بەخەیاڵتدا دێت بینووسە، درێژدادڕیش مەکە لەو نووسینەدا... پاش ساتەوەختێك دەبینی قەڵەمەکەت بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕۆدەچێتە بابەتەکەوە، ئەوەندە ڕەوان دەنووسیت لەوەوبەر شتی وات بەخۆتەوە نەدیوە)).

گرنگیدان بە جیاکردنەوەو ڕێزبەندکردنی لۆژیکی و ڕێکخستنی پێشەکی و کۆتایی لەنووسیندا هەروەکو (بەرد) وایە کە لە ڕێڕەوی جۆگەلەیەکدا دادەنرێتو دەبنە بەربەست بۆی. پێویستە ئەوکەسەی تازە دەست بە نووسین دەکات ئاگای لەو حەقیقەتە بێت کە لە هونەری نووسیندایە:

داهێنان بەبێ ویستی تۆ دێت، بەواتایەکی دی لەئەنجامی هەڵقوڵینی نەستە دەگەیتە سەری.. هەر شتێکیش ڕێگربێت لەبەردەم ئەو هەڵقوڵینەدا دەبێتە هۆی کەمی لە داهێناندا.

**داهێنان لەنووسیندا پێویستی بە سێ قۆناغ هەیە:**

<u>**یەکەم:**</u> لە گەڕان و لێکۆڵینەوەو توێژینەوە هەستیەکانەوە دێت، شەنوکەوکردن و کۆکردنەوەی زانیاریەکان و ڕیزبەندی کردنیان. ئەم قۆناغە بەس نیە بۆ داهێنان. بەڵام هەندێك جار پێویستەو دەتوانین ناوی بنێین قۆناغی (کۆکردنەوە). چونکە ئەگەر عەقڵی ناوەوە خاڵیو بەتاڵ

بێت، کارناکات. سەرەتا پێویستە بەپێکهاتەو ناوەڕۆکە جۆراو جۆرەکان پڕبکرێت. ئەو پێکهاتانەش وەکو ئەو مادده خاوانەیە کە بەرهەمەکەی لێ دروستدەکرێت.

(مازنی) دەڵێت: ((نووسەر وەکو ئۆتۆمبێلی ئاوپرژێن وایە، پێویستە بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی بنوسێت)). ئەو گۆتەیەش زۆر ڕاستە.

**دووەم:** قۆناغی هەڵقوڵینی نەستەکانو هاتنە دەرەوەیان.. نووسەر دوای ئەوەی زانیاریەکان لە عەقڵی ناوەوەیدا کۆدەکاتەوە، لەوێدا لێی دەگەڕێت تا دەپیتێت و هەڵدێت... دوای ئەوە هەست دەکات شتێك پاڵی پێوە دەنێت بۆ نوسین... لەو کاتەدا ئەگەر بشمرێت حەزدەکات شتێك بنووسێتو دەبێتە کۆیلەی هێزە نەستیەکانی، قەڵەمەکەشی دەبێتە شای ملکەچبووان و بۆ کوێ بیەوێت لەگەڵ خۆیدا دەیبات.

**سێهەم:** قۆناغی گونجاندن و جوانکاری و ڕازاندنەوەی لۆژیکیی دەستپێدەکات.. چونکە ساتەوەختی ئیلهام ئەوەندە سەرکوتکەرو دەسەڵاتدارە بوار بە خاوەنەکەی نادات بیر لەو شتانە بکاتەوە کە خەڵکانی دی نووسیویانە و ئەم وەری گرتووە.

بۆیە پێویستە لەقۆناغی کۆتاییدا نووسەر ئەو شتانە بەسەر بکاتەوە کە لەساتە وەختی ئیلهامدا نووسیویەتی، هەندێکی لێ بسڕێتەوەو زەوق بداتە بەشێکی تری... ئەو لەم قۆناغەدا لە جیهانی نەستەوە هاتۆتە ناو جیهانی هەستەوە. دوای ئەوەی کەسێکی عەبقەری بوو، لەم قۆناغەدا دەبێتە تاکێکی کۆمەڵایەتی.

# بەشی سێیەم
# ئیرادەو سەرکەوتن

هەر لەکۆنەوە دیدو بۆچوون و بیروڕای زۆربەی بیریارەکان لەسەر بەرز نرخاندنی ئیرادەو ئەو ڕۆڵە گرنگەی لەسەرکەوتن و بالأدەستی مرۆڤدا دەیگێڕێت چڕبۆتەوە. هەر کەسێك لەکارێکدا سەرکەوتوو نەبایەو تووشی نوشووستی هاتبایە، لاوازی ئیرادەو کەمی هەوڵدانیان دەدایە پاڵ و دەیانگوت: ئەو کەسەی بیەوێت سەرکەوتن وەدەست بهێنێت دەبێت شێلگیرانە روو بەرووی بڕوات و ئیرادەی بەهێز بکات و سووربێت لەسەر جێبەجێکردنی.

کۆن و نوێی کتێبە عەرەبیەکان لێوانلێون لەو فیکرەیە.. بۆ هەر کوێیەکیش دەچیت بەم شێوەیە ئامۆژگاریت دەکەن: ((سەرکەوتن لەڕێگەی تێکۆشانەوە وەدەست دێت..، هەر کەسێك بەڕێگەیەکدا بڕوات دەگاتە جێ) چەندین شتی تر کەلە خۆبایی بووەکانی مێژوو و کۆیلەدارەکان دایان هێنابوو.

لەعێراقدا و لەسەرەتای دەستپێکردنی ژیانی سیاسی نوێدا خەرمانەیەك لەو حوکم و ئامۆژگاریە پڕوپوچانەم بینیووەو بیستووە.. کتێبی قوتابخانەکانیش لەولایەنەوە ئەوەندە پڕوپوچن دوچاری سەریەشەمان دەکات.

ئەو کەسانەی بارودۆخێکی ناوازە، یاخود ڕێکەوتێك گەیاندوونیەتە پلەیەکی بەرزو بالا لەدەسەلات و سەروەت و سامان،

بەلوتبەرزیـەوە دەڕواننـە هـەژارو بەدبەختـەكانی دەوروبـەری خۆیـان سەركۆنەو سەرزەنشتیان دەكەن.... واخۆیان دەردەخـەن كـە بەهـەوڵ و هـێزی ئیرادەیـان ئـەو پلەوپایـە، یـاخود سـەروەتو سـامانەیان دەستكەوتووە... هەندێك لەوانەی بەخت یاوەریان بووەو بارودۆخەكەیان لەبار بووە بۆ ئەوەی پلەكانی خوێندن تەواوبكەن دەڵێن: ئێمە خۆمان هـەوڵماندواەو خوێندوومانـەو لـە ئـەنجامدا بەرهـەمی ئـەو هـەوڵ و تێكۆشانو هێزی ئیرادەیـەمان دەخۆین.. نازانن ئـەو هـەژارەی لـە ڕۆژە گەرمەكانی هاویندا هـەتا ڕۆژئاوابوون كرێكاری دەكات و بـەردو خـۆڵ دەگوێزێتەوە زۆر زیاتر لەوان ئارامترو خاوەن هێزی ئیرادەی زۆرترن.

جـارێك كۆمـەڵێك منداڵـم بینـی لـە قرچـە قرچـی هـاویندا لـە دروستكردنی خانویـەكدا كاریـاندەكرد.. ئـەو منداڵانـە لەبـەر هـەژاری نەیانتوانیبوو وەكو خوا پێداوەكان بچنە قوتابخانە، بۆیە لەو چارەنووسە پڕ ئازارەی تووشی هاتبوون ئیرادەكەیان هیچ ڕۆڵێكی نەبووە. هەژارەكان قوربانی ئەو بارودۆخەن تێیدا لەدایك دەبنو گەورە دەبن.

بە دەگمەن نەبێت، هەموو مرۆڤێكی سەركەوتوو تووشی لەخۆبایی بوون دەبێت و سەركەوتنەكەی دەگێڕێتەوە سەر دوربینی خودی خۆیو هەوڵدان و هێزی ئیرادەكەی.

لەڕاستیشدا سەرەڕای ئەو شتانە، كۆمەڵێك هۆكاری دی هەن بۆ سەركەوتن. ئەگەر پرسیار لەیەكێك لەوانە بكەین كە گەیشتوونەتە پلەیەكی بەرز و ناوبانگێكی چاكو سەروەتو سامانێكی زۆر ئایا لە سەرەتای ژیانتدا بیرت لەوە كردبۆوە، یاخود نەخشەت داڕشتبوو بۆ

ئەوەی بگەیتە ئەو پلەو پایەی ئێستات؟ لەوەڵامدا پێت دەڵێت: نەخێر هەرگیز ئەم ڕۆژەم بەخەیاڵدا نەهاتووە.

بەدەگمەن یەکێك هەبووە لەژیانیدا نەخشەیەکی وردی بۆ کارەکانی داڕشتووەو هەنگاو بەهەنگاو بۆی ڕۆیشتووەو لە کۆتایشدا و لەسەر بنەمای ئەو نەخشەیە سەرکەوتنی وەدەست هێناوە.. زۆربەمان لەژیاندا ڕووەو مەبەستێك هەنگاومان ناوەو پاش ماوەیەك لێی پەشیمان بوینەتەوە.. واقیعی ژیان لەهەموو نەخشەیەك کە عەقڵێکی سنووردار دایدەڕێژێت بەهێزترەو .. مرۆڤ رووەو ئەو ڕێڕەوەی ژیان دەڕوات کە پێداویستیەکانی ساتەوەختی ژیان دەیخوازێت.. ئەگەر بەرێکەوت بۆی لوا لەکارەکەیدا سەربکەوێت، رووی لە خەڵکی وەردەگێڕێت و لۆمەیان دەکات و بەدبەختیەکەیان دەگێڕێتەوە ئەستۆی خۆیان.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە لە روخاوو سەرنەکەوتوەکان زیاتر کەسی دی باوەڕی بە بەخت نیە.. ئەوان دەیانەوێت روخانو سەرنەکەوتنەکانیان بدەنەپاڵ عەقیدەی بەخت.. بەڵام کەسی سەرکەوتوو، لەخۆبایی بوون هەموو لەشی دەگرێتەوەو سەرکەوتنەکەشی دەگێڕێتەوە سەر ئیرادەو هەوڵدانی خۆی.

ژێرکەوتوو باوەڕی بە بەخت هەیەو سەرکەوتوش نکوڵی لێدەکات ئێمەش لەنێوان ئەو دوانەدا رادەوەستین و هەوڵدەدەین لە هەردووکیان شتێك فێربین.

لەکۆتاییەکانی سەدەی رابردوودا خوالێخۆشبوو (یەعقوب سەروف) نووسەری بەناوبانگی میسر کتێبی (نهێنیەکانی سەرکەوتن)ی لە ئینگلیزییەوە کرد بە عەرەبی و لەوڵاتانی عەرەبیشدا ناوبانگو رەواجێکی

زۆری هەبوو. بەرلەوەش لەولاَتانی ڕۆژئاوادا هەمان ناوبانگی دەركردبوو خرابووە سەر زۆربەی زمانەكانی دونیاش.

ئەو كتێبە جەختێكی زۆر لەسەر گرنگی ئیرادەو هەوڵ و تێكۆشان و خەباتی مرۆڤ دەكاتەوە.. چەندین بەڵگەشی بۆ سەلماندنی بۆچوونەكانی هێناوەتەوە...لێرەدا چەند پەرەگرافێكی ئەو كتێبە دەخەینە ڕوو.

((مـرۆڤ بـەهۆی ئیرادەكەیـەوە دەتوانێـت ئەوشـتەی دەیـەوێت ئەنجامی بدات.. دەگێڕنەوە یەكێك لە دارتاشەكان كورسییەكی بۆ قازی شارێك دروست دەكرد، ئەوەندە گرنگی بەو كورسییە دەدا یەكێك لـێی پرسی: كاكی دارتاش دەبینم بەشێوەیەكی نائاسایی و زیاد لە پێویست گرنگی بەدروستكردنی ئـەو كورسـیە دەدەیـت؟. دارتاشـەكەش گوتـی: دەمەوێت ڕۆژێك لەڕۆژان خۆم لەسەر ئەو كورسییە دابنیشم. بەو شێوەیە ئەو دارتاشە هەوڵیداو كۆلێژی یاسای تەواوكردو لە كۆتاییدا بوو بە قازی و لەسەر هەمان كورسی دانیشت)).

لۆژیكیـەكان دەیـان بەڵگـەو نموونـە دەهێننـەوە كـە مـرۆڤ لـە ئیرادەكەیدا ئازادە. چونكە سەرجەم مرۆڤەكان لەهەڵبژاردنی خێرو شەڕدا ئازادن. هەروەها دەڵێن مرۆڤ پارچە كاغەزێك نییە بخرێتە ڕووبارێكەوە بۆ ئەوەی خێرایی ڕێڕەوەكەی دیاری بكات، بەڵكو مرۆڤ مەلـەوانێكی چاكەو هەمیشە ململانێی شەپۆلەكان دەكات و بەهۆی هێزی باڵەكانیـەوە بۆ هەركوێیەك بیەوێت دەچێت.

بەڵێ ئێمە ئازادین و خاوەنی ئازادییەكی ئەدەبین بۆ ئەو شـتەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەین. ئێمە پێوەندی هیچ جۆرە تەلسم و سیستمێك نین. ئەو كەسەشی درك بەو هەستە نەكات سوودێكی ئەوتۆی نابێت.

نووسەری کتێبەکە چیرۆکی سەربازێکی فەرەنسیمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە ژوورەکەی خۆیدا هاتووچۆی دەکردو لەبەر خۆیەوە دیگوت: ((دەبێت ببم بە سەرکردە)). ئەو سەربازە تێکۆشاو خەباتی کرد هەتا گەیشتە ئەو هیوایەی خۆی دەیویست...

هەروەها چیرۆکێك لەسەر (بکستون) دەگێڕێتەوە، ئەو پیاوەی کە لەژیانیدا سەرکەوتنێکی گەورەی وەدەستهێنابوو. بکستون بۆ یەکێك لە منداڵەکانی دەنووسێت: ((من دڵنیام هەموو لاوێك هەرچی شتێکی بوێت پێی دەگات، من هەمان رێڕەوم گرتەبەرو ئەو کاتەی لە تەمەنی تۆدا بووم هەموو سەرکەوتن و بەختەوەریەکانم لەڕێگەی ئەو پرۆگرامەوە وەدەست هێنا کەخۆم دامڕشتبوو...)).

ئەو ئامۆژگاریانە زۆر سوودمەندن ئەگەر بە منداڵەکانمانی بڵێین. و لەوانەیە پێویستیش بێت بۆ پەروەردەکردنیان بۆ ئەوەی هانیان بدەین بۆ کارکردن و بەهێز کردنی ئیرادەکەیان . لەگەڵ ئەوەشدا بەهیچ شێوەیەك ناگونجێت لەگەڵ ژیانی واقیعیدا .. جگە لە سەرکەوتوەکانیش کەسی دی ئەو ئامۆژگاریانەیان بەسەر زاردا نایەت کە لە ژیانیاندا هەوڵیانداوە و گەیشتوونەتە ئەو شتەی خۆیان دەیانەوێت. ئەو هۆکارە شاراوەو نهێنیانەیان لەیادکردووە کە لە سەرکەوتنیاندا یارمەتیان داون.

ئێمە ئەگەر ئامارێکی ئەوانە بکەین کە لە ژیاندا هەوڵیانداوە و سەرنەکەوتوون، زۆر زیاترە لەوانەی سەرکەوتوون. گیروگرفتەکەش لەوەدایە ئێمە گوێ ناگرین لە دۆڕاوەکان.. هەموو هەوڵێکمان بۆ ئەوەیە گوێ بۆ سەرکەوتووەکان ڕادێرین و ڕێز لە هەوڵەکانیان بگرین.

بەڵام دۆڕاوو سەرنەکەوتوەکان، ئێمە هەمیشە حەز دەکەین لۆمەیان بکەین و رقیان بەرامبەر هەڵبگرین.. هەرچەندێك ئەو بەستەزمانانە لە کانگای دڵیانەوە سوێندمان بۆ بخۆن کە ویستوویانە هەوڵبدەن و تێبکۆشن، بەڵام سەرکەوتن خیانەتی لێکردوون، گاڵتەیان پێدەکەین و گوتەکانیان پشتگوێدەخەین. بەو شێوەیە تێڕوانینێکی گرنگ بەلاوەدەنێین کە دەبێت گرنگی پێبدەین و پەندی لێوەربگرین.

(سمیلز)ی نووسەری کتێبی (نهێنی سەرکەوتن) چیرۆکی ئەو سەربازە فەرەنسیەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ویستویەتی ببێت بە سەرکردەو لەئەنجامیشدا ئەو خەونەی هاتۆتەدی.. ئێمە لێرەدا دەمانەوێت لێی بپرسین: ئایا چەند سەرباز ویستویانە ببن بەسەرکردەو لەو پێناوەشدا هەوڵیان داوەو تێکۆشاون بەڵام سەرنەکەوتوون؟ تەنیا یەك سەرباز گەیشتۆتە مەبەستەکەی خۆی و بووە بە سەرکردە، (سمیلز)یش دڵخۆشەو هوتاف دەکێشێ و دەڵێت: تەماشای هێزی ئەو ئیرادەیە بکەن کەچۆن سەربازێکی سادەی گەیاندە پلەی سەرکردەیەك.. بەڵام ملیۆنان سەربازی لەیادکردووە کە لە شەڕگەکاندا کوژراون و خۆیان بە کوشتداوە لەپێناو ئەوەی یەك پلە سەربکەون لە سەربازیدا.

نووسەر بەو دارتاشەدا هەڵدەڵێ کە بەوشێوەیە خۆی ماندوو دەکرد لەگەڵ دروستکردنی کورسییەکەدا چونکە دەیویست ببێت بە قازی و لەکۆتاییدا لەسەریشی دانیشت.. لە ڕوانینی منیشەوە ئەو دارتاشە لەهەندێك لایەنەوە هیچ جیاوازیەکی نییە لەو هەژارەی کە بەلای سەبەتە دروستکەرێکدا دەڕوات و لێی دەپاڕێتەوە سەبەتەکە گەورەتر دروست بکات. ئەویش لێی دەپرسێت: ئەوە چی پەیوەندیەکی بەتۆوە هەیە.

هەژارەکەش گوتی: ((لەوانەیە یەکێك لە هاوڕێو خۆشەویستەکانم ئەو سەبەتەیە بکڕن و پڕ لە خورماوە پێشکەشی منی بکات)).

کڕینی هاوڕێیەکی هەژارەکە و پڕ لە خورماکردنی سەبەتەکەو پێشکەشکردنی هەروەکو ئەگەری سەرکەوتنی دارتاشەکەیە کە ببێت بە قازی.. (سمیلز) ئەوەی لەیاد کردووە کە ژمارەی ئەو دارتاشانەی بەئیرادەی خۆیان بوون بە قازی زۆر کەمترە لەو دارتاشانەی خراونەتە بەندیخانەوە لەلایەن دادوەرو قازیەکانەوە.. لەڕاستیدا ئەو کەسەی خاوەنی کۆمەڵێك توانا نیە بۆ گەیشتن بە پلەیەکی بەرز لەژیانداو هەوڵێکی شێلگیرانەش دەدەن لەجیاتی ئەوەی سوود بەخۆی بگەیەنێت زیان بەخۆیو ژیانی دەگەیەنێت. ئیرادە بەتەنها بەس نیە بۆ وەدەستهێنانی شتێك .. لەوانەیە لەڕێگای سەرکەوتندا بێتە بەربەستێك، چونکە مرۆڤ ئالەتێك نیە بۆ هەر شوێنێك بمانەوێت ئاراستەی بکەین.

هەموو سەرکەوتنێك تایبەتمەندێتی خۆی هەیە. هێزە دەروونیە نائاساییەکانی مرۆڤیش ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دروستکردنی ئەو تایبەتمەندیانەدا، هەر کەسێك بیەوێت بگاتە شتێكو لەدەروونیدا ئامادەباشی ئەو گەیشتنەی نەڕەخساندبێ زیانێکی گەورە بەخۆیو نەتەوەکەشی دەگەیەنێت.

(سمیلز) چیرۆکی ناپلیۆن وەکو نموونەیەك دەخاتەڕوو کاریگەرێتی و گرنگی ئیرادەش لەو سەرکەوتنەی ناپلیۆندا باس دەکات لەو بارەیەشەوە چەندین گوتەو وشە دەداتە پاڵ ناپلیۆن بۆ سەلماندنی بیروڕاکانی. بۆنموونە دەڵێت ناپلیۆن داوای کرد ووشەی (مەحاڵ) لە

فەرهەنگی زماندا هەڵبگیرێت. ڕۆژێك لێیان پرسی بەرزاییەکانی چیای (ئەلب) دەبێتە ڕێگر لە بەرەوپێش چوونی سوپاکەتدا. گوتی: ((پێویستە ئەو چیایە لەسەر زەوی هەڵبگیرێت)).

نووسەر لە زمانی ناپلیۆنەوە دەڵێت: (( من لەشەڕی (ئەرکۆلا)دا بە بیست وپێنج جەنگاوەرەوە سەرکەوتنم وە دەستهێناوە چونکە من فرسەتی شەکەتی و هیلاکی دوژمنم قۆزتەوە و دام بەسەریاندا، هەریەك لەو جەنگاوەرانەش زوڕنایەکم دابوونێ))... وادەردەکەوێت ئەو ناپلیۆنەی توانی چیاکانی ئەلپ لە سەر زەوی هەڵگرێت، نەیتوانی ئەو دڵۆپە بارانانە ڕاگرێت کە لە گۆڕەپانی(واتەرلۆ)دا، داباریـن و بوون بەهۆی ئەوەی نەتوانێت ماوەی نیو کاتژمێر گواستنەوەی تۆپەکانی دوابخات و ئەو تێکشکانە گەورەیەی بەخۆیەوە بینی.

کاتێك ناپلیۆن لە لاوێتیدا بە چیاکانی ئەلبدا سەرکەوت جموجۆڵ و گەشبینی و تواناکانی وایان لێکرد دەستەواژەی (مەحاڵ) لەکتێبەکانی زماندا هەڵگرێت .. بەڵام کاتێك لە شەڕی (واتەرلۆ)دا تێکشکا فەرمانیدا بە گەڕاندنەوەی ئەو وشەیە بۆ نێو فەرهەنگی زمان . لە وانەیە لەو کاتەدا کەشکستی خواردبوو لێمان بپرسیبا، دەیگوت :(کوڕم هەمووشتێك هەرچەندە سادەو ساکاریش بێت ئەگەر بارو دۆخەکەی تێکچوو دەچێتە قاڵبی(مەحاڵ)ەوە.

سملیز و ئەوانەی ئەو پێچ و پەنایە دەکەن تێکشکاندنی ناپلیۆن لە شەڕی(واتەرلۆ)دا دەیگێڕنەوە بۆ سەر لاوازی ئیرادەی ناپلیۆن لەو ساتە وەختەدا، دەڵێن ئەگەر ناپلیۆن ئیرادەی بەهێز بوایە، هەروەکو سەردەمی سەرکەوتنی چیاکانی ئەلب بەوشێوەیە تێك نەدەشکا. سملیز و ئەوانەی

تريش لەو شيكردنەوەياندا بۆ تێكشكاندنی ناپليۆن وەكو ئەو پيرانە وان باوەڕيان بەسيحر هەيە . ئەگەر يەكێكيان لەكارێكی سيحربازيدا سەرنەكەوت دەيباتەوە سەر چاك بەكارنەهێنانی سيحرەكە ياخود لاوازی خۆی لەئەنجامدانيدا .

سمليز دەڵێت: ((ناپليۆن زۆر زيرەكو بيرتيژ بوو كاتێك دەيڕوانييە يەكێك دەيناسی بۆيە بەدەگمەن لەهەڵبژاردنی پياوەكانيدا بەهەڵەدا دەچوو)) .

دەمانەوێت سەبارەت بەو سەرنجە وردەی ناپليۆن كە هۆكاری سەركەوتنەكانی بووە لە نوسەری كتێبی (نهێنی سەركەوتن) بپرسين: ئايا ئەو سەرنجە وردە لە ئەنجامی ئيرادەو هەوڵ و تێكۆشانی ناپليۆنەوە بووە ياخود سروشتيی بووە و هەر لەخۆيەوە بۆی هاتووە ؟

لەڕاستيدا ناپليۆن و سەركردە بيرتيژو سەرنج وردەكان ئەگەر ئيرادەو ئەنقەستيان لە كارەكانياندا بەكاربهێنايە لەوانەيە سوارچاكی و قارەمانی و سەركەوتنيان لەدەست بدايە .

ئەوانەی خاوەنی توانا دەروونيەكانن پێويستە بەگوێرەی پەيامەكانی ژيانيان هەنگاو هەڵهێنن، شێلگير نەبن و هەوڵنەدەن بەزۆر سوود لەو توانايەيان وەربگرن. هەرچەندێكيش ئەو هێزە دەروونيانەيان بەشێوەيەكی خوديانەو لە خۆوە هەڵبقوڵێن ئەوەندە پاڵيان پێوە دەنێت و هۆكارێكی كاريگەر دەبن بۆسەركەوتن و ڕێكخستنی كاروبارەكانی ژيانيان...

لێكۆڵينەوە نوێيەكانی دەروونناسی، بەتايبەتی توێژينەوەكانی قوتابخانەی(نانسی) لە فەڕەنسا. لەم دوايانەدا ڕاستيەكی گەورەی بۆ

ئاشکرا کردووین کە بیریارەکانی لەوەو پێش هیچ ئاگایەکیان لێ‌ی نەبووە .. ئەو ڕاستیەش ئاماژە بەوە دەکات کەئیرادە هەندێك جار ڕێگریێکە لە بەردەم سەرکەوتنی مرۆڤدا .ئەو کەسەش کە لەهەموو کاتێکدا ئیرادەی بەکار دەهێنێت بەبێ ئەوی هەست بکات زیان بەخۆی دەگەیەنێت .

ئەو ڕاستیەش بە یاسای(کویە) یاخود یاسای (هەوڵی پێچەوانە) ناودەبرێت . جێگەی داخە زوربەی لاوانی ئەم وولاّتە ئەو یاسا دەروونیەیان پشتگوێخستووە، زیادەڕەویەکی زۆر دەکەن لە بەفیڕۆدانی تواناکانیاندا کەپێویست بوو سوودی لێوەربگرن.

یاسای(کویە) لە دەستەواژەکەیدا زۆر سادەو ساکارە، بەلاّم لە گرنگیە پڕاکتیکیەکەیدا زۆر سوود مەندە .دەتوانین بەم لێکدانەوەیە ئەو یاسایە کورت بکەینەوە :

((ئەگەر بیرێك بەسەر یەکێکدا زالّ بوو، بەشێوەیەك ڕۆچووە قولاّیی عەقڵی ناوەوەی .. هەموو هەوڵێکی شێلگیرانە لەلایەن ئەو کەسەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرە دەبێتە هۆی ئەوەی پێچەوانەی ئەنجامەکەی وەدەست بێنێت)).

بۆ رونکردنەوەی ئەو یاسایە .نموونەی پاسکیل سوارێك دێنینەوە، کەهەمووپاسکیل سوارێکی تازەفێربوو دەیزانێت. پارچە بەردێك، یاخود شوشەیەك دەبینێ لەڕێگەکەیدا یەکسەر رووبەڕوی دەڕوات ..هەرچەندێك بیەوێت خۆی لێ دوربخاتەوە ئەوەندە روبەروی دەروات و لێ‌ی دەدات .. خودی خۆشی سەری سووڕدەمێنێت چۆن دەستەکانی سوکانی پاسکیلەکەی روەو ئەو بەردە، یاخود پارچە شوشەیە ئاڕاستە کردووە..

هەرچـەندە لـە زوربـەی کاتـەکانی تـردا دەسـتەکانی نـاتوانێت بەقـەد تاڵەموویەك ئاڕاستەی سوکانەکە وەرگێڕێت .

کاتێك لاوبووم ویستم فێری پاسکیل سواری بم ماوەیـەکی دوورو درێژ لێم دەخوڕی، بەڵام لەچارە ڕەشیم پیاوێکی هەژار سەبەتەیەکی پڕ لە کاهوی‌پێبوو هاتە سەر ڕێگام، هەر کەچاوم پیٚ‌ی کەوت بە دیقەتێکی زۆرەوە بـەرەو ڕوی چـووم، چرکەیـەکی نـەبرد مـن وپاسـکیل وکـاهوو پیاوەهەژارەکە بووین بەیەك شـت بەشـێوەیەك تێکـەڵاو بوویـن لەیـەکدی جیانەدەکراینەوە

(کویە) ئەو دەرکەوتە دەروونیە سەرسوڕهێنەرە بە(ململانیٚ‌ی‌ئیرادەو خەیاڵ) لێکدەداتەوە .یاخود بە واتایەکی دی :

ململانـیٚ‌ی هەست‌و نەست ..پاسکیل سوار کـاتێك شـتێك لـە بـەردەمیدا دەبینیٚ لە زیهنیدا دوو ململانێی دژەیەك پەیدا دەبێت :

یەکـەمیان ململانێیـەکی نەسـتیە، و هیـچ دەسـەڵاتێکی پاسـکیل سوارەکەی تێدا نییە کە پاڵی پێوە دەنێت ڕوەو ئەو شتە.. بەسـەر هۆشـی پاسکیل سوارەکەدا زاڵ دەبێت و دەیکاتـە کۆیلەیـەکی ملکـەچی خـۆی بـۆ هەر کوێیەك بیەوێت دەیبات .. بەڵام ململانیٚ‌ی دووەم . ئەو ئیرادەیەیە کە لە هەوڵی خۆلادانی بەرکەوتنی شتەکەدایە..هەرچەندێك ئیرادەکەی لە خۆ لادانـی بەرکـەوتنی ئـەو شـتەدا بـەهێزبێت، ئەگـەری بەرکەوتنەکـەی پـتر دەبێت .

واتـای ئـەوەش ئەگـەر ئیرادە پێچەوانـەی نەست بێـت زیـان بـەخش دەبێـت ... لـەو کاتـەدا پێویسـتە لەسـەر تـاك لـەو حاڵەتـەدا گویٚ‌نـەداو کەمتەرخـەم بێت. چونکـە چاکترە لـەوەی شـێلگیرو ئـیرادەی بـەهێزبێت.

هەموو کەسێك کەبیەوێت چاوی بە پیاوێکی گەورەو بەرپرس بکەوێت ئەو شـــتە دەزانێـــت چ کـــاتێك ویســـتویەتی ســـوور بێـــت لەســـەر چاوپێکەوتنەکەوخۆی بۆ ئامادە بکات لە ئەنجامدا لـەو چاوپێکەوتنـەدا سەرکەوتوو نەبووەو دەستکەوتی نەبووە.

(کویە) لەو باوەڕەدایە. لەحاڵـەتی بەرکـەوتنی ئـیرادەو نەسـتدا.. هێزی نەست لەبەرمهێنانی کارە خراپەکاندا پلە بە پلە زیاتر دەبێت..

دەتوانـین نمونەیـەکی دی لەوبارەیـەوە بهێنینـەوە: ئەگـەر یـەکێك بیـەوێت لەسـەر دیوارێکـی بـەرز یـاخود پـردی نێـوان دوو تـەلاری بـەرز بپەڕیتەوە.. دەبینین لەهـەموو هـەنگاوێکدا لاردەبێتـەوەو دڵیشـی پـڕ بـووە لـەترس.. ئـەو بەرلـەوەی پێلەسـەر پردەکـە دابنـێ خـەیاڵی کەوتنـە خـوارەوەی دەکـات. هـەر ئـەو خەیاڵەشـی هۆکـاری کەوتنـە خـوارەوەی دەبێت.

بەڵام ئەوانەی خۆیان راهێناوە لەسەر پەڕینەوە لە شوێنە بەرزەکانو چەند جارێك تاقیان کردۆتەوە، ئەوکاتە ئەگەری کەوتنە خوارەوەیـان زۆر کـەمتر دەبێت. چونکە لەوکاتـەدا ئـیرادەو نەسـت یـەك دەگرنـەوەو دەبـن بەیـەك..کـاتێك دەیانـەوێت بەسـەر پردەکـەدا بـڕۆن نەسـتیان پشـگیریان لێدەکات بەدەگمەن نەبێت خەیاڵی کەوتنە خوارە ناکەن.

هەندێك لە نووسەران گرنگی ئەو یاسایەیان زۆر گەورەتر کردۆتەوە لەژیانی پراکتیکیـدا... بـۆ نموونـە سـەرکەوتنی نـاپلیۆن لەجەنگـە یـەك لەدوای یەکەکانیدا دەگەڕێتەوە بۆ یـەکگرتویی ئیرادەو نەستی نـاپلیۆن.. سەلامە موسا لەو بارەوە دەڵێـت: ((نـاپلیۆن هیـچ کـاتێك بـیری لـە دۆڕانـدن نەکردۆتـەوە، ئەگـەر ئـەو کـارەی کردبـا وەکـو ئـەو کەسـەی لێدەهـات کـە

بەسەر پەتەكەدا دەڕوات‌و خەیاڵی كەوتنە خوارەوە دەكات. ئەو تەنها جارێك گومان لەدڵیدا دروست بوو ئەویش لەشەڕی (واتەرلۆ) بووبەهۆی تێكشاكاندن‌و دۆڕاندنی)). بەڵام لەهەموو حاڵەتێكدا زیادەڕۆییە ئەگەر سەركەوتنی ناپلیۆن لەجەنگە یەك لەدوای یەكەكاندا بەتەنها بگێڕینەوە سەر هاوتەریبی و گونجاندنی ئیرادەو نەست. سەركەوتنی ناپلیۆن و ئەوانی تریش چەندین هۆكاری هەیە كە لە ژماردن نایەن بەڵام گومانی تێدانیە گونجاندنی ئیرادەو نەست كاریگەرێتی‌یەكی لەرادەبەدەری هەیە لە سەركەوتنی مرۆڤدا. ئێمەش لەكاروباری رۆژانەماندا پێویستیمان بەو گونجاندن‌و تەباییەی نێوان ئیرادەو نەست هەیە. ئەو كەسانەشی ئەو گونجاندنە پشتگوێدەخەن لەژیانیاندا توشی زیانێكی زۆر دەبن.

مرۆڤ هەرچەندێك رووەو لایەنە جیاجیاكانی ژیان هەنگاو هەڵێنێت یاسای (كویە) بە ڕوونی و ئاشكرایی دەبینیێ بۆ نموونە : دەیەوێت ناوێكی دیاریكراو بڵێت، ئەو ناوە لە یادەوەریدا وندەبێت، هەرچەندێك ئەو بیەوێت بكەوێتەوە بیری زیاتر لە بیری دەچێتەوە. بەڵام كاتێك بێئومێد دەبێت لە گوتنی ئەو ناوە و وازی لێدێنیێ‌و دەچێتە سەر باسێكی دی، ناوەكە كوتوپڕ دێتەوە خەیاڵی... ئەو كاتێك ویستی نەهات، كاتێكیش پشتگوێیخست ئەو هاتەوە بۆ لای ..

مرۆڤ هەندێك جار دەیەوێت بنوێت، چەندین جار هەڵگێڕو داگێڕی خۆی دەكات و هەروەكو ئەوەی داوای شتێكی مەحاڵ بكات خەوی لێناكەویێ .بەڵام هەندێك جار كەنایەوێت بنوێت بەپێچەوانەوە لە ئۆتۆمبیل و چایخانەو شوێنە گشتیەكاندا خەوی لێدەكەوێت ...

زوربەی جارەکان یەکێك لە ئێمە نەیویستووە پێبکەنێت {بۆ نموونە ئەگەر لە پرسەیەکدا بوبێت(و)}. بەلاّم پێکەنین زۆری بۆ هێناوە، هەر چەندێك ئەو زیاتر ویستبێتی خۆی بگرێ و پێنەکەنێت، ئەوەندەی تر پێکەنین بەسەریدا زالّ دەبێت. لە ئەنجامی ئەوەشدا دەکەوێتە هەلّوێستێکی پڕ شەرمەزاریەوە..

هەندێك لەتاکەکانی کۆمەلّ(بەتایبەتی زەمەنێك بەر لە ئێستا) توشی ئەو شتە ببوون کە پێی دەگوترێت(میحنەتی شەوی زاوایی) ئەو پیاوەی لەو شەوەدا و بۆ یەکەمجار دەچێتە لای ژنەکەی دەبێتەقوربانیەك لە قوربانیانی ململانێی ئیرادەوخەیالّی..خەلّکی خەیالّیان بەوەهمەکانی شەوی زاوایەتی ئاخێندراوە{بەتایبەتی لە لادێکاندا(و)}...کاتێك دەچێتە لای ژنەکەی وادەزانێت کێوێك لەبەر دەمیدایە. چونکە چەندین شتی دەربارەی قورسیو گرانی ئەو شەوە بیستووە کەپێویستی بە قارەمانێتیو پیاوەتیەکی بێ هاوتاهەیە. خەلّکی تریش ڕۆلّیان هەیە لە گرانترکردنی میحنەتی ئەو شەوەدا، بە کۆمەلّ لەدەرەوەی ئەو ژوورەدا دادەنیشن کە بووك و زاوای لەخۆ گرتووەو چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی پالّەوانە سەرکەوتوەکەیان دەکەن[1]، لەبەر هێندەش زاوا بەوپەڕی ئیرادەوە

---

[1] من چەندین جار لە لادێکانی خۆماندا ئەو حالّتەم دیوە، جارێکیان ژن بەژنێك لەنێوان گوندی (خ) و (ق) کرا، زاوای ئێمەیان هەر لەئێوارەوە تەپاندە ژورێ و چەند کەسێك لە هەیوانەکەدا چاوەڕێی هاتنەدەرەوەی زاوایان دەکرد، یەکێکیان کلاشنکۆفێکی لەباوەشیدا دانابوو فیشەکێکی خستبووە بەرو ڕوی کردبووە گوندەکەی تر،

یـەكێكی تریـان دەمانچەیـەكی خسـتبووە بـەر پشـتێنی، گوێمـان لـە هـەموو قسـەكانی بووك وزاوا دەبوو، لـە شـەڕێكی منالآنـە دەچـوو لـە سەرشـتێك كـەمولْكی یـەكێكیان بـوو، ئـەوی تریـان دەیویسـت بـەزۆر لـێ ی وەرگرێت، چەند جارێك نوزەی گریانی بووكەكە بەرز دەبوەوە و دەنگـی لێدانیش دەگەیشتە گوێمـان ... پیـاوی دەمانچـە لـە پشـتوێن هەموو پێنج دەقیقە جارێك شەقێكی بەهێزی لە دەرگاكە دەداو بەزاوای دەگوت : ئەوە چیت كرد درەنگە وەرە دەرەوە، دواجار دەمانچەكەی دەرهێنـاو فیشـەكێكی وەبـەر نـاو بـەدەنگێكی بـەرزەوە بەسـەر زاوایـدا نەڕاند دوو دەقیقەی تر نەیەیتـە دەرەوە بـەر فیشـەكت دەدەم ..گوێمـان لە دوو سەگبابی زاوا بوو بەبووكەی گوت و زرمەی دوو پێلەقەش هات، مرخـەمرخ وگریـانێكی نیمچـە بیسـتراو هاتـەوە بـەرگوێ، هـەروەكو حـەیوانێك سـەر ببڕێت پـاش چـەند چركەیـەك تەپـەو گریـان و پێلەقـە كۆتـایی هـات، كـاكی زاوا دەركـەی ژوورەكـەی كـردەوە، بزەیـەكی هاتیْودەرپـەڕی بـۆ دالآنەكـە، ئـەو پیـاوەش كلآشـنكۆفەكەی لەباوەشدابوو ڕاپەڕیو چووە سەربانی دیوەخانەكەو روەو گوندەكەی تـر (٣٠)دانـە فیشـەكی گـڕداری تـەقاند. مـن هـەتا ئـەو كاتـەش هیـچ تێنەگەیشتبووم. پاشان بۆم ڕونبووەوە ئەو پەلە كردن و تەقەكردنە بۆئەوە بووە كە بە گوندەكەی ئەولای بسەلمێنن ئێمە بەر لەئێوە كلآوی شـەوی پیـاوەتیو زاوایـەتیمان فڕانـدووە جـارێكی تـر كوڕێكـی دی كەناوی (ش) بوو لەتەمەنی (١٨)ساڵیدا ژن بەژنیان بۆ كرد، گوندەكە بێ كارەبابوو، تەنها هۆكاری ڕووناككردنەوەش فانۆس و لۆكس بوو،

تێدەکۆشێت لەو شەوەدا بگاتە مەرامەکەی خۆیو سەرکەوتوبێت .. بۆیە لەو کاتەدا دەکەوێتە نێوان دوو ململانێی پێچەوانەی یەکدییەوە : ئیرادە بەهێزەکەی بۆ سەرکەوتن لەو شەوەدا، وە خەیاڵەناهەستیەکەی کەوێنەی سەرنەکەوتنی تەواوی لەبەردەمدا دەنەخشێنێ... ئەو ململانێ دەروونیەش بەشێوەیەکی ئاسایی بەکارەساتە جۆراوجۆرە خێزانیەکان کۆتای دێت..چەندین خێزان لەئەنجامی ئەوکارەدا هەڵوەشاوەتەوەو

---

لۆکسیش تەنها لە پرسەو شایدا هەڵدەکرا.. کە (ش) بەستە زمانیان تەپاندە ژوری بووکەوە، دەیزانی چاوەڕوانی دەکەن و ڕەنگە لەدرزی دەرگە دارەکەو (تاقە) یەك لەدوای یەکەکانی ژورەکەوە لێی بڕوانن لەناچاریدا لۆکسەکەی خامۆش کرد.. تۆوەرە ئەو دیمەنە بێنەپێش چاوی خۆت لاوێکی تەمەن(١٨) ساڵان، نەك هیچ جۆرە ڕووناکبیریو شارەزاییەکی بواری سێکسی نەبووبێت، بەڵکو تەنها جارێك بەر لە گواستنەوە بووکەخانی دیبێ و تەنها وشەیەکیشی لەگەڵدا نەگوتبێ لەلایەکی ترەوە چەند کەس لەدەرەوەی ژوورەکە چاوەڕێی هاتنەدەرەوەی بکەن و ڕەنگە تەماشاشی بکەن، دەبێ تووشی چ شڵەژان و حاڵەتێکی دەروونی هاتبێ: لەکۆتایدا لۆکسەکەی خامۆش کرد و ئەوەی نەدەبو ڕوویدا ڕوویدا، هەربەو شەوە بوکی بەستەزمانیان بەسواری تراکتۆر گەیاندە ئەو شارۆچکەیەی کە دوو کاتژمێر لە گوندەکەوە دور بوو چەندمانگێك تێپەڕی بووکە بەسەزمانەکە نەگەڕایەوە، پاشان بۆ هەتایە براکانی نەیاندایەوەو تەڵاق بە تەڵاق کران ..

تێکشکاوە، ئەو کارەی خەڵکی دەیانەوێت پێچەوانەی ویستی یاسای(توانای پێچەوانە) هەنگاو هەڵێنن خەڵکیش واراهاتوون بۆ چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتە پەنا ببەنە بەر چارە سەرە پزیشکیەکان و ئەو دەرمانانەش زۆر جار سوودێکی ئەوتۆی نابێت چونکە ناوەرۆکە ڕاستەقینەکەی بابەتەکە چارەسەر ناکات . چونکە ئەو حاڵەتە دەرکەوتەیەکی دەروونییەو تەنها بە چارەسەرە دەروونیەکان چارەسەر دەکرێت .

دەگێڕنەوە یەکێك لەوانەی تووشی حاڵەتێکی دەروونی خراپ هاتبوو چووە لای هاوڕێیەکی و باسی ئەو نەگبەتیەی خۆی بۆکرد، {کە لە کوردەواریدا پێی دەڵێن بەستن (و)}. هاوڕێکەشی دوعایەکی پێچراوەی دایەو پێی گووت: ((ئەو دووعایە زۆرکەس لەو حاڵەتەی تۆدا بەکاریان هێناوەو سودێکی زۆری هەبووەو بەتەواوی سەرکەوتوون)). ئەویش بە ئیمانێکی زۆرەوە دوعاکەی لەگەڵ خۆیدا بردو شەوی دووەم سەرکەوتوانە کارەکەی ئەنجامدا، دوای ئەوەو پاشماوەیەك دوعاکەی کردەوە بینی چەندین شتی هیچ و پووچی تێدا نووسراوە. کە فڕی بەسەر دەرمان و چارەسەرەوە نییە[1]. بەهەرحاڵ ئەو جنێوانەی هاوڕێکەی بۆی

[1] لە کۆمەڵی کوردەواری خۆشماندا زۆربەمان دەیان حاڵەتی(یاسای توانای پێچەوانە)مان بینیوە ... من برا ژنێکم هەیە ماوەی چەندساڵێك سەریەشەیەکی توندی گرتبوو، حەبی پاراسیتۆڵی وەکو گوڵەبەڕۆژە قووت دەدا ..برایەکیشم لەگوندێك مامۆستابوو، ئەوگوندە شێخ نشین بوو.ڕۆژێك براژنەکەم (٥) دیناری هێناو بەبراکەمی گوت: کەچویتەوە دوعایەکی سەریەشەم لای شیخ (...)بۆبکە ... ئەویش هاتەلای من و پێی گوتم چی بکەین؟ دانیشتین بە هەردوکمان دوعایەکمان بۆ نوسی و نوشتانمانەوە و لەبەرگی پاکەتێکمان گرت.. دوای گەڕانەوەی چوینە لای براژنەکەم و پێمان گوت: لەبەشی

**نوسیبوو سوودی لێوەرگرت.. ئەو کاتێك ئیمانی بەدوعای هاوڕێکەی هێنا خەیاڵی پڕبوو لە هیوای سەرکەوتن و وەهمەکانی بردنەوە. بەو**

---

سەرەوەی لەچکەکەتی بدورەو بابەسەر سەرتەوەبێت بڕوا بکەن وا بۆ (٢٠)ساڵ دەچێت سەریەشەکەی نەماوە.

چیرۆکێکی دی: ژنێك منداڵی نابێت دەچێتە لای مەلایەك دوعای بۆ بکات، مەلاش پیاوێکی ڕووناکبیر دەبێت پێی دەڵێت دادەگیان بچۆ بۆ دکتۆر، ئەویش دەست دەکات بەپاڕانەوە، مەلاش لەناچاریدا لە پارچە کاغەزێك شتێکی بۆ دەنوسێ و سێ گۆشەی دەکات و لە پەڕۆی دەگرێت، ژن و پیاوەکە ئەوەندە ئیمانیان بەدوعاکە دەبێت، پاش ماوەیەك گرێ دەروونیەکەیان دەکرێتەوەو منداڵێکیان دەبێت.. دوای چەند ساڵێك خوێندەوارێك دوعاکە دەکاتەوە دەبینێ لێی نوسراوە: ((دەزێی بزێ نازێی بە گونێمەوە)).

لەگوندێکی ئەو گەرمیانە کە ناوی قەیتولە گۆڕێك هەیە لەپەنای شاخی ئیمام زەنوردا پێی دەگوترێت(شەخسەکە).. ناو بانگی ئەوەی هەیە هەر ژنێك منداڵی نەبێت دەچێتە سەری و چەندرێ و ڕەسمێکی تایبەتیش هەیە لە سەردانەکەیدا.. لە یەکێك لەرۆژەکانی ساڵی(١٩٨٤)دا، پیاوێك هاتە گوندەکەو قوماشی دەفرۆشت گومانمان لێ پەیدا کرد پیاو خراپ بێت بە لەتیف ناوێکم گوت ئەمشەو بیبەرەوە ماڵی خۆتان بە لکو شەو قسەیلێ دەربێنیت.. شەوچوین و پاش ئەوەی دڵنیابووین پیاوێکی کاسبەو هیچی تر کەوتینە گفتوگۆوە یەکێك لەقسەکانی ئەوەبوو: کوڕێکی هەیەودەساڵە ژنی بۆهێناوە و منداڵیان نابێت.. لەتیف پێی گوت بۆ نایهێنی بۆ ئێرە شەخسێکی لێیە تایبەتە بەو کارە کابرای قوماش فرۆش بڕیاری دا بیهێنێ، پاش هەفتەیەك بووکەکەی هێناو بردیانە سەر شەخسەکە. من پێکەنینم بەو شانۆگەریە دەهات، پیاوەکەو بوکەکەی گەراندەوە بۆشار، پاش(٦)مانگ سەیارەیەك لەبەردەم ماڵی لەتیفدا وەستا پیکابێك شەکرو ڕۆن وبرنج و مریشك و وردەواڵەی لەگەڵ پیاوە قوماش فرۆشەکەدا خۆیان کرد بە ماڵی لەتیفدا، کە شەو چوینەوەلای و حیکایەت گەرم بوو پیاوەکە گوتی: شوکور بوکەکەم سکی(٥) مانگانە.. دەبێ لەو گرێ دەروونیانەی بوو کەکەی زیاتر چ شتێك لە پشت ئەو شەخسەو مناڵبونەوە هەبێت.

شێوەیەش ئیرادەو خەیاڵی یەکیانگرت لەکارکردندا و ئەو ئەنجامە داواکراوەی لێکەوتەوە.

ئێمە لە هەر کارێکدا لە زیهنماندا خەیاڵو ئیرادەمان ململانێی یەکیان کرد سەرکەوتوو نابین.. زیادڕەوی ناکەین ئەگەر بڵێین کەسیەتی سەرکەوتوو ئەو سەرکەوتنەی دەیەوێت لە خەیاڵیدا دروستی دەکات.. پێویستە لەسەر بەخێوکەران لەجیاتی ئەوەی هانی منداڵەکانیان بدەن ئیرادەی سەرکەوتنیان هەبێت هانیان بدەن لەزیهنیاندا خەیاڵی سەر کەوتن تۆمار بکەن. پێویستە پێیان بڵێن: ((ئێوە سەرکەوتوون)) لەجیاتی ئەوەی پێیان بڵێن: ((دەبێ سەربکەون)).

جێگەی داخە باوکانی ئەم وڵاتە منداڵەکانیان پێچەوانەی ئەو رێڕەوە پەروەردە دەکەن.. منداڵەکانیان هاندەدەن سەرکەوتنیان بوێت، لەو کاتەدا ئەوان بیر لە دۆڕاندن و ژێرکەوتن دەکەنەوە.

دەتوانین بڵێین چارە ڕەشی گرێیەکی دەروونیە، چونکە چارەڕەشەکان ئەو کەسانەن کەلە هەموو کاتێکدا خەیاڵیان لای سەرکەوتن و دۆڕاندنە.. ئەو سەرکەوتنی دەوێت و لەڕێگەیدا تێدەکۆشێت، بەڵام لەقوڵایی عەقڵی ناوەوەیدا وێنەی سەرنەکەوتن و دۆراندن و هەرەسی نەخشاندووە.. بۆیە هەروەکو ئەوکەسەی بەسەر پەتەکەدا دەڕوات ترسی کەوتنە خوارەوەی دڵی دەلەرزێنێ.. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە دایکانی ئەم وڵاتەش رۆڵێکی کاریگەریان هەیە بۆ گەشەپێدانی ئەو گرێیە لە زیهنی منداڵەکانیاندایە... دایکانی ئێمە هەمیشە دەگریو قوڕدەپێوێ و هاوار لەبەختەرەشەکەی خۆی دەکات. بەو شێوەیەش و بەبێئەوەی هەست بکات عەقیدەی بەدبەختی و چارە رەشی

دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکانی.. کاتێك پیاوەکەی لەکارێکدا زوڵمی لێدەکات لەلای منداڵەکەیدا داخی دڵی خۆی و ئازارو بێبەشی خۆی دەردەبڕێت.. ئەو شتەشی دایك دەیڵێت و دەیداتەوە بەگوێی منداڵەکانیدا بەتوندترین و کاریگەر ترین گواستنەوە دەژمێردرێت لە پێکهاتەی کەسیەتی منداڵدا..

دایکانی ئێمە وشەی( تەمەڵ) لە هەموو وشەیەك زیاتر بەکار دەهێنن، بەیانیو ئێوارە بەرامبەر منداڵەکانیان دەیڵێنەوە. کە لێشی دەدات پێی دەڵێت: ((تەمەڵ سەیری کوڕی فلانکەس بکە، ئەوسەردەکەویو تۆ دادەبەزیت...بەختەرەشەکەی منە تۆ واتەمەڵی و لەکوڕی کەس ناچیت).

دروشمی زۆربەی بەخێوکەرەکانی ئێمە لە دەستەواژەی (ببە.... مەبە) دا کۆبۆتەوە. بە منداڵان دەڵێن: (( تۆ لە منداڵی هیچ کەسێك ناچی... هەوڵبدە تا وەکو ئەوانت لێبێت)). ئەو ڕێگەیەش لە دوولاوە زیانی هەیە:

لەلایەکەوە: لە خەیاڵی منداڵەکەدا وێنەیەکی ڕەشبینی دەربارەی خودی خۆی دروست دەکات.. لەلایەکی دیشەوە هانی دەدات بۆ ئیرادەی سەرکەوتن.. بۆیە ئەو منداڵە بەستەزمانە دەبێتە قوربانیەك لە قوربانیانی یاسای (هەوڵی پێچەوانە).. لە عەقڵی هەستیاریدا سەرکەوتنی دەوێتو لە عەقڵی ناوەوەشدا هاندەدرێت بۆ ژێرکەوتن و دۆڕاندن.

یەکێك لە هاوڕێکانم. داخی دڵی خۆی بۆ ڕشتم سەبارەت بە خراپی هەڵسوکەوتو ڕەوشتی منداڵەکانی، هەرچەندێك بەگوێرەی بانگەشەی خۆی پەروەردەیەکی چاکی کردوون، ئەو پەروەردەیەشی بەم شێوەیە بۆ

باسکردم: ((ئامۆژگاریەکی زۆرم کردوون، هەموو کاتژمێرێك شێوازێکی پەروەردەم فێرکردوون، بەڵام بەداخەوە بە پێچەوانەی ئەوەی من دەمەویێت گەورەبوون)). بەڵگە نەویستە ئەو ئامۆژگاریە زۆرانە پەروەردەی منداڵەکانی تێکداوە.

دەگێڕنەوە باوکێك سەرکۆنەی کوڕەکەی دەکرد کاتێك لەخوێندن دواکەوتبوو. پێی دەگوت: ((ناپلیۆن لە تەمەنی تۆدا لە پۆلی پێنجەمدابوو، بەلام تۆ تازە بەتازە لە پۆلی دووەم دای)) کوڕەکەش لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: ((بەڵام باوکەگیان ناپلیۆن کاتێك لە تەمەنی تۆشدا بوو، بوو بوو بە ئیمبراتۆر)).

ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە کەوەڵامی کوڕەکە لەڕاستیەوە نزیکترە هەتا پرسیاری باوکەکەی .. خراپترین شت کە بەخێوکەرانی ئێمە ئەنجامی دەدەن سەرکەوتنی منداڵی خزمو ناسیاوەکانیان وەکو نموونە بۆ مناڵەکانیان بهێننەوە و هانیان بدەن وەکو ئەوان بن.. چونکە هەموو مرۆڤێك پێکهاتەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە .. بۆیە هەرچەندێك هەوڵبدات ناتوانێت وەکو خەڵکانی تری لێبێت.

کاتێك باوکێك لە یەکێك لە لایەنەکانی ژیاندا کوڕی یەکێکی تر دەبینێ سەرکەوتووترە لە کوڕەکەی خۆی، لۆمەی دەکات و ئیهانەی دەکات، دەیەوێت کوڕەکەی لەسەر هەمان ڕێڕەوی ئەو منداڵە سەرکەوتووە بڕوات سەرەرای جیاوازی لەنێوانیاندا لەلایەنی بەهرەو تواناکانەوە. لەوکاتەدا کوڕەکەی هەست دەکات لە خەڵکی تر کەمترە و پێویستە هەوڵێکی زۆربدات بۆ گەیشتن بەوانی دی بۆیە دەردو مەینەتیەکی زۆر دەچێژێ بۆ ململانێی نێوان ئیرادەو خەیاڵی لەنێو

دەروونــی خۆیـدا.. لـە کۆتایشـدا تووشـــی نوشووســتی و ســەرنەکەوتن دەبێتەوە.

بــاوك کــاتێك دەبینــێ پیشــەی پزیشــکی پــارە و پایەیــەکی زۆر دەبەخشێتە خاوەنەکەی بـە هـەموو توانایەکیـەوە هـەوڵدەدات کوڕەکـەی بگاتـە کۆلێـژی پزیشـکی. ئـەو لـەو باوەڕەدایە کوڕەکـەی ئەگـەر شـێلگیر بێـتو هـێزی ئـیرادەی بخاتـە کــار دەتوانێـت لــە خوێندنــی پزیشــکیدا ســەرکەوتووبێت.. هەمیشـــە ئامۆژگــاری کوڕەکــەی دەکــات پزیشــکێکی لێهاتوو بێـت و پـێی دەڵێـت: ((ئایـا کـوڕی ئـەو هیـچ و پوچـە لـەتۆ باشـتر بوو، ئەو ئێسـتاکە لـە بەناوبانگترین پزیشـکەکانی ئـەم شـارەیە، هـەموو ڕۆژێکیـش پارەیــەکی زۆری دەســت دەکــەوێت)). بــەو شــێوەیە کــوڕە بەســەزمانەکەی دەخاتــە نێــوان دوو بەرداشــەوە. لەوانەیــە ئــەو کــوڕە ئـارەزوی لـە شـیعر یـاخود پـارێزەری یـان دارتاشــی بێــت، بچوکــترین ئارەزوشی لەخوێندنی نەخۆشیەکانو شیکاری نییە.. ئەگـەر بـە زۆریـش کـرا بـە پزیشـك زیـانێکی زۆری بـۆ خـۆی و نەتەوەکـەی دەبێــت. لەوانەیـە ژمارەیەکی زۆر لە بێتاوانان بکوژێت. چونکـە پزیشـکی نـەزان جـەلادێکی چاکە.

کۆمەڵگەی مەدەنی لە بنیاتنانی شارستانیەتە ئاڵۆزەکانیدا پشت بە زۆری تایبەتمـــــەندێتیو دابەشــــــکردنی کارەکــــــان دەبەســــــتێت. لەوکۆمەڵگەیەدا منداڵ لەلایەن باوکانەوە هانئادرێن بۆ لاسایی کردنەوەی کەسـانی دی... هـەموو منداڵێـك ئامـادەکراوە لـە یــەکێك لــە لایەنــەکانی شارستانیەتدا تایبەتمەندی وەربگرێت و بەگوێرەی تواناکانیهاوکاربێت لە بەرهەمهێنانی، کەلتوورێکی کۆمەڵایەتیدا... بۆیە پێویستە باوکەکان

لە کاتی گەشەکردنی منداڵەکانیاندا چاودێرییەکی وردی منداڵەکانیان بکەن بۆ ئەوەی ئەو بوارە بدۆزنەوە کە لەبەژەوەندی منداڵەکانیاندایەو یارمەتیشیان بدەن.

ئەو کەسانەی هانی منداڵەکانیان دەدەن بۆ لاسایی کردنەوەی کەسانی دی لەڕاستیدا بیابان نشینن و لە بەرگی شارنشیندان. چونکە کۆمەڵگەی بیاباننشین لەسەر جۆراوجۆری تایبەتمەندیەکان دروست نەبووە، بەڵکو کۆمەڵگەیەکی داگیرکاریو تاڵانو بڕۆیە.. ژیانی بیاباننشینیش لە زۆربەی کاتەکاندا بە نەمری هێشتنەوەی ئازایەتیو بەخشندەییە.. بیاباننشینێك لە لایەکەوە تاڵان دەکات و لەلایەکی دیکەوە ئەوەی تاڵانی کردووە دەرخواردی میوانەکانی دەدات. بۆیە پێویستە لەسەر باوکێکی بیاباننشین هانی کوڕەکەی بدا لاسایی خەڵکانیتر بکاتەوە. چونکە تەنها تایبەتمەندیو پسپۆڕیەك هەیە کە دەبێت سەرجەم تاکەکانی هۆزەکە فێری بن. هەر کەسێکیش لەو پێوەرەدا سەکەوتوو نەبوو، مافی مانەوەی لێوەردەگیرێت. لە بیاباندا لە بەهێزەکان زیاتر کەسیدی مافی مانەوەی نییە، بخواتو نەخورێت.. بەو شێوەیە بیابان یەك جۆرە مرۆڤ دروست دەکات ئەوانیش پاڵەوانە میهرەبانەکانن، بۆیە منداڵی بیاباننشین ناچارە یان ببێتە پاڵەوانێکی میهرەبان، یاخود بمرێت، چونکە پاڵەوانەکانی دی دەیخۆن.

بەڵام کۆمەڵگەی مەدەنی پێچەوانەی ئەوەیە، پێویستی بە هەوڵی هەموو تاکێك هەیە. لاوازو بەهێز... هەموو تاکێك بواری خۆی بۆ رەخساوە کەلەوێدا بەرهەم بهێنێت، هەروەها ئەو پسپۆڕیەی تێیدا دەبێتە داهێنەر.

بەکورتی دەڵێین: شێوازی پەروەردەی بیابانشین لەبەخێوکردنی منداڵانی شاردا دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی نەوەیەکی پڕلە گرێی دەرونی... هەر ئەوەشە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بە دەستیەوە دەناڵێنین..

کاتێك منداڵ لەسەر ئەو ڕێڕەوە پەروەردە بکرێت ئارەزووی لاسایی کردنەوەی هەموو سیفەتێکی هەیە کەلە کەسانی تردا دەیبینێ و وبەدڵی دەبێت. ئەو کاتێك ڕۆیشتن و جموجوڵ، یاخود شێوەی گفتوگۆی یەکێك لە مامۆستاکانی سەرنجی رادەکێشێت هەوڵدەدات لاسایی بکاتەوە و کە بەهۆیەوە دەبێتە جێی پێکەنینی خەڵکانی تر.

جارێکیان یەکێك لە هاوڕێکانم بینی وەکو قەلەڕەش دەڕۆیشت لە هەنگاوەکانیدا بازی دەدا، دوای ئەوەی پرسیاری ئەو هەڵسوکەوتەم کرد گوتیان ئەو هاوڕێیە کاتێك خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بووە، ڕۆیشتنی یەکێك لە مامۆستا بێگانەکانی سەرنجی ڕاکێشاوە و لاسای دەکاتەوە. لە کۆتایدا هەردووجۆرە ڕۆیشتنەکەی(خۆیو مامۆستاکەی) لە بیرچووەوە.

## تووشی هەڵە نابین ئەگەر بڵێین لاساییکردنەوە دوو جۆری هەیە :

ئیرادی و نائیرادی.. کەسیەتی مرۆڤیش لەگەشەکردنیدا پێویستی بە لاسایی کردنەوەیەکی نائیرادی هەیە، بەشێوەیەك ئەو سیفەتە لاسایی کراوە بچێتە پێکهاتەی کەسیەتیەکەیەوە و بەرەنگەکانی رەنگرێژ بکرێت، بەشێوەیەك ببێتە بەشێك لەو، بەڵگە نەویستە هەموو منداڵێك بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێك و گەورەبێت ناچارە لاسایی یەکێك بکاتەوە.. بەلام ئەو لاسایی کردنەوە پێویستە بۆ بنیاتنانی کەسیەتی مرۆڤایەتی، لاسایی

کردنەوەیـەکی نائـیرادیو بـێ ئەنقەسـتە. بەواتایـەکی دی مـرۆڤ بـەبێ مەبەست و بەبێئەوەی خۆی بیەوێت لاسایی دەکاتەوە. لەڕاستیدا ئەو لاسـایی کردنەوەیـە ناونـانرێت(لاسـایی کردنـەوە) بـەو واتایـەی لـەنێو کۆمـەڵانی خـەڵکداباوە. چونکـە ئـەوە هەرسـکردنی لاسـایی کراوەیـە و ئاوێتـەکردنی پێکهاتـەی کەسیەتییە...هەروەکوئەوەی پارویەکی خـواردن پاش هەرس کردنی تێکەڵاوی لەش دەبێت.

بەڵام لاسایی کردنـەوەی ئیرادی.. ئەوەیە ئێمە منداڵەکانمانی بـۆ هاندەدەین.. ئەم جۆرە لاسایی کردنەوەیە وەکو پێکەوەلکاندن وایە ولـە دەرەوە پێوەی گرێبدەین.

کەسـیەتی تـاك تێکڕایـیو گشـتگیریە. خـاوەنی پێکهاتـە یـەکی هەمەلایەنەیـە و سـەرجەم پارچـەکانی گرێدانێکـی زنجـیرە بـەندیان لەنێواندایە، گەشە پێدانی کەسیەتیش تەنها بە برەو پێدانیەتی لەناوەوە.

مرۆڤی پێگەیشتووش کاتێك سیفەتی کەسـیەتیەکی تـر سـەرنجی رادەکێشێت بەلایەوە گرنگ نییە لاسایی بکاتـەوە، بەڵکو وەری دەگرێو لـێی دەگەڕێ لـە گەنجینـەی عـەقڵی ناوەوەیدا بچنـە سـەریەك، ولـەکاتی خۆیـدا دێنـەدەرێ، هەروەکوشـتێکی نـوێ بێـت. چونکـە لـەکاتی هاتنـە دەرەوەیدا بە کەسیەتیە تایبەتیەکەی خۆی بۆیە دەکرێو دەبێتە بەشێکی جیانەکراوە لێی. بۆ نموونە: یەکێك لە ئێمە دەیەوێت کەسیەتیەکی رۆح سووك و پێکەنیناوی هەبێت، وادەزانێت ئەو کارە بەدەستی خۆیـەتی، ئەو کاتێك نمایشکارێکی هەزەلی و روح سـووك لـە سـەر شـانۆ یـا خـود لەدانیشتنێکدا دەبینێ نوکتە دەڵێت و دانیشتوان پێدەکەنن.. دەیەوێت لاساییان بکاتـەوە.. بۆیـە چەندین نوکتـە زۆر بەچاکی لەبەر دەکات ولـە

هەموو کۆڕو دانیشتنێکدا دەیڵێتەوە، جار لە دوای جارو هەرچەندێك بیەوێت رۆح سووك بێت و خەڵکی پێبکەنن ئەوەندە چارەگران و خەڵکی بێزار دەکات... نوکتە کردن نەلەبەر دەکرێت و نەلاسایی دەکرێتەوە، کەسیش ناتوانێت بەئەنقەست دروستی بکات. نوکتەبازی باش نازانێت پاش چرکەیەك چی دەگێڕێتەوە... زۆربەی جاریش ئەگەر داوای نوکتەیەکی لێبکەن هەرچەند بکات و بکۆشێ ناتوانێت تەنها نوکتەیەکیش بکات. بەڵام کاتێك پەیامی نوکتەی بۆ دێت چەندین نوکتەی جوانی یەك لەدوای‌یەك دروست دەکات. هەروەکو ئەوەی کاتێکی زۆر خۆی بەئامادە کردنیانەوە تەرخان کردبێت..

لە ڕاستیدا ئەو نوکتانە لەبەر دەکات و لەعەقڵی ناوەوەیدا کۆی دەکاتەوە و لەبیری دەکات، هەتاکاتی خۆی دێت ئەو نوکتانە هەرلە خۆیانەوە دێنەدەرێ، ئەویش بەو لێهاتووەی خۆی دەیڕازێنێتەوە و دەیخاتە سەری و تامێکی نوێی دەداتێ و بەتەواوی لەگەڵ دانیشتنەکەدا دەیگونجێنێ.

دەتوانین ئەو نموونەیە بۆ هونەرمەندیش بهێنینەوە. هونەرمەندی لێهاتوو بەشێوەیەك دەچێتە دەقە هونەریەکەوە کاتێك دەچێتە سەر تەختەی شانۆ خۆشی نازانێت چی دەکات. ڕاستە ئەو ڕۆڵە کەی خۆی لەبەر دەکات، بەڵام فرمانی ئاماژەکاری‌و چۆنێتی دەربڕین و جووڵە بۆ سروشتی ساتەوەختەکان و کێشە دەروونیەکان جێ دەهێڵێ کەلە تەماشاکەرانەوە بۆی دێن... ئەو لەو کاتانەدا وەکو گوتار خوێنێکی لێدێت کەلە ئاو هەوایەکی دەروونی باڵادا لە هۆڵەکەدا دەتوێتەوە و خۆی لەیاد دەکات.. بەڵام هونەرمەندی دۆڕاو و سەرنەکەوتوو شانازی بە

خۆیــەوە دەکــات، ئیرادەکەشــی دەبێتــە پەردەیــەکی ئەســتورو نایــەڵێت تیشـکی بینـەرو دانیشـتووان بگاتـە قوڵایـی دەروونــی.. ئــەو دەیــەوێت لاسایی یەکێك لە هونەرمەندە بەناوبانگەکان بکاتەوە، بۆیە هـەروەکو ئەو هاوڕێ قەلەڕەشەی بەسەر دێت کە هەردوو ڕۆشتنەکەی بیر چووەوە.

ئیرادە لەو جۆرە کارانەدا پێچەوانەی مەبەستی ویستراوە. باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی هونەرمەند و ناهونەرمەند لـە ڕووبەڕو بوونـەوەی بینـەرو ئامادە بووانـدا بیگرنەبـەر، دەسـتبەرداری ئیرادەکـەیان بـن و لـە قوڵایـی دەروونیـاندا ئیلهامـەکان بێنـە دەرێ.. لـەو کاتـەدا دەروون، دەنگدانــەوەو ڕەنگدانەوەی دەروونی ئامادەبوان لە سۆزو هەڵچونەکان وەردەگرێ.

لەهـەموو کارێکدا کە سوارچاکیو باڵا دەستی پشت بە هێزەکـانی عەقڵی ناوەوە ببەستێت، پێویستە بەشێوەیەکی لەخۆوە و بێ خۆ ماندوو کردن بێتە دەرێو بە هیچ شێوەیەك شێلگیری و سوور بوون لەئەنجامدانی ئەو کارەدا بەکارنەهێنرێت. هـەر کەسـێکیش ئـەو ڕاسـتیە گەورەیـە لـە ژیـانیدا نـەزانێت پێویسـتە دان بـەوەدا بنێـت کـە بێتوانـاو بێدەسـەڵاتەو گۆڕەپانەکە بەجێ بهێڵێ.

لەمەو بەر گوتمان بێ بەختی گرێیەکی دەروونیە و لە نەستی مرۆڤدا گەورە دەبێت و وا لە خاوەنەکەی دەکات بۆ هەموو هـەنگاوێکی، خـەیاڵی وێنەیـەکی دۆڕانــدن و ســەرنەکەوتنی بــۆ دروســت بکــات. هــەر وەکــو گوتیشمان ئەو گرێ دەروونیە دوو پایەی هەیە: لەلایەکەوە خاوەنەکەی هاندەدات بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتن و هـەوڵی بۆ دەدات.. لە لایـەکی ترەوە لەخەیاڵیدا دۆڕانو سـەرنەکەوتن تۆمـار دەکـات و هـەموو چرکەیـەك چاوەڕێی دەکات.. هەروەها ئەوەشمان باسکرد کە بەخێوکەرەکانی ئێمە

چـۆن و بـەچ شـێوەیەك ئـەو گرێیـە لـەدەروونی منداڵـەکانماندا دروسـت دەکەن و چۆن هانیان دەدەن بۆ ئیرادەی سەرکەوتن و پاشـان وێنەیـەکی ژێرکەوتن لە خەیاڵیاندا دروست دەکەن... شارستانیەتی ڕۆژ هـەڵاتیش بـە هەموو پێگەکانیەوە هاندەرێکی چاکە بۆئەوەی لە زۆربەی بەها فیکریەکان دا ئەو گرێیە لە عەقڵی کۆمەڵانی خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە.

پیاوێك دەناسم لە هەموو پڕۆژەیـەکی ژیاندا کە دەیـەوێت ئـەنجامی بدات باس لـە ڕەشبینی و سـەر نەکەوتنی ئـەو پڕۆژەیـە دەکـات، ئەگـەر برادەرێکـی پرسـیاری پڕۆژەکـەی لـێبکات دەڵێـت: ((دڵنیـام تێیـدا سەرکەوتوو نابم و زەرەرمەند دەبم)).. جارێکیان لێم پرسی: تۆ بۆچی لـە هـەموو کـارێکدا ئـەوەندە ڕەشـبینی؟ پـێی گـوتم: ((چـاوەڕوانکردنی سەرنەکەوتن باشترە لەوەی من هەمیشە چاوەڕوانی سەرکەوتن بم، بەو کارەم دەروونی خۆم رادێنم لەسەر دان بە خۆدا گرتن، ئەگەر لە کارەکەدا سەرکەوتوو نەبووم)). لەدواییدا ئەم پەرەگرافەشی خستە سەر: { زیانی ئەو دوو وشەیە دەبێ چی بێت ( ڕەشبینی و گەشبینی)، ئەگەر ئەو کارە لە نێوچەوانی نووسرابێت سەرکەوتوو، یان سەرنەکەوتوو بێت؟. چونکە چارەنووس بوارێکی هەیە، ئەو وشانەشی من دەیڵێم هیچ کاریگەرییەکی نییەو بە هەوادا دەچێت}.

ئەو بۆچوونە زۆر زەرەرمەندە بۆ مرۆڤ، جێگـەی داخـە دەبینین بـە شـێوەیەکی زۆر بـەنێو کۆمـەلانی خـەڵکدا بـڵاو بۆتـەوەو ڕۆچوەتـە عەقڵیانەوە.

لەوانەشـە لـە ئەنجامـەکانی فەسـلەجەی عـەقڵدا بێـت کەلـە سەردەمەکۆنەکانەوە بۆمان بەجێماوە... خەڵك وادەزانن سەرکەوتن هەوڵو

ئیرادەو بیرکردنەوەی دەوێت...قسەکردنیش هیچ سوودو زیانێکی نییە بۆ مرۆڤ... ((گۆتە)) لەڕوانینی ئەوانەوە گەڕەلاوژەیەکی کوتوپڕەودەچێتە هەواوە و پاشان بۆهەتایە ون دەبێت وەك ئەوەی هەر نەبووبێت.. بەلاّم لەواقیعدا ئەو قسانەی ئێمە لە خۆمانەوە دەیکەین زۆر بە هێزترن لەو سەلماندنە لۆژیکیانەی کە دەمانەوێت لە ڕێگەیەوە قەناعەت بەعەقلّی خۆمان بکەین.. سەلماندنی لۆژیکی زۆربەی جارەکان سنووری عەقلّی هەستیاری پتر تێناپەڕێنێت. بۆیە زۆربە کەمی نەبێت کار ناکاتە سەر خەیالّی مرۆڤ.

بەلاّم ئەو وشانە لە خۆمانەوە دەینێرین دوای ئەوەی چەندین جار دووبارە و سێبارەمان کردەوە دەچێتە قولاّیی نەستەوەو بەبێ ئەوەی ئاگامان لێبێت کاریگەرێتیەکی بەهێزی دەبێت لەسەر چارەنووسمان.

یەکێك لە نەنگیەکانی سەلماندنی لۆژیکی ئەوەیە ناتوانێت لەدەروونی مرۆڤدا عەقیدەیەك دروست بکات. چونکە عەقیدە ئەنجامی راهێنانو دووبارەکردنەوەو تەلّقیندانە. بۆیە دەبینین بیریارو گوتار خوێنەکانمان دەگمەن نەبێت ناتوانن لەرەوشتی خەلّکیدا شوێنگۆڕکێ بکەن یاخود عەقیدەکەیان بگۆڕن. ئەوان هەمیشە لەهەولّی ئەوەدان لەڕێگەی مشتومڕو هێنانەوەی بەلّگەوسەلماندنە لۆژیکیەکانەوە قەناعەت بە کۆمەلاّنی خەلّك بکەن. بەلاّم خەلّکیش بەگوێرەی بارودۆخە فیکریو کۆمەلاّیەتیەکانیان و لەسەر بنەمای ئەو شتەی لە عەقلّی ناوەوەیاندا تۆمارکراوە لە (بیرو دابو نەریت) هەلّسوکەوت دەکەنو هەنگاو هەلّدەهێنن.

هێتلەر بەهۆی قەناعەتە لۆژیکیەکانیەوە ئەو روحی فیداکاری و شێلگیری و توندڕەویە سەرسوڕهێنەرەی لە نێو گەلی ئەڵمانیدا بڵاو نەکردەوە، بەڵکو بەهۆی خۆڕاهێنان و دووبارەکردنەوەو تەڵقیندانیانەوە بوو کە لە بۆنەو کۆبونەوەو خۆپیشاندانەکانەوە دەیگەیاندە گوێی گەلی ئەڵمانیا، لەو شوێنانەدا مۆسیقا لێدەدراو لایەنگران هوتافیان دەکێشاو ئالاکان بەرز دەبونەوەو فڕۆکەکانیش بە دەنگەکانیان ئاسمانیان پڕدەکرد.

وشەی ((دووبارەی بکەرەوە)) جار لەدوای جار بۆ خۆت بڵێ لە قسەکانتدا، دەبێتە هۆی ئەوەی جۆرێك لە باوەڕ لە عەقڵی ناوەوەتدا تۆمار بکات.. ئیمان و باوەڕیش هەروەکو دەڵێن چیا دەلەرزێنێ.

هەندێك لە ڕەخنەگرانی قورئان دەڵێن: چیرۆك و ئایەتەکان و خوداو دەسەڵاتەکانی لە گەردووندا جار لە دوای جارو لەهەموو لاپەڕەکاندا دووبارە بونەتەوە... ئەوانە ئاگایان لەوەنییە کە ئەو دووبارە کردنەوەیە لە عەقڵی عەرەبدا ئەو ئیمان و باوەڕە بەهێزەی تۆمار کردووە، و بەهۆیەوە عەرشی قەیسەرو کیسرایان تێکشکاند.

هەندێك لە بیریارە موسڵمانە نوێخوازەکان دەڵێن قورئان پەرجووی (محەممەد) پێغەمبەرە.

زاناکانی دەروونناسیش پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکەن. چونکە قورئان داهێنانێکی نوێ و بەرزترین هونەرەکانی ڕاگەیاندن بوو، هەتا ئەوکاتە جیهان شتێکی هاوشێوەی نەدیتبوو. جیاوازیەکی گەورەی هەبوو لە زۆربەی کتێبە پیرۆزەکانی لەوەوبەر..

پێدەچێت پێغەمبەر زانیبێتی کاریگەرێتی وشە چەند بەهێزە لە ژیانی مرۆڤدا، هەربۆیە گوتوویەتی: ((گەشبین بن لەسەر خێر بەدەستی

دێنـن)).. ئـەو گوتـە بـەرزەش لـەناوەڕۆکدا هیـچ جیاوازیـەکی نییـە لـەو شتانەی زاناکانی دەروونناسی لەسەردەمی ئەمڕۆماندا دەیڵێن.

له قورئانیشدا ئایەتێك هەیە پەیوەندیەکی زۆری بەم بابەتەوە هەیە که دەڵێت: ((و أما بِنِعْمَةِ رَبِّك فَحَدّثْ)).. بەڵگەنەویستە قسەکردن لەبارەی نیعمەتەوە زۆرتری دەکات.

شارستانیەتی ڕۆژهەڵات بەپێچەوانەی ئەو شتەوە که قورئان دەیڵێ نـەوەکانی ڕادەهێنێـت .. هیـچ کەسـێك بـاس لەنیعمـەتو خۆشـحاڵیو خۆشگوزەرانی ناکات... ناوێری پرسیار له ژنێك بکەیت منداڵەکەت چۆنە، یـاخود پـێی بڵـێی منداڵێکـی لـەش سـاغو زیرەکـت هەیـە، دەبینـی دەشڵەژێو {"قل اعوذ برب الفلق" )ێکی بۆ دەخوێنێ(و)} یـاخود بـە رووتا هەڵدەشاخێو دەڵێت: " ئەو شتەی تۆ دەیڵێی وانیە، کوڕەکەم زۆر لاوازو نەخۆشەو خێر له ناو چەوانیدا نیە" .

دایك بەتەنها له قسەکەی تۆ ناترسێت ، بەڵکو له قسەکانی خـودی خۆشـی دەترسێت ... ئـەو حـەزناکات بیر لـەوەش بکاتـەوە کـە کوڕەکـەی لـەش سـاغو زیرەکـە، چونکـە بـەگوێرەی بانگەشـەی خـۆی دەبێـت بـە چـاوەوە.. بـەلام هەرکەنیشـانەیەکی بچووکـی نەخۆشـیەك، یـاخود دەرکەوتەیـەکی تەمبـەڵی تێـدا شـك ببـات دەسـت دەکـات بـەهاوارو سکالاکردنو دنیا تێدەگەیەنێت لەو بەختە ڕەشەی که خۆیو منداڵـەکانی گرتۆتەوەو وەکو خەڵکی تر نین...

ئێمـە وا راهـاتوین لـە هـەموو شتە باشو چاکـەکان بترسینو باسـی لێـوە نەکـەین.... ئـەو خـوو ڕەوشـتەشمان چـەندین هۆکـاری دەروونـیو کۆمەلایـەتی هەیـە کـە لـە هـەموو شارسـتانیەتەکانی دی پـتر هەسـتی

پێدەکرێت. هەربۆیە بڕوابون بە (بەخت) لە نێوانماندا بڵاوبۆتەوەو بەدبەختەکانیشمان زۆرن .

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە شارستانیەتی ئێمە وامان لێدەکات نەك تەنها بیر لە سەرنەکەوتن بکەینەوە، بەڵکو ڕامان دێنێت ئەو سەرکەوتنەش بەبێ خۆ ماندوکردن بۆ مان دێت پشتگوێی بخەین و سوودی لێوەرنەگرین... ئەو گوتەیەی لە نێوانماندا بڵاوبۆتەوە: "پاداشت بەگوێرەی خۆماندووکردنە" .. لە ڕاستیدا ئەو پەندە واتایەکی ئاینی هەبووە، سەرداران و پیاوچاکانی ئاین لەسەردەمەکانی ڕابردوودا لەپێناوی خودادا تێکۆشاون و زەحمەت و ئازاریان چەشتووە بۆئەوەی پاداشتێکی چاکتر وەربگرن.. بەلام ئەو واتایە لە چەمکی یەکەمجاری تێپەڕاند (سنوورە ئاینیەکەی) لەلای کۆمەڵانی خەڵك بۆتە ئامۆژگاریەك و لەزۆربەی کارەکانیانداو بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن لەژێر کاریگەرێتیەکەیدان.

هەروەکو گوتمان: عەقڵی ناوەوە ڕێپیشاندەری مرۆڤە بۆ زۆربەی سوودمەندیەکانی، کە ناتوانێت بە عەقڵ و هەوڵی بەردەوامی پێی بگات.. کەواتە ئێمە لەژیانی پراکتیکیماندا پێویستیمان بە ئامۆژگاریەکی پراکتیکی هەیە پێچەوانەی ئەو ئامۆژگاریە بێت کە دەڵێت: ((سەرکەوتن بە گوێرەی خۆماندووکردنە)).

بۆیە دەکرێت بڵێین سەرکەوتنی مرۆڤ بەگوێرەی هێمنی و زیادڕەوی نەکردنە لە خۆماندووکردندا.. بۆ ئەوەی ئەو ڕووناککەرەوەداهێنەرانەمان دەستکەوێت کە لەنەستمانەوە هەڵدەقوڵێن. زۆرجار چەندین هەڵی زێڕین وەکو هەورەبروسکە بەلاماندا تێدەپەڕێت کە

دەگاتــە لامــان زۆر لەســـەرخۆیە بــۆ دەســـتەمۆکردن، بـــەڵام کـــە دوردەکەوێتـەوەو سوودمان لـێوەرنەگرت زۆر گران دەکەوێتە سـەرمان.. پێویستە هەر کەگەیشتە لامان بەبێ ئەوەی بیری لێبکەینەوەو خۆمانی بۆ ئامادە بکەین‌و دوودڵ بین بیقۆزینەوەو بەسەرماندا تێنەپەڕێت.

ئەوانــەی لــەو بــاوەڕەدان ســەرکەوتن بــەگوێرەی خۆمــاندوکردن وەدەست دێت هیچ هەلێك ناقۆزنەوە، لەوانەیە باوەڕنەکەن کە ئەو هەلـەی بۆیـان ڕەخساوە زێڕینـە، هۆکاری باوەڕنـەکردنیان ئەوەیە کە بەئاسـانی دەســتیان دەکــەوێت... هــەتا ڕانــەبرێت‌و لەدەســتیان نــەچێت بــە هاونرخەکەی نازانن.. کە بەسەریشیاندا تێدەپەڕێت دەستی پەشـیمانی بەیەکدا دەدەن‌و ئاخی بۆ هەڵدەکێشن.. زۆربەی جارەکان بەنرخترین شت، ئاسانترین شت بووە لە ژیانی هەریەکێك لـە ئێمـەدا.... زوو بەدەستەوە هاتن‌و سانایییەکەی وا لەمرۆڤ دەکات ئەوشتە سوودمەندو گرانبەهایـەی لەدەست بچێت.. بەتایبەتی ئەگەر ئەو مرۆڤە لەسەر ئەوە ڕاهاتبێ کە بە هــەوڵێکی زۆر شـتێکی گرانبـەهای دەسـت بکـەوێت... هــەر لەســەر ئــەو ئاوازەشە مرۆڤ هەلە زێڕینەکانی لەدەست دەچێت.

ئــاینی ئیســلام لەزۆربــەی ڕێ‌و ڕەســم‌و دروشمــەکانیدا بەبۆیــەی ((خۆماندونـــەکردن)) نەخشـــێنراوە.. پێغەمبـــەر (د.خ) دەفـــەرموێت: ((شەریعەتی لێبـوردنم بـۆ هێنـاون)).. بـەڵام شـوێنکەوتوانی ئـەو گۆتـە بەنرخەیان لەیاد کردووەو ئاینەکەیان کردۆتە گرانترین ئاینـەکانی سەر ڕووی زەوی کەزۆرترین خۆماندوکردن‌و هەوڵ‌و تێکۆشانی پێویست بێت.

ڕێ‌وڕەسمــە ئاینیــەکانیان ئــەوەندە وردکردۆتــەوەو بەشــەکانیان ئاڵۆزکردوە، هەتا ئێستاش مشتومڕ و لێکۆڵینـەوەی وردەکاریـەکان هەر

بەردەوامە.. موسڵمانێکی بەستەزمان بۆ ئەوەی ڕێو ڕەسمێکی ئاینی جێبەجێبکات بەگوێرەی بنەماکانی. دەبێت دەست لە کارەکانی هەڵگرێت و خۆی تەرخان بکات بۆ وردەکاریەکانی دەستنوێژو مەرجەکانی نوێژو ڕۆژوو.

خوداپەرستیی راستەقینە سوودێکی دەروونی گەورەی هەیە بۆ مرۆڤ، دڵنیایی و باوەڕ بەخۆبوون لە دڵدا دەڕوێنێ، وای لێدەکات لە ژیانیدا گەشبین بێت و لەو باوەڕەدایە خودایەك چاودێری دەکات و یارمەتی دەدات لە چارەسەرکردنی کێشەو گیرو گرفتەکانیدا...

بەڵام پیاوانی ئاین لە وڵاتی ئێمەدا لە بەهای ئەو سوودمەندییە دەروونیە کەمدەکەنەوە کە مرۆڤ لەڕێگەی خودا پەرستیەوە دەستی دەکەوێت، کاتێك بە فەرزو مەرجە زۆر وردەکان ئاڵۆز و گرانی دەکەن ئەو خوداپەرستەی لەسەر ئەو ڕێڕەوە خودا دەپەرستێت ناتوانێت دڵی خاڵی بکاتەوە بۆ پاڕانەوە لەخودای خۆی و داواکردنی یارمەتی... چونکە لەکاتی ئەو خوداپەرستیەدا خەریکی ئەنجامدانی وردەکاریە ئاڵۆزەکانە، لەوە دەترسێت بچووکترین شتی بەسەردا تێپەڕێت.

چەندین کەسمان دیون کاتێکی زۆر دوورودرێژ لە دەستنوێژگرتندا بەسەر دەبەن بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەواو و داواکراو جێبەجێی بکەن. هەروەها لە نوێژکردنیشدا بۆ ئەوەی وەکو پێویست ئەنجامی بدەن دەبینی لەکاتی نوێژکردندا لێوەکانیان دەجوڵێنن و لەهەموو پیتێکدا زمانی قورس دەکەن بۆ ئەوەی لە دەروازەی پێویستەوە بچنە دەرەوە.. هەر بۆیە واتای نوێژەکەی لەدەست دەچێت، جگە لەجوڵە موجەرەدەکان زیاتر هیچی تریان بۆ نامێنێتەوە. ئەو حاڵەتەش لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی

دەرکـەوتنی گرێیـەکی دەروونـیو بـە گـرێی ((تـەواوکاری – Perfectionism)) دەناسرێت کەخەڵکی ئاسایی پێی دەڵێن وەسوەسە.

ئەو گرێیە بو پلەیەکی جیاواز لەدەروونی زۆربەی خەڵکیدا هەیە، بەڵام لە هەندێك کەسدا دەبێتە نەخۆشییەکی خراپو چارەسەرکردنیشی زۆر زەحمەتە..

چاکتروایە بەگرێی تەواوکاری بگوترێت:" ئیرادەیەکی بەستوو"، یەکـەمجار لـە هەوڵـەکانی مرۆڤـدا گـەورەدەبێت بـۆ ئـەوەی کارەکـانی بەباشترین شێوە جێبەجێ بکات، لە راستیدا هەموو مرۆڤێکیش هەندێك جار دەیـەوێت ئەو کارە تـەواو بکات کـە دەسـتی پێکـردووە، بـەڵام ئـەو ئیرادەیە بەشێوەیەك توند دەبێت بەگرێیـەکی دەروونـی. کەسـی توشبوو بەم گرێیـە زۆر بەوردی لە ئەنجامدانی هەموو کارێك دەکۆڵێتـەوە، بـە چاوپۆشین لە مەبەستی ئەوکارەش.. ئەگەر لەسـەر بنـەمای هاوسـەنگیو لەسەر بناغەی ئارامگرتنو دوربینی بێت... بەڵام جێگەی داخە بەدەگمـەن نەبێت مرۆڤ لـەکارەکانیدا دوربـینو ئـارام نیـە.... ئەگـەر مـرۆڤ راهـات لەسـەر ئـەوەی لـە کارەکـەیدا وردبێتـەوە، لـەکۆتاییدا دەگاتـە حاڵـەتی (خۆشەویستی وردبونەوە)، لە ئەنجامداو لەکارەکانیدا تەنها لـە پێنـاو وردبونەوەدا ورد دەبێتەوە ئەو ئامانجانەی لە بیر دەچێتەوە کە لەپێناویدا لەو کارە وردبۆتەوە.

ئەو گرێیە گەورەترین هۆکارەکانی سەرنەکەوتنە لە ژیانی مرۆڤدا، توشبوو بەزەحمەت نەبێت ناتوانێت کارێك بە ئەنجام بگەیـەنێت. دەبینـی دووبارەو سێبارە دەڕوانێتـە هـەموو بەشێك لـەو کـارەی ئـەنجامی دەدات، وای لێدێت سەرچاوەوبنەمای کارەکەی لە یاد دەکات لـە پێنـاو گرنگیـدان

بە بەش ولقەکانیدا، بەواتایەکی دی مەبەستەکەی بیر دەچێت و گرنگی بەشێوازەکە دەدات. ئەو کاتێك کاردەکات وادەزانێت یەکێك چاودێری دەکات و بەسەر سەریەوە وەستاوەو، لە هەموو وردو درشتێکدا لێی دەپرسێتەوە..

ئەو گرێ دەروونیە لە وڵاتی ئێمەدا بەشێوەیەکی زۆر خراپ بڵاوبۆتەوە... زیادڕەوی ناکەین ئەگەر بڵێین بەهێزترین هۆکارەکانی بڵاوبونەوەشی لەم وڵاتەدا، ئەو وردەکایە توندو تیژەیە کەپیاوانی ئایین هەوڵدەدەن وەباڵای ڕێورەسمە ئاینییەکانیدا ببڕن[1].

ئەو منداڵەی لە پەیوەست بوونی ئاینیدا گەورەدەبێت و لەسەر وردەکاریەکانی بەجێهێنانی ڕێورەسمە ئاینیەکاندا رادەهێنرێت تا دەبێتە کێڵگەیەکی بەپیت بۆ گەشەکردنی ئەو گرێ دەروونیە..خۆبەستەییەکی زۆریان بە ئاینەوە هەیە.. هەندێك لەوانە لە ئاین هەڵدەگەڕێنەوەو نوێژو رۆژوش واز لێدێنن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش

[1] مەلا سەید ئەحمەدی فەیلەسووف هەبوو لە چەمچەماڵ، یەکێك بوو لە پیاوە هەرە شارەزاو بلیمەتەکانی ئاین.. گەورەترین گرێی دەروونی هەبوو لە دەربڕین و گوتنی نیەتی نوێژکردندا.. جاری واهەبوو کاتژمێرێك ((نۆیتُ أُصلّی)) یەکی بۆ نەدەگوترا، کار دەگەیشتە ئەوەی لەماڵەکەدا چرکەو نوزەیەك نەدەما.. جارێکیان باوکم (مەلا جەباری قەیتول) پێی گوت: مەلا سەید ئەحمەد هەموو شتێك لەئایندا بەندە بە نیەتی ئینسانەوە، تۆ لەزمانت گەڕێ و بەدڵ نیەت بێنە)) گوتی: ((ئەگەر ئەوە بکەم وادەزانم نوێژم نەکردووە.)).

ئەو گریێ دەروونیە لێیان نابێتەوە ... ئەوان لە وەسوەسەو کاروبارەکانی ئاین و ڕیێ و ڕەسمەکانی خۆیان دەرباز دەکەن، بەڵام لەلایەنەکانی تری ژیاندا توشیان دەبێت. لەوانەیە پاکو خاوێنی و خۆپاراستنی تەندروستی و جیگەی دەستنوێژو پاکیزەیی ئایینی بگرێتەوە، یاخود لەخوێندنەوەو نووسیندا تووشی ئەو گریێ دەروونیە بن لەجیاتی نوێژو ڕۆژوو.

لە ڕاستیدا تەواوکاری پڕاوپڕ لە هەموو شتێکدا مەحاڵە، چونکە سروشتی ژیان ئەوە دەخوازێت کە کەم و کورتی تێدا بێت بۆ ئەوەی مرۆڤ لەپێناو پڕکردنەوەی ئەو کەم و کورتیانەدا هەوڵبدات و تیێبکۆشیێ و چرکەیەك نەوەستیێ.

" جووڵە" هەروەکو لە سەرەتاوە لیێی دواین سیفەتێکی بنەڕەتیە لە سروشتی گەردووندا، چەسپاوی و جێگریش وەهمێکە وجودی نیە... ئەوانەشی باوەڕیان بە (کەماڵ)ی تەواو هەیە لە قوربانیانی لۆژێکی کۆنن.. لۆژیکی (چەسپاوی و حەقیقەتی ڕەها).

کەم و کورتی لە تەواوکاری سودمەندترە بۆ مرۆڤ. ئەو مرۆڤەی لە هەموکارێکیدا بەدوای تەواوکاریدا دەگەڕێت نەخۆشەو پێویستە چارەسەر بکرێت ... هەر چەندێك بەدوای تەواوکاریدا بگەڕێت ئەوەندە لیێی دوور دەکەوێتەوە.

ئەگەر ژیانی سەرکەوتووەکان لێکدەینەوە دەبینین لە کاتی کارکردنیاندا زۆر هێمن و لەسەر خۆن... وەکو منداڵ کە بە یارییەکەوە خەریکە و چواردەوری خۆی لەخەڵك و شتەکان پشتگوێدەخات مارستۆن

دەڵێــت : هــەموومان خــاوەنی ئــەو هــێزی ســەرنجە وردەیــن، بــەڵام لێ ی‌دەگەڕێین‌و پشتگوێ ی دەخەین هەتا لێمان وون دەبێت.

"دوس هكســلی" دەڵێــت : هــەموو منداڵێــك عەبقەریــە هــەتا دەگاتەتەمەنی دە ساڵان .... ئایا هیچ دیمەنێك ئەوەندەی قوڵبوونــەوەی منداڵێك سەرنج راكێشە كاتێك خۆی بەسەر كتێبێكدا دەنووشتێنێتەوە، یاخود گرنگی بەشتێكی نوێ دەدات... زۆر جار لە منداڵ توڕە دەبین بەڵام ئەو ئاگای لەو شتە نییە كە ئێمە دەیڵێین، نازانین ئەو عەقڵ‌و دڵی لای ئەو كارەیە كە خۆی دەیكات... پێویستە لەسەرمان بەگوێرەی توانا خۆمان لە تێكدانی ئەو هێزو توانا موبارەكەی منداڵان دوربگرین لە كاتی ئەنجامدانی كارێكدا..

نووسەر لەكاتی نووسینی گوتارێكدا نابێت رابوەستێت‌و ئەم وشە بەسەری ئەوی دیدا بداو شەن‌و كەویان بكات، پێویستە بە گوێرەی ئەو سەلیقەیەی لەدەروونیەوە هەڵدەقوڵێت هەنگاو هەڵێنێت، خۆ ئەگەر لە سەر هەموو وشەیەك راوەستێت‌و هەڵوێستەیەك بكات هەموو پێوەرەكانی لە دەست دەچێ‌و دۆش دادەمێنێ...

تــەواوكاری شــتێكی ئیعتباریــە، ئەوشــتەی ئــەمڕۆ بــەكارێكی تەواوی دەزانین سبەینێ كەموكوڕی هەیە، ئەو شتەشی لە بۆچوونی تۆدا تەواوكاریە لە تێڕوانینی یەكێكی دیكەوە وانییە .. ئەوكەسەی لەكارێكدا بەدوای تەواوكاری‌دا دەگەڕێت تووشی ڕاڕایی دەبێت، لەسەر بۆچوونێك ناگیرسێتەوە یەكێكی دی دەبینێ‌و بەرەوڕووی دەڕوات، شتێك بەباش دەزانێت و پاش ماوەیەك ڕوكارێكی خراپی دەبینێ‌و جێ ی دەهێڵێ.

باشترین شت کە پێویستە مرۆڤ لەوکاتانەدا ئەنجامی بدات خۆی بداتە دەست سەلیقەی خۆیەوەو زۆر گوێ بەهەڵەکانی نەدات، لەوانەیە ئەو کەموکوڕییەی لەگەڵ سەلیقەدا دەستت دەکەوێت زۆر پاکترو سودمەندتر بێت لەو تەواوکاریەی ڕەنجێکی زۆری دەوێت.

یەکێك لە لێکۆڵەرەکان کتێبێکی نوسیبوو.. هەندێك بەشی زۆر بەرزو بالاو چەند بەشێکی تری زۆر نزمو کەمبایەخ بوون، لەو شتەیان پرسی: بۆچی کتێبەکەت نەگەیشتۆتە پلەی کاری تەواو، پێویست بوو بەشە خراپەکانی هەڵگری و تەنها چاکەکانی بمێنێتەوە؟، وەلامی دانەوە: ((ئەگەر بەشە خراپەکانم نەنووسیایە نەمدەتوانی بەشە چاکەکانی بنووسم)).

نووسەر لەم وەلامەیدا زۆر ڕاستی پێکاوە.. ئەگەر لەکاتی نوسیندا بەدوای (کەماڵ)دا بگەڕایە، هەروەکو داوای لێدەکەن تووشی چەقبەستویی دەبوو کتێبێکی بۆش و هیچو پوچی دەنووسی. ئەگەر ئەو بوێرانە تووشی هەڵە نەبایە نەیدەتوانی بگاتە تەواوکاری لەبەشە چاکەکاندا. بۆیە گوتوویانە هەڵە ڕێگەی ڕاستیت نیشاندەدات، ئەگەر تۆ نەتوانی ئەنجامی هەڵەکانت و کەموکوڕی کارەکانت هەڵگری ناشتوانی چاوەڕێی دەرکەوتنی ڕاستیو کاری تەواو بکەیت.

مارستۆن دەڵێت: ((دکتۆرێکم بینی نەشتەرگەریەکی ئالۆزو گرانی دەکرد، بچوکترین هەڵەی ورد لە دەستەکانیەوە دەبووە هۆی کەمئەندامی یاخود مردنی نەخۆشەکە.. لێهاتوویەکەی سەرنجی ڕانەکێشام بەڵکو هێمنی و جێگیریە سەرسوڕهێنەرەکەی من لەوە ئاگاداربووم چەند چرکەیەك بەر لەنەشتەرگەریەکە چەندێك تێکچووبوو،

بەڵام هەر کە گەیشتە بەردەم مێزی نەشتەرگەری دەستی کرد بەو کارە زۆر وردەی کە منی سەرسام کرد)).

بەڵگە نەویستە ئەو دکتۆرە دڵنیایە هەندێك جار هەڵە دەکات، چونکە لە گەردووندا کەسێك نیە بەهیچ شێوەیەك هەڵەنەکات.. بەڵام گریمانی هەڵەی ئەو دڵنیاییو هێمنیو ئارامییەی زۆر کەمترە لە گریمانی هەڵەی لەکاتێکدا لەکارەکە وردبێتەوەو لێی بکۆڵێتەوەو بەدوای تەواوکاریدا بگەڕێت لە هەموو ئەو جوڵانەی ئەنجامی دەدات.. بەواتایەکی دی: هەرچەندێك هەوڵبدات خۆی لەهەڵە بپارێزێت ئەوەندە هەڵەکان زۆرتر دەبن، هەرچەندێکیش وردەکاری بوێت لێی دووردەکەوێتەوە.

(جیمس) دەڵێت: ((جیاوازی نێوان عەبقەری و کەسێکی ئاسایی ناگەڕێتەوە بۆ سیفەت، یاخود بەهرەیەکی فیتری لەعەقڵدا، بەڵکو بۆ بابەتو مەبەستەکان کە خەمەکانیانی ئاراستەدەکەن هەروەها بۆ پلەی ئەو وردبینیەی کە پێویستە پێی بگەن)).

کەواتە پێویستە خۆمان لە شێلگیری و وردبینیو توندڕەوی ئیرادەمان بپارێزین لەکاتی کارکردندا.. داهێنەر ئەو کەسەیە لە کارەکەیدا ڕۆدەچێتو تێیدا دەتوێتەوە... ئەو نایەوێت لەکارەکەیدا سەرکەوێت، یاخود بگاتە پلەی تەواوکاری، چونکە ئەو کاتێك کاردەکات هەست بەخودی خۆی ناکات، هەروەها هەست بەوە ناکات کەمەبەستێك پالی پێوە دەنێت بۆکارکردن، ئەو لەکاتی کارکردندا خۆی بە بەشێك لە کارەکە دەزانێت، ئەو بەگوێرەی سەلیقەی خۆی هەنگاو دەنێت، عەقڵی ناوەوەی جڵەوی کارەکانی گرتووەو ڕووەو ئەو مەبەستە دیاریکراوەی دەبات بەبێ ئەوەی خۆی هەستی پێبکات.

تکا لە خوێنەر دەکەم وانەزانێت ئیرادە لە هەموو کاتێکدا زیانبەخشە، ئەویش کاتی سوودمەندێتی خۆی هەیە.. پێویستە مرۆڤ ئەو کاتانە لەیەکدی جیابکاتەوە کە ئیرادە سەرچاوەی زیان و دەردەسەریە.

مێژوو ئەوەی سەلماندووە کەسە ناودارو بەناوبانگەکان لەهەموو کەسێك پتر کاریانکردووەو هەوڵیانداوەو ئیرادەیان بە هێز بووە بەڵام دوای کارکردن خۆیان داوەتە دەست عەقڵی ناوەوەیان بۆ کوێی بردوون هەنگاویان ناوە.

گیروگرفتی تاکێکی ئاسایی ئەوەیە ناتوانێت لە دەروونی خۆیدا خووە دژینەکان کۆبکاتەوە.. ناتوانێت لەیەك کاتدا سوود لە عەقڵی ناوەوەو دەرەوەی ببینێت.. یان ئیرادەی بەهێزە و هەمیشە کاردەکات ، یاخود لەهەموو کاتێکدا تەمبەڵێکی کەم تەرخەمە. عەقڵی دەرەوە لەکارکردندا دژی عەقڵی ناوەوەیە. هەروەکو لەمەودوا لێی دەدوێین... بۆیە دەبینین ئەگەر بەگوێرەی یەکێك لەو دوو عەقڵە کاربکات و بەرهەمبهێنێ ئەوی دیان لەکاردەکەوێت.

گیروگرفتی مرۆڤیش لەوەدایە ئەگەر لەسەر یەك شێوەو ڕەوشت ڕاهات زۆر زەحمەتە هەر کاتێك ویستی بیگۆڕێت، ئەگەر لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو عەقڵی دەرەوەی بەکاربهێنێ و لەکارکردن و گیروگرفتەکانیدا پشتی پێ‌ببەستێت.. زۆر زەحمەتە بتوانێت سوود لە ڕوناککەرەوەکانی عەقڵی ناوەوەی وەربگرێت.

ئالێرەدا جیاوازیو هۆکاری سەرکەوتنەکانی کەسێکی عەبقەری دەردەکەوێت. چونکە ئەو کەسێکی ناوازەو دەگمەنە، هەر کاتێك بیەوێت

ئیرادەی بەهێز دەکات‌و هەر کاتێکیش بیەوێت تەمبەڵ‌و خاوو خلیچکی جەستەیی دەبێت.

داهێنانی فیکری بەدوو قۆناغدا تێدەپەڕێت: قۆناغی کۆکردنەوەو قۆناغی دەرهێنان... بەواتایەکی دی : هەموو داهێنەر یان بیریارێك لە سەرەتای کارەکەیدا پێویستی بەخۆماندووکردنێکی بەردەوام‌و زۆر هەیە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریە پێویستەکان‌و پاشان لە عەقڵی ناوەوەیدا کۆیان دەکاتەوە تا پێدەگەن‌و گەشە دەکەن. ئەوەش پێی دەڵێن قۆناغی بە گەنجینە کردن. پاشان قۆناغی داهێنان دەستپێدەکات. دەبینی لەو کاتەدا دوور لەخەڵکی دادەنیشێت.... هەروەکو مەڕو مانگا چۆن خواردن لە گەدەیاندا کۆدەکەنەوەو پاشان دەیگێڕنەوە ناو دەمیان‌و دووبارە دەیجوونەوە (کاوێژکردن) ... لەوکاتانەدا لەو ئەندێشانەی کە وەکو زیندەخەو وان دەکەوێتە مەلە کردن. دەستبەرداری عەقڵی دەرەوەی دەبێت بەئارەزوی خۆی گەشتێك بە نێو ئەندێشەکانیدا دەکات... بۆیە زۆربەی بیرە داهێنەرەکانی سەرهەڵدەدەن‌و دێنە سەری.

هەر ئەوشتە سەبارەت بە کەسە لێهاتوەکانی بواری هونەرو دەستڕەنگینی‌و پیشەسازیەکان دەگوترێت..... کەسی بە تواناو لێزان دەبینی لە کارەکانیدا تێدەکۆشێ‌و ڕاهێنان دەکات لەسەر هونەرەکەی‌و فێربوونی پرنسیپەکانی. بەڵام لە کاتی بەرهەمهێناندا خودی خۆی لە یاد دەکات‌و دەچێتە قوڵایی کارەکەیەوە. لەو کاتانەدا وەکو ئەو کەسەی لێدێت لەکاتی خەو بینیندا نە هەستی هەیەو نە ئیرادە.

# بەشی چوارەم
# هێزە ناهەستیەکان

هیچ بیرۆکەیەك لەسەدەی رابردوودا ئەوەندەی بیری هێزە ناهەستیەکانی مرۆڤ دەنگ و بڵاوبونەوەی بەخۆیەوە نەبینی. هەتا ئەوانەش نکوڵی لە بوونی عەقڵی ناوەوە دەکەن، ناتوانن نکوڵی لەبوونی هەندێك هێزی شاراوەبکەن کە لەقوڵایی دەروونداپە، بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێبکات ئاراستەی دەکات و کاریگەریتی دەبێت لەسەر هەڵسوکەوتەکانی.

دوای ئەوەی لە رابردوودا وایان دەزانی مرۆڤ خۆی ئاراستە کاری رەوشتەکانێتی و لەژێر دەسەڵاتی عەقڵی هوشیاری خۆیداو بەئیرادەی خۆی چارەنووسی دیاری دەکات.. ئەمڕۆ هەرئەو مرۆڤە وەکو ئەو زارێکی کەڕولاڵ وایەو هێزە ناهەستیەکانی زاڵن بەسەریداو پاڵی پێوە دەنێن و رووەو کارەکانیدەیجوڵێنن.

**بەهەڵەدا ناچین ئەگەر ئەوانەی باوەڕیان بەعەقڵی ناوەوە هەیە بکەین بەدوو بەشەوە:**

١- بەشێکیان کەسەر بەقوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونین، لەو باوەڕەدان عەقڵی ناوەوە کانگای هەموو ئارەزووە سەرکوتکراوەکانی مرۆڤە کە لەبەر هۆیەك نەیتوانیوە تێریان بکات و دایان بمرکێنێتەوە. بەبۆچوونی ئەوان ئەو ئارەزوانە لە عەقڵی ناوەوەدا بە بەندکراوی دەمێننەوەو لە ئەنجامی چاودێری عەقڵی دەرەوەدا (هەست) لەژێر

پاڵەپەستۆیەکی زۆردان .. ئەگەر ئەو عەقڵە (هەست) بێ هۆش بکرێت، یاخود لاواز بێت یان پشتگوێبخرێت و یاخود بخەوێنرێت ئەو ئارەزووە سەرکوتکراوانە هەلێکیان بۆ دەرەخسێت بێنە دەرەوە. لەوکاتانەشدا بە چەندین شێوازو وێنەوە خۆیان دەنوێنن.. باشترین و گرنگترین بواری هاتنە دەرەوەشیان (بە بۆچوونی ئەوان) ،بواری خەوبینینە.. بۆ نموونە : یەکێك دەستدرێژیەك دەکاتە سەرت و تۆ توانای تۆڵەسەندنەوەت نییە، دەبینی لە خەونتدا لێی دەدەیت و تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە.. هەندێك جار برسیت دەبێت و شتێك نیە بیخۆیت ، لە خەونتدا چەندین خزمەتکار بەمەنجەڵ خواردنت بۆ دێنن.. لەلایەنی سێکسیەوە برسیتە، یەکێك دێت ئەو برسێتیەت تێر دەکات (شەیتانی) (و).

٢- بەشی دووەمیان، لەو باوەڕەدان عەقڵی ناوەوە جێگەی نیشتنەوەی سروشی ئیلهامەکانی مرۆڤە.

هەروەها کانگای هەڵقوڵینی عەبقەریەت و پێغەمبەرایەتی و داهێنانەکانە، هەندێکیان لەو باوەڕەدا تووشی توندڕەوی بوون و دەڵێن: عەقڵی ناوەوە خۆی لە خۆیدا روحی مرۆڤە.. یاخود هەندێکی تریان دەڵێن ئەو بەشەی خودایە کە لە لەشی مرۆڤدایە..

ئێمە لەبۆچوونی بەشی دووەمیاندا هەست بەوە دەکەین کەمێك لە روحی زانستی دورکەوتوونەتەوە، چونکە ئەوان هێزە ناهەستیەکانی مرۆڤ بە بەڵگەی بوونی جیهانێکی تر لە قەڵەم دەدەن. لەراستیدا باسکردن و تێوەخزاندنی بابەتە غەیبیەکان لەم لێکۆڵینەوانەدا لە بەها زانستیەکانی کەم دەکاتەوە.. ئێمە کەدەتوانین لێکدانەوەو توێژینەوەیەکی

زانستیانەی بۆ بکەین لە ژێر رۆشنایی لێکۆڵینەوە سروشتیی و فەلسەفەیە نوێیەکاندا هەڵی بسەنگێنن چی پێویستیمان بە شێواندنی هەیە بەو بیرە کۆنە تەقلیدیانەی کە تائێستاش زانست پێ ی ئاشنا نەبووە.

هەروەکو لەمەوبەر گوتمان زانستی نوێ هەتا ئێستەش نەیتوانیوە بچێتە ناو پێکهاتەی کاروبارە غەیبییەکان و حوکمیان تێدا بکات، یاخود حوکمی تێدا بکەن .. لەزانستدا ئەو شتە نیە کە بتوانین بڵێین (هەیە، یاخود نیە). هەر یەکێك لەو دوو وشەیە ( هەیە، نیە) لە بۆ چوونی زانستەوە بە کارێکی توندڕەوانە لە قەڵەم دەدرێت. بێ باوەڕیش وەکو ئیماندار وایە، لەم بابەتە ئاڵۆزو تێکچڕاوانەدا ناتوانن ببنە لێکۆڵیارێکی بێلایەن.

توند ڕەوی ئەو بەشەی دووەمیان لە ناوەندە زانستیەکان کاردانەوەیەکی بە هێزیان رووبەروو بووەوە.. ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵەرەکان کاتێك بینیان تێکەڵاوی کاروبارە غەیبیی و روحیەکان کراوە، نکوڵیان لە بوونی هێزە دەروونیە نائاساییەکانی مرۆڤ کرد. لای خوێنەریش ئەو دوژمنکاریە تەقلیدیەی نێوان پێشەوایانی زانست و پیاوانی ئایین لە سەدە بەسەرچووەکانی مێژوودا شاراوەنییە، چونکە لە ئەنجامی ئەو ئاوێتە کردن و تێکەڵکاریەدا لە دەروونی زاناکاندا گرێیەکی دەروونی دروست بوو بۆ قەلاچۆکردنی هەموو شتێك کەلتورێکی ئاینی (زۆر یاخود کەم) لە خۆبگرێت.

هێزە دەروونیە نائاساییەکان لە رۆژگاری ئەمڕۆدا، راستیەکی زانستی بڕیار لەسەر دراون، تاقیکردنەوەکانیش پشتیوانیەکی زۆری دەکەن.. بەڵام ئەو شتەی هەندێك لە لێکۆڵەرەکان دەترسێنێ، ئەو

لێکۆڵینەوانە بیرە روحیە کۆنە بەسەرچووەکان لەخۆ بگرێت کە لە سەدە بەسەرچووەکاندا و لەپێناو قەڵاچۆکردنیدا خەباتێکی زۆرو درێژخایەنیان کردووە. هەندێکی دی لە لێکۆڵیارەکان پێچەوانەی ئەوان بیر دەکەنەوەو دەڵێن پێویستە ئێمە لەگەڵ لێکۆڵینەوەو توێژینەوە زانستیەکاندا بڕۆین ڕوەو هەر کوێیەکمان دەبات.. . ولە هیچ شتێك نەترسین چونکە ئێمە شوێنپێ هەڵگری شێوازە زانستیەکانین لە لێکۆڵینەوەکاندا پێویستە ئێمە گوێ لە هەموو ئەو شتانە بگرین کە زانست دەیڵێت. ئەگەر بشمان گێرێتەوە بۆ بیرە کۆنەکان، یاخود دەرکەیەکی نوێمان بۆ بکاتەوە.. زانست لەدیدی ئەوانەوە ئەو چرایەیە رێگەکان رووناك دەکاتەوە..

لەسەر ئەو بۆچوونەی سەرەوە کۆمەڵێك لە زانا بەناوبانگەکانی وەکو ئۆلیڤەر لودج، ولیەم کردکس، ولیەم جێمس، شارل دیشیە، هنری سرجوك، هانز دریش، هنری برجسون هاوهەڵوێستو یەکدەنگن .. رۆژ لەدوای رۆژیش ژمارەیان زۆر تر دەبێت.

## لێکۆڵینەوەی زانستی دوو ڕیگەی هەڵبژاردووە بۆ توێژینەوەی هێزە نائاساییەکانی مرۆڤ:

ڕێگەی یەکەم لێکۆڵەرو توێژەوەرە بەریتانیەکان لەسەری دەڕۆن و چەندین کۆمەڵەی دی لە وڵاتانی ترەوە شوێنپێیان هەڵگرتوون .. لەوشێوازەدا هەموو بەڵگەنامەکان کۆدەکرێنەوە دەربارەی هەر رووداوێك کەهێزێکی نائاسایی بیچوێنێ .. ئەگەر ئەو لێکۆڵەرانە هەواڵی ئەوەیان گەیشتێ کە لە شوێنێکی سەرڕوی ئەم زەویەدا یەکێك خاوەنی بەهرەیەکی سەرسوڕهێنەرە لە "رامان" یاخود خوێندنەوەی بیری بەرامبەر

یاخود هەرچ شتێکی دی .. یەکێك لە چاودێرانی خۆیان کە خاوەنی خوورەوشتێکی پاكو راستگۆو بێلایەنی و تێبینی ورد دەنێرنە لای. ئەو چاودێرانەش .. دەست دەکەن بە لێکۆڵینەوەی هێزە نائاساییەکانی و دەیخەنە ژێر چاودێریەکی وردەوە. پاشان راپۆرتێکی تێروتەسەل دەنووسن سەبارەت بەو شتەی بینیویانەو چاودێرییان کردووە. هەربۆ ئەو مەبەستەش لەساڵی(١٨٨٢)ەوە کۆمەڵەیەك لە بەریتانیادا دروستکراوەو ناوی لێنراوە کۆمەڵەی توێژینەوە دەروونیەکان (The Socicty For Psychical Reseavch) ژمارەیەکی زۆر لە زاناو فەیلەسوفەکان لە خۆدەگرێت و گۆڤارێکیش بەزمانحاڵی ئەوان دەردەچێت. یەکەم سەرۆکی هەڵبژێردراویشیان پرۆفیسۆر (سدجوك) ، مامۆستای فەلسەفە بوو لە زانکۆی کمبردج.

(سدجوك) لەو گوتارەی بەبۆنەی کردنەوەی کۆمەڵەکەوە خوێندیەوە مەبەستی دامەزراندنەکەی بەم شێوەیە باس دەکات : "ئێمە زۆر لەو هەواڵانەمان گوێ لێدەبێت کە باس لە هێزە نائاساییەکانی مرۆڤ دەکەن و هەندێك کەس ئەنجامی دەدەن هەروەها چەندین گەواهیدەری راستگۆ بۆمان دەگێرنەوە.. بەڵام ڕوی خۆمانی لێوەردەگێڕین .. ریسواییە جیهانی پێشکەوتوو ئەو مشتومڕە ببینێت لە نێوان ئەوانەی باوەڕ بەو هێزە دەکەن و ئەوانەش بەدرۆی دەخەنەوە. ناکرێت ئێمە لە ئاستیدا بێدەنگ بین. ئەگەر لە نێو ئەو هەواڵە زۆرانەدا. دە دانەیان ڕاست بن بە ها زانستیەکەی زۆرگەورەیەو بەهیچ شتێك ناپێورێت .. یەکەم ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە بەدواداچونی ئەو هەواڵانەیە کە کۆمەڵانی خەڵك دەیلێێنەوە لە هەر کات و شوێنێکدا بێت .. هەروەها خستنە ژێر مەرجەکانی زانست کە

هیچ گومانێك هەڵناگرێت .. ئێمە دەمانەوێت، جا ئەگەر باوەڕی پێبکەین یاخود نەیکەین، سنوورێك بۆ ئەو ریسواییەی زانستی مەدەنیەتی تێیکەوتووە دابنێین و .. ئەوە تێبگەین کە ئەو چیرۆکانە راستن یان درۆ. لە هەموو ڕوداوێکیش کەگوێمان لێدەبێت بکۆڵینەوەو، سەلماندنەکانمان لەسەر شتێك بێت کەلەمەوبەر گوێمان لێبووە .. مەبەستی ئێمە دۆزینەوەی حەقیقەتە، بەچاوپۆشین لەوەی ئەنجامەکەی چاك یان خراپ بێت".

کۆمەڵەکە لەسەر ئەو پرۆگرامەی هەنگاوی نا کە یەکەم سەرۆکی جەختی لەسەر کردەوە. بۆ ئەو مەبەستەش لەدۆسیەکانیدا ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەو گەواهیەکانی تۆمار کردووە. لە راستیشدا ژمارەیەکی کەم نەبێت لەوانە بەدرۆ نەخراونەتەوە...

ئەو کۆمەڵەیە لە جیهاندا دەنگێکی گەورەی دایەوەو لە وڵاتانی دیکەی وەکو (فەرەنسا، ئەمریکا، هۆڵەندا، دانیمارك، نەرویج، پۆڵەندا)دا لقی لێ کرایەوە.

هیوادارین ئەو کۆمەڵەیە لقێکیشی لە عێراقدا بکرێتەوە، ئەو وڵاتەی چیرۆکی سەدان هێزی نائاساییمان تێدا گوێ لێبووە. ئێمەش دەمانەوێت سنوورێك بۆ ئەو ململانێ نەزۆکەی نێوان باوەڕداران و بێباوەڕانی دابنێین... زۆر بەئاسانی دەتوانین لیژنەیەکی بێلایەن دابمەزرێنین و بەدوای ئەو هەواڵانەدا بچێت کە کۆمەڵانی خەڵکی لەسەرکەرامەتی وەلیەکان و سۆفیەکان و کارە سەرسوڕهێنەرەکانی فاڵچیی و دەستگرەوەکان و ساحیرو ...هتد دەیگێڕنەوە .... بۆ ئەوەی لەو

خەرمانە زۆرو زەوەندەی درۆکاندا بەشێکی کەم لە راستیەکان بدۆزینەوە کە گرنگیەکی زۆری هەیە لە بیرکردنەوە زانستیەکانماندا[1].

(1) خۆزگە لەکوردستانی خۆشماندا هەیە هیچ نەبوایە چاودێریەکی وردی ئەو درۆ زۆرانە دەکرا کە لە زمانی کۆلکە شارەزایانی بوارە غەیبیەکانو نەخوێندەوارانی بواری سایکۆلۆژیەوە بە کوچەو کۆلانەکاندا بلاوبونەتەوە. رەنگە ئەو بەرپێزانە لەنەزانیو نەشارەزاییانەوە بێت شتەکان تێکەلاو دەکەن بۆنموونە: لە ژمارە (١٢) رۆژنامەی (سلێمانی نوێ) کە شارەوانی سلێمانی دەری دەکات، هەوالێك بلاوبۆتەوە کە کیژۆلەیەك ناوی (رۆز) ە (لەگەل یەکێکدا دەدوێتو لەگەل بەناو هاورێیەکەیدا یاری دەکات کە وجودی نیە) لە ژمارەی دوای ئەو، واتە ژمارەی (١٣) هەمان رۆژنامەدا چاوپێکەوتنێك لەگەل بەرێزێك بەناوی (ع .ن) بلاوکراوەتەوەکە گوایە لەبواری پاراسایکۆلۆژیدا شارەزایی هەیە: ئەو برادەرە دەلێت: " ئەو حالەتەی (رۆز)ی تێدایە ، حالەتێکی نائاساییە ..." هەتا ئێرە قسەکەی زۆر زانستیانەیە، چونکە ئەو کیژۆلەیە هێزێکی نائاسایی لە عەقلی ناوەوەیدا دەیجولێنێو رەنگە پێکهاتەی جیهانێکی شاری یاریو منالانی بۆ دروست کردبێت ، چوبێتە ناخی خۆیەوەو لە بەرامبەرشیدا عەقلی هەستی لاواز کردووەو حەزنەکات بێتە دەرەوە...

بەلام لە پەرەگرافی دووەمدا دەلێت: جنێك هاورێیەتیی لەگەلدا بەستووە...، ئەم جۆرە جنۆکەیەش پێی دەگوترێت جنی ناومال، .... کاکە (ع) لەوەش بەولاوەتر دەچێتو دەلێت ئەو جنەش ناوی (سەندەیە) ... ئا ئەوە کارەساتەکەیە کە رۆژنامەیەکی زمانحالی شارەوانیەك بە هەلبژاردنێکی ئازادەوەو لەلایەن دەیان هەزار روناکبیرو پێشکەوتنخوازەوە هەلبژێردراوەو سەربە حزبێکی عیلمانی پێشکەوتوو هەولدەدات کۆمەلگەیەکی مەدەنی دروست بکات...پروپاگەندە بۆ عەقلیەتی بەسەر چوی دور لەبنەما زانستیەکان بکات... لەوەش بەولاوە تر دەلێت ، کاك (ع) شارەزایە لەبواری پاراسایکۆلۆژیدا .... سالانێکی دورودرێژە مرۆڤایەتی خەباتی کرد بۆئەوەی کارە غەیبیەکان لە بواری زانست وەدەرنێنو لەئەنجامدا زانستێك دروست بوو. بەناوی (پاراسایکۆلۆژی) ... ئەو زانستەش پشت بە بنەما زانستیە تەجریبیەکان دەبەستێت نەك روحیو غەیبیەکان .... تکام وایە لە باوكودایکی ئەو مندالە بەستەزمانە وەکو ئەو

کۆمەڵـەکانی توێژینـەوە دەروونیـــەکان لــە بــەریتانیاو وڵاتــانی دیــدا گەیشتونەتە ئەو راستیەی کە مرۆڤ خاوەنی چەندین هێزی نائاسـایی دەرونیە. گرنگترینیان سێ شتن : –

١- گواستنەوەی بیرەکان (TelePathy) .

٢- بینینی شتەکان لەو دیوی بەربەستەکانەوە (Ciaiyvoyance) .

٣- پێشبینی (For eknow ledge ).

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە زۆر لەکۆمەڵانی خەڵکی، دێنە لامان‌و بۆمان دەگێڕنــەوە کـە شـتێکیان لــێ روداوە هەسـت بـەبوونی بەهرەیـەك دەکـات وەکـو خوێندنــەوەی بـیری بەرامبەرەکــەیان یـاخود پێشـــبینی رووداوەکـانی شـتێك لــە دوا رۆژدا ، بــەڵام وا ڕاهـاتووین ئـەو بەهرەیــە ببەینـەوە سـەر رێکـەوت. ئەگـەر یـەکێك لـە ئێمـە خـەونێك ببینـێ‌و پـاش ماوەیـەك خەونەکـەی بێتـەدی‌و روبـدات پـێی دەڵێـن رێکـەوت بـووە... لەراستیدا ئێمە لەبەکارهێنانی وشەی رێکەوتدا تووشی توندڕەوی هاتوین ... چونکە رێکەوت هەروەکو دەڵێن کوێرنیە، وبەگوێرەی چەند یاسایەکی چەسپاو رێڕەو دەگرێت، لەکارکردنیشیدا رێژەیەکی سەدی دیـاریکراو تێناپـەڕێنێت. زانسـتەکانی بـواری لێکۆڵینـەوەی ئامـار لـە یاسـاکانی

---

هاوڕێیەی منیان لێنەیەت‌و پەنابەنە بەر کەسانی‌دواکەوتوو چەندین کاتژمێر ئەو منداڵە لەبەردەمیدا دابنێن‌و شتی بەسەردا بخوێنێ بۆدەرپەڕاندنی ئەو جنۆکەیە. ئەو حاڵەتە نائاساییەی (رۆز)ی تێکەوتووە، لەزانستدا زۆر ئاساییەوئەگەر مامەڵەیـەکی هێمنانـەو زانستیانەی لەگەڵدا بکرێت ، دەگەڕێتەوە حاڵەتەئاساییەکەی خۆی‌و بەپێچەوانەشەوە، تووشی گرێیەکی دەروونی، یاخود نەخۆشیەکی عەقڵی درێژخایەنی دەکەن.

ڕێکەوتیان کۆڵیوەتەوەو شتێکی تێدا نەماوەتەوە نەزانراو بێت و ئەو کارانە بدەینە پاڵی کەنەتوانین شیکردنەوەیەکی ماقوڵی بۆ بکەین.

ئەگەر یەکێکمان لە خەونیدا ناسیاوێکی کۆچی دوایی کردو پاشماوەیەك بەراستی ئەو ناسیاوەی مرد... ئێمە سەرمان سوڕدەمێنێ بەرامبەر ئەو گیروگرفتە : ئایا ئەو خەونە پێشبینیەکی راستەقینەیە ، یاخود ڕێکەوتێکی تەواوە.

" ئۆلیفەر لودج" زانای بەناوبانگی بواری لێکۆڵینەوەی سروشتی لەو بارەیەوە دەڵێت : " ئەگەری مردنی مرۆڤ لە هەر رۆژێك لە رۆژەکانی ژیانیدا ئەگەرێکی زۆر لاوازەو لە ١٩٠٠٠ بۆ یەك حاڵەتە . بەو پێو دانگەی ناوەڕاستی تەمەنی مرۆڤ پەنجاساڵە ، بەواتای ١٩٠٠٠ هەزار رۆژ. بۆیە ئەگەر یەکێك ١٩٠٠٠ هەزارجار. خەوی بەمردنی ناسیاوێکیەوە بینی و یەك جار خەونەکەی راست بوو هاتەدی بەگوێرەی یاسای ئەگەرەکان، ئەوکارە دەکەوێتە چوارچێوەی ڕێکەوتی تەواوەوە ئەمەو ئەو پشکنینانەی کۆمەڵەی توێژینەوە دەروونیەکان سەلماندوویانە خەونەکان بەرێژەی (١، ٤٧) باوەڕپێکراوە بەواتایەکی دی لە (٤٧)خەون دا کە مرۆڤێك دەیبینێ یەك خەونی راست دەردەچێت ... لەو بەراوردکاریەدا دەردەکەوێت توانای خەون لەپێشبینیدا زۆر بەرزترە لەتواناکانی ڕێکەوت ... ئەو هێزە زۆرەش لە کوێوە هاتووە؟

ئۆلیفەر لودج لە شیکردنەوەی ئەو هێزەدا دەڵێت " ئەنجامی جۆرێك لە پەیوەندی نێوان عەقڵی کەسی نووستوو لەگەڵ عەقڵی ئەو کەسەدایە کە لەسەرەمەرگدایە".

پرۆفیسۆر (راین) چیرۆکی خەوبینینێکی سەیر دەگێڕێتەوەو جەخت لەسەر راستگۆیی ئەو چیرۆکە دەکاتەوە راین دەڵێت : ژنێك لەخەویدا براکەی دەبینێت دەگەڕێتەوە ماڵەکەی ئەسپەکەی دەباتە ئاخوڕەکەو دەیبەستێتەوەو پاشان رووردەکاتە ژووری ئاڵفەکەو دەمانچەکەی دەردەهێنێت‌و خۆی دەکوژێت...لە خەویدا بە تەواوی دەیبنێ مردووەو جوڵەی نەماوەو دەمانچەکەش لەدەستی کەوتۆتە سەرزەوی... ژنەکە بەترسەوە لەخەوەکەی راپەڕی‌و داوای لە مێردەکەی کرد سواری عەرەبانەکەی بێت‌و بچێتە ماڵی براکەی ... کە گەیشتە ئەوێ . توشی سەرسوڕمان‌و حەپەساوی هات کەبینی لاشەی براکەی لەهەمان شوێندا کەوتووە کە لە خەونەکەدا بینیبووی دەمانچەکەشی بەو شێوەیە لە سەر زەویەکە کەوتبوو.

ئەگەر ئەو خەونە ڕاست بێت، ناکرێت بیخەینە چوارچێوەی ڕێکەوتەوە... ئەو وردەکاریانەی کە ژنەکە لە خەونی‌دا بینی و پاشان لەسەر ئەرزی واقیع ڕویدایەوە، زۆر ئاڵۆزو هەمەلایەنەیەو ئاسان نییە هەر هەموویان لەیەك کاتدا لەخەون‌و واقیعدا کۆببنەوە.

ئەو چیرۆکەو چەندین چیرۆکی دی هۆکارێکی بەهێزبوون. بۆ ئەوەی پرۆفیسۆر (ڕاین) لقێکی لە زانکۆی (دیوك)ی ویلایەتی کارۆلینای باکووری ولایەتە یەکگرتوەکان بکاتەوە بۆ توێژینەوەی ئەو دەرکەوتە سەر سوڕهێنەرانەو بیانخاتە ژێر تاقیکردنەوەو توێژینەوە زانستیەکانەوە. لەو کارەشیدا پرۆفیسۆر (ولیم مەکدونال) ی زانای بەناوبانگی دەروننناسی، یارمەتیدەری بوو..

(ڕاین) ئەو لێكۆڵینەوەیەی ناو لێنا زانستی دەروونناسی پەڕاوێزی (Parapsychology) چەندین تاقیگەی زانستی ڕێكخراوی بۆ دامەزراندو چەندین یاریدەدەری بە تواناشی بۆ كۆكردەوە..

شێوازەكەی (ڕاین) لە كۆمەڵەكانی دیكەی توێژینەوە دەروونیەكان جیاوازتر بوو چونكە ئەو گرنگی نەدەدا بەو كەسانەی خاوەنی بەهرەیەكی نائاسایی بوون، بەڵكو (ڕاین) دەیویست هەمووكەسێكی ئاسایی بپشكنێ بۆ دۆزینەوەی ئەو توانا نائاساییانەی كە تێیدایە.

كۆمەڵەكانی توێژینەوە دەروونیەكان دەڵێن، بەهرە نائاساییەكان هەروەكو چاوگەی كانزاكانن .. ئەوان چۆن لە هەموو زەویەكدا نین ئەمیش تەنها لە چەند كەسێكی كەمدان. بۆیە پێویستە بەدوای ئەو تاكانەدا بگەڕێین هەروەكو چۆن كۆمپانیا بەرهەمهێنەرەكان بەدوای سەرچاوگەی نەوت و كانزاكاندا دەگەڕێن. بەڵام (ڕاین) دەیەوێت قوڵاییەكانی دەروونی مرۆڤ بپشكنێ. ئەو هەوڵدەدات هەموو مرۆڤێك بپشكنێ، ئەو مرۆڤە هەرچۆنێك بێت بۆ ئەوەی تێكڕاییە گشتیەكەی لێدەربهێنێت.

راین شێوازێكی تایبەتی بۆ توێژینەوەی ئەو توانایە گرتەبەر بۆ ئەومەبەستەش جۆرێك لە كاغەزی یاریكردنی بەكاردەهێنا كە هەروەكو ئەوانەی لە قوماردا بەكاردەهێنرێن. ئەو كاغەزانە چەندین شێوەی تایبەتی لەسەر دروستكرابوو وەكو: ئەستێرەو چوارگۆشەو خاچ و بازنە. لەهەموو تاقیكردنەوەیەكدا (٢٥) كاغەزی بەكار دەهێنا. هەر پێنج دانەیان یەكێك لەو شێوازەی تێدابوو... ئەو كەسەی تاقیدەكرایەوە لەسەر مێزی تاقیكردنەوەكە دادەنراو لێكۆڵەرەكەش بەرامبەری دادەنیشت...

پشتی هەر کاغەزێکی نیشان بدرایە ئەو وێنەیەکی دەگوت و وەڵامەکانیشی زۆربەوردی تۆمار دەکرا.

ئەو تاقیکردنەوە جۆراو جۆرانەی (راین) و کەسانی دی ئەنجامیاندەدا ئاماژەی بەوە دەکرد کەمرۆڤ هێزێکی پێشبینی تێدایە بەرزتر لە تێکڕایی رێکەوت.

لەو ڕوداوانەی گرنگیەکی زۆری لە ناوەندە زانستیەکاندا وروژاند لەبەشی زانستی دەروونناسی کۆلێژی (کولورادۆ)دا تاقیکردنەوە لەسەر (٣٠٠) کەس ئەنجامدرا ژمارەی ئەو تاقیکردنەوانەش سێسەدهەزاری تێپەڕاند. ئەو رووداوە زانستیە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو چونکە هەرچەندێك ژمارەی تاقیکردنەوەکان زۆرتربێت ئەوەندە ئەنجامەکانی وردترو راستگۆترو نزیکتر دەبێتەوە لە یەقین. بەهەرحاڵ ئەو ئەنجامی تێکڕاییەی کە پشکنەرانی تاقیکردنەوەکان وە دەستیان هێنا زۆر گەورەتر بوو لە تێکڕایی رێکەوت و سەلماندویەتی شتێك هەیە لە سەروی‌رێکەوتەوەو رۆڵێکی کاریگەری هەیە لە ژیانی مرۆڤدا یەکێك لە لێکۆڵەرەکان لە کۆلێژی (هنتری) ویلایەتی نیویورك تاقیکردنەوەیەکی لەسەر کچێك ئەنجامدا. ئەو کچە توانی تێکڕایی (١٨) لە (٢٥) حاڵەتدا وەدەست بهێنێت... لێکۆڵەرەکە کچەکەی لە بینایەکی دوور لە خۆی داناو لەرێگەی تەلەفونەوە وەڵامەکانی وەردەگرت.... راستگۆیی وەڵامەکانی هەندێك جار دەگەیشتە حاڵەتێکی سەرسوڕهێنەرو هەموو وەڵامەکانی راست دەردەچوو. ئەو کارەش بەهیچ شێوەیەك ناکەوێتە چوارچێوەی رێکەوتەوە.

لێکۆڵینەوەکانی (ڕاین) لە ئەمریکادا زریانێکی ڕەخنەی ڕووبەڕوو بووەوەو هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوامە لەلایەن مامۆستایانی زانکۆوە. زۆربەی ئەو مامۆستایانە دەیبەنەوە سەر خورافات و هیچ وپووچی. هەندێکیان، بۆدڵنیایی خۆیان بەنهێنی‌یەوە تاقیکردنەوەکانیان ئەنجام دەدەن.

راین، دەڵێت: یەکێك لە لێکۆلەرەکانی ئەمریکا لە تاقیکردنەوەکانیدا گەیشتە ئەنجامێکی زۆر گرنگ بەڵام نەیوێرا بڵاوی بکاتەوە. گوتیان بۆ بڵاوی ناکەیتەوە. گوتی: " خێزانەکەم خواردنیان دەوێت" . بەواتایەکی دی دەترسێت دوای بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەکەی زانکۆکە دەری بکات و خێزانەکەشی بێ‌نان بمێننەوەو لەبرسابمرن.

بۆ کورتکردنەوەی ئەو شتانەی سەرەوە دەڵێین. زاناکان لەو بابەتەدا بە دوو ڕێڕەودا دەڕۆن:

١- شێوازی پشکنینی ڕوداوەکان و دڵنیابوون لە راستگۆیی گەواهیدەرەکانی، کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکان، هەر ئەو ڕێگەیەشە کە کۆمەڵانی توێژینەوەی دەروونی لەسەر ئاستی جیهاندا لەسەری دەڕۆن.

٢- ڕێڕەوی دووەم: شێوازی پرۆفیسۆر (ڕاین)و شوێنکەوتووانی.. کە لەسەر ڕێگەی تاقیکردنەوەو ئامار دەڕوات.. و لەهەندێك زانکۆدا کاری پێدەکرێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە هەردوو ڕێڕەوەکە گەیشتنە ئەنجامێکی هاوبەش و هاوشێوە، ئەویش: لە مرۆڤدا توانایەك هەیە بۆ هەستە

نائاسـاییەکان یـاخود هــەروەکو ڕایــن دەڵێــت: هەســت کــردن، بــەبێ هەستەوەرەکان: Extra Sensoryperecption .

لەم دواییانەشدا بۆچونی زانستی رووەو دانپێدانانی ئەو هەستە هەنگاو دەنێت.. پرۆفیسۆر (سولس)، مامۆستای دەروونناسی لە زانکۆی (کمبردج) دەڵێت: "پێویستە وەکو هەر راستیەکی زانستی دان بەو دەرکەوتەیەدا بنرێت، کاروباری سەلماندنیشی جێبهێڵین بۆ شێوازی قەناعەتپێکردنی نکۆڵیلێکەرانی، لەبری ئەوەش با بەردەوام بین لەسەر لێکۆڵینەوەکان.. ئێمە ئەگەر بەوردی لەسروشتی ئەو هەستە بکۆڵینەوە، ئەو بەربەستانە دەدۆزینەوە کە ڕێگرە لەبەردەم دانپێدانانیدا".

زیادڕەوی ناکەین ئەگەر بڵێین لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گیروگرفتەکە لەوەدانیە. تا چەندێك ئێمە باوەڕ بەو هەستە دەکەین یاخود بەدرۆی دەخەینەوە، بەڵکو لە کەمی زانیاریماندایە سەبارەت بە سروشتی ئەو هەستە.. ئەمڕۆ لێکۆڵەرەکان گومان لە بوونی ناکەن، بەڵام بەشێوەیەکی تەواو نازانن ماهیەتو ئەویاسایانە چین کە لەسەری دەڕوات.. بۆیە هەندێکیان چەندین تیۆرو گریمانیان سەبارەت بە سروشتی ئەو هەستە داناوە. بەو تیۆریانەشدا جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوەو هەتا ئێستەش نەگەیشتونەتە ئەو شتەی هەموویان پشتی پێببەستن.

هەروەکو گوتمان لێکۆڵەرەکان نایانەوێت شیکردنەوەیەکی غەیبیو رۆحی بۆ ئەو دەرکەوتەیە بکەن، چونکە ئەو جۆرە شیکردنەوانە نایانگەیەنێتە ئەنجامێکی بابەتی ئەوتۆ لە لێکۆڵینەوەکانی داهاتویاندا پشتی پێببەستن ئەوان دەیانەوێت شیتەڵکاریەکی سروشتیو گونجاوی بۆ بکەن لەگەڵ بنەما زانستیەکاندا بگونجێت.. چونکە لە بۆچوونی

ئەوانەوە ئەوە تەنها ڕێگەیەکە بۆ بەردەوامبوونی توێژینەوەکەیان. بۆ نمونە: ئەگەر گوتیان رۆح سەرچاوەی ئەو هێزە نائاساییانەیە، دەبێ لەو سنورەدا بوەستن و ناتوانن بیبەزێنن. چونکە ئەوانەی لەوەوپێش لە دەرکەوتە تەمومژاویەکانیان دەکۆلیەوە لێکدانەوەیەکی تەمومژاوی و تێکچڕاویان بۆ دەکردو ڕادەوەستان.

ڕاین و زۆربەی زاناکانی دی دەڵێن: ئەم قۆناغە سەرەتاییەی ئێمە دەستمان پێکردووە قۆناغی دۆزینەوەو بەدواداچوونی ڕوداوەکان و کۆکردنەوەی بەڵگەکانێتی.. ئێمە نەگەیشتوینەتە ئەو ڕادەیەی بتوانین شیکردنەوەو لێکدانەوەیەکی بۆ بکەین یاخود گریمان و تیۆریەکانی بۆ دابڕێژین..

بەلام کۆمەڵێکی دی لەزانایان پێچەوانەی ئەوە دەڵێن: ئەو گریمانانەی لەکاتی توێژینەوەکاندا دایدەنێین، هۆکارێکی کاریگەرو گرنگە بۆ پێشخستن و کردنەوەی دەرکەکانی دی لەوبابەتەدا. بەبۆچوونی ئەوان کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکان مەبەستەکە ناپێکن هەروەکو زانست سەلماندویەتی گریمانەکان و کۆکردنەوەی ڕاستیەکان پێویستن بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی. هەردوکیان لە سەرجەم پێشکەوتنەکانی مرۆڤدا شانبەشانی یەکدی رۆیشتوون. بەهەرحاڵ لەو بوارەدا چەندین گریمان و تیۆر داڕێژران سەبارەت دەرکەوتەی هێزە نائاساییەکانی مرۆڤ، منیش لێرەدا تەنها دوو گریمان باسدەکەم کە لە هەموو گریمانەکانی دی بلاوترو ڕەواجێکی چاکیان هەیە، ئەوانیش: گریمانەکەی (تشنر) و گریمانەکەی (سنیل).

تشنر دەڵێت: ئەو شتەی ئێمە بە عەقڵی ناوەوە، یاخود نەست ناوی دەبەین، توانای بەزاندنی دوریەکانی (شوێن)ی هەیە، چونکە خودی ئەو شتە (شوێنی)نییە.

تشنەر دەڵێت: ((لایەنی (هەستی) لە زیهنماندا بە (تاکرەوی) دەناسرێت. هەموو تاکێك جیهانێکی زیهنی هەستی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەو جیهانەش داخراوەو هیچ کەسێك ناتوانێت ناوەڕۆکەکەی بزانێت.. تەنها ئەگەر خاوەنەکەی لەڕێگەی زمان، یاخود هەر شێوازێکی دیکەی کۆمەڵایەتیەوە ڕێگەبدات بەچونە ژوورەوەی.. بەڵام ئەو شتەی لەژێر (هەست)دایە بە (کۆمەڵی) ناسراوە.. دەتوانین بڵێین ئەو زیهنەیە هەموو جیهان بەشداری تێدادەکەن.. یاخود بە واتایەکی دی زیهنێکە لەسەروی (تاکی)ەوەیە. بۆیە ئەو شتانە دەزانێت کە عەقڵی (تاکی) پەیان پێنابات و پیّی نامۆیە)).

(تشنەر) لەو باوەڕەدایە کە عەقڵی (تاکی) یاخود ئەو شتەی پیّی دەڵێن عەقڵی دەرەوە یان عەقڵی هەستیار، لەکاتی وریاییو بەئاگایماندا ڕێگرێك دەبێت بۆ ئەوەی سوود لەو عەقڵەی ناوەوە نەبینین کە سنوورەکانی (شوێن) دەبەزێنێت. بۆیە دەبینی ئەوانەی خاوەنی هێزێکی نائاسایین سوود لە تواناو بەهرەکانیان وەرناگیرێن تەنها لەو کاتانەدا نەبێت کە عەقڵی هەستیاریان دەنوێت یاخود عەقڵیان دەکەوێتە حاڵەتێکی سڕبوون و لەهۆش خۆچونەوە.

عەقڵی ناوەوە هەر کاتێك هەلی بۆ بڕەخسێتو عەقڵی دەرەوە لەکاربکەوێت دەتوانرێت مێشکی خەڵکی دی بخوێنێتەوەو پەردە لەسەر کارە غەیبییەکان هەڵبداتەوە.

ئـەوەی سـەرەوە کورتـەی گریمانەکـەی (تشـنەر) بـوو سـەبارەت شیکردنەوەی هێزە نائاساییەکانی مرۆڤ و لەوەشدا کۆمـەڵێکی زۆر لـە توێژەرەوەکان پشتیوانی لێدەکەن.

بـەڵام (سـنیل) لـەو باوەڕەدایـە: هـەموو ماددەیـەك لـە گـەردووندا چەندین لەرینـەوە یـاخود شـەپۆلی (ئەسیر)ی تایبـەت دەردەپـەڕێنێت. کـە هـەر پێنج هەستەوەرەکانی مرۆڤ درکی پێناکـەن. لـەو باوەڕەدایـە ئـەو (نتوء)ە سنەوبەریە وردانەی لەبەشی خوارەوەی مێشکدان لـەلای ( نخاع الشوکی)یەوە بریتیە لە هەستی شەشەمو هەست بەو لەرینەوەو شەپۆلانە دەکات و هەندێك جار دەکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوە..

زاناکانیش بەدوای سروشتی ئەو (نتـوء)ە و کارەکانیدا ڕۆیشتون و هـەتا ڕۆژگـاری ئـەمڕۆش نـەیانتوانیوە کاریگەرییـە فەسـلەجیە دیاریکراوەکـەی بدۆزنـەوە.. (سـینل) یـش لـە هـەوڵی کۆکردنـەوەی ئـەو بەڵگانەدایە کە (نتوء)ی سنەوبەری سـەردەمانێك بـەر لەئێستا هەستێکی بەهێزی هـەندێك گیانلەبەران بووە، بـەڵام لـە مرۆڤـدا کـەم بۆتـەوە... لـە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا شتێکی ئەوتۆی لێنەماوەتەوە تەنها لـەلای هـەندێك کەس نەبێت.

(سنیل) لەو باوەڕەدایە کە مێشکی مرۆڤ وەکو جیهازێکی بێتـەل وایـە... لـەو بارەیەشـەوە دەڵێـت: (( تەنـها جیـاوازی نێـوان هـەردوو جیهازەکە (بێتەل و عەقڵی): یەکەمیان لە ماددەیەکی ئەندامی (عضوي) و لەسـەر شێوەی (پیل و تـەل) دروسـت کـراوەو، دووەمیـان لەمادەیـەکی زیندوو لەسەر شێوەی خانە وردەکان و مولوولە دەمارییەکان پێکهاتووە..

بەڵام کاری هەردووکیان یەك شتە ئەویش گەیاندنی شەپۆلە ئەسیریە نەبینراوەکان و نەبیسراوەکان بە هەستەکانی مرۆڤ)).

سنیل، لەو باوەڕەدایە هەستی شەشەم: لە گیانلەبەرەکاندا زۆر بەهێزترە لە مرۆڤ. بەبڕوای ئەو گیاندارەکان بەتەواوی پشتئەستووری ئەو هەستەن.. چونکە گرنگترین هۆکارەکانی ژیانی ئاساییانە سنیل، چەندین نموونەمان بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانی بۆ دەهێنێتەوە لەسەر کاریگەرێتی ئەو هەستە لە گیانلەبەرو ڕووەکدا. وەکو ((هەستی ڕێڕەوی لە باڵندەکان....هتد. بەڵام مرۆڤ عەقڵی بیرکردنەوەی گەشەی کردوەو لەژیانیدا پشتی پێدەبەستێت، بۆیە کاری هەستی شەشەم لە مرۆڤدا کەم و لاوازبووە.

بەگوێرەی بۆچوونی (سنیل) هەتا ئێستەش هەستی شەشەم لە مرۆڤدا کاردەکات، بەڵام مرۆڤ پشتگوێی دەخات، یاخود وادەزانێت پێویستی پێی نیە، چونکە هەمیشە بەکاروبارەکانی ژیانەوە سەرقاڵە نەخشەیان بۆ دەکێشێت. بۆیە زەنگەکانی هەستی شەشەم لەو گەڕەلاوژە عەقڵیانەدا ون دەبێت. هەروەکو چۆن دەنگی سیسرکەیەك لە باخێکی ئاهەنگ و گۆڕانیدا ون دەبێت.

بەگوێرەی بۆچوونی سنیل: خاوەنی بەهرە نائاساییەکان هەتا جوڵەی بیرکردنەوەیان نەوەستێت ناتوانن ڕاستی تەواو بپێکن... هەندێك کەس لە هەندێك کاتدا دەتوانن جووڵەی مێشکیان بە شێوەیەکی کاتی بوەستێنن یاخود وەکو ((کاغەزێکی سپی)) لێبکەن. بۆیە لەو کاتانەدا دەتوانن هەستێکی نائاسایی شتەکان و بیرەکان بکەن.

سنیل دەڵێت: منداڵان بەشێوەیەکی ئاسایی هێزی نائاساییان زۆرترە لە گەورەکان، ئەویش دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە (نتوء)ە سنەوبەریەکەی منداڵ گەورەترە لە گەورەکان هەروەکو زانستی شیتەڵکاری ئامارژەی پێدەکات. هەروەها دەڵێت لە دڕندەو چیانشین‌و بیابانیشینەکان بە تواناترن لە شارنشینەکان بەهۆی دووری زیهنیان لە جەنجاڵیەوەو کەمتر بە کارهێنانی بیرکردنەوەیان لەژیان...

بەهەرحاڵ، ژمارەیەکی زۆر لە زاناکانی بواری سروشت پشتیوانی لێدەکەن چونکە زۆر بەسادەیی لێکدراوەتەوەو لەگەڵ تیوریە فیزیاییە نوێیەکانیشدا دەگونجێت.. هەروەکو لە پێشەکیەکەدا باسمان کرد، بۆچوونی باویش ڕووەو ئەو باوەڕەیە کە گەردوون لە شەپۆلە کارەباییەکان پێکهاتووە. ((Electromagnetic waves)).

پرۆفیسۆر (دنکان) مامۆستای سروشتناسی لە زانکۆی نیویۆرك دەڵێت: ((شەپۆلەکان بەبێ پسانەوە لەهەموو ماددەیەکەوە دەردەپەڕن‌و بەر شتەکانی دەوروپشتیان دەکەون و کاریان لێدەکەن))..

لێکۆڵینەوە نوێیەکانیش چەند جۆرێکی دیاریکراوی شەپۆلە کارەباییەکانیان دۆزیەوە کە لە مێشکی هەموو مرۆڤێکەوە دەردەپەڕن. ئەو شەپۆلانەش لە (خەو و بەئاگایی، بیرکردنەوەو سڕبوون، نەخۆشی و تەندروستیدا) جیاوازیان هەیە. بۆ ئەو مەبەستەش جیهازێکی کارەبایی تایبەتی بۆ تۆمارکردنی ئەو شەپۆلە مێشکیانە داهێناوە.

د. دایفس، دەڵێت: هەموو مرۆڤێك لە مێشکیەوە شەپۆلە مێشکیە تایبەتیەکانی خۆی دەردەپەڕێنێت و جیاوازە لە تاکێکی‌تر. بە واتایەکی دی شەپۆلە مێشکیەکان وەکو پەنجە مۆرەکان وایە دووکەس لەیەك ناچن.

لەسەر ئەو بنەمایە زۆر بەسادەیی دەتوانین بڵێین گواستنەوەی بیروبۆچوونەكان و شتە نائاساییەكانی دیكەش لە ئەنجامی شەپۆلە نەبینراوەكانەوە دروست دەبن ... هەروەها دەتوانین پێشبینی ئەوەبكەین كە ئەو بۆشاییەی چواردەوری گرتووین لێوانلێوە لە جۆرە جیاوازەكانی ئەو شەپۆلانەو بەبێ ئەوەی هەست بكەین چەندین شێوە كارگەرێتی جۆراو جۆریان لەسەرمان هەیە...

زۆر جار یەكێك بەبێ هۆیەكی ئەوتۆ هەست دەكات خەمبارە یاخود شادمان و بەختەوەرە... یاخود هەندێك جار ئێمە لەگەڵ یەكێكدا كۆك دەبین لەسەر ئەنجامدانی كارێك، بەڵام ئەگەر یەكێكی‌دی هاتە لامان بۆ هەمان مەبەست رەتی دەكەینەوە.. ئەگەر لەوكاتەدا پرسیاری ئەو هەڵوێستە دژینەیەمان لێبكرێت خۆشمان سەرمان سوڕدەمێنێ و هیچ وەڵامێكمان پێ‌نییە. كێ دەزانێ! لەوانەیە. قوربانیی ئەو شەپۆڵانە بین كەبەسەرماندا دەدەن و تووشی ئەو دژینانەمان دەكەن، بەبێ ئەوەی هەست بكەین پەلكێشمان دەكەن و بانگەشەی ئەوەش دەكەین كە عاقڵین!.

دەچینە شوێنێكەوە، سەرو دڵمان دەگیرێت، و دەچینە شوێنێكی‌تر، شادمان دەبین، لەوانەیە لەلایەنی مادیەوە جوانی شوێنێكیان و ناشیرینی ئەوی دیان هۆكارێك بێت بۆ ئەوە، بەڵام لایەنی مادی بەتەنها بەس نییە بۆ شیكردنەوەی ئەو دژینەیەی لە دەروونماندا هەستی پێدەكەین.

بەشێوەیەكی زانستی ئەو راستیە سەلمێنراوە كە (گەردیلە) چەندین شەپۆلی لەدەرەوە بۆدێن وەریان دەگرێت و پاشان دەیانداتەوە. لەوانەیە گەردیلەكانی (با) و گەردیلەكانی (دیوار)و پارچەكانی ماڵەكە شەپۆلە

هــەڵقوڵاوەكانی مێشــكی خاوەنەكــەیان وەرگرتــوەو كەچوینــە ژوورەوە دەیداتـەوە بـەڕووماندا، ئێمـەش بەشـێوەیەكی چاك یـان خـراپ و بـەبێ ئەوەی هەست بكەین دەكەوینە ژێر كارلێكردنیانەوە.

هاوڕێیەك بۆی گێڕامەوەو گوتـی: ڕۆژێـك بـەدوای شتێكدا دەگـەڕام، هەموو شوێنێكی بۆ گـەڕام و دەستم نەكـەوت.... بەسواری ئوتومبێلەكـەم دەسوڕامەوەو نـەمدەزانی چیبكـەم... لـە پڕێكـدا بـەبێ هـۆ سـوكانەكەم سوڕاندەوەو ڕوم لە شەقامێك كرد.. هەندێك ڕۆیشتم و لە پڕێكدا كەسێكم توشبوو كـە ئـەو شتەی لادەســت دەكـەوت كـە مـن بـەدوایدا وێـڵ بـووم. لەوانەیە ئەو چیرۆكە بەسەر هەمووماندا هاتبێ بەڵام بردوومانەتەوە سـەر ڕێكـەوت. ئـەو شـیكردنەوەیەش لەوانەیـە ڕاسـت بێـت بـەڵام دەشـتوانین بەدەنگەوە هاتنی شەپۆلە دەوورنیـەكانیش لێكی بدەینـەوە لـەنێوان ئـەو كەسەو ئەوشتەش كە دەیەوێت.

دەڵێن (رومڵ) سەركردەیەكی ئەڵمانی كە لەجەنگی جیهانی دووەمدا ناوبانگی دەركردبوو باوەڕی بە هەستی شەشـەم هـەبوو لـە سـەركردایەتی كردنــی شــەڕەكاندا.. ســەركردە ســەربازییەكانی ئینگلـیزیش لــە هــەموو هــەنگاوێكیاندا ورد دەبونــەوەو لێیــان دەكۆڵییــەوە، بۆهــەموو كــارێك حسابێكی تایبەتیان دەكرد.. (رومڵ)یش .لێدانێكی ئەوتۆی لێدان كەلـە هیچ پێوەرو پێوانەیەكی لۆژێكیاندا نەبوو.

هەمان شتیش لەسەر (هانیپال)ی سەركردەی قرتاژیەكان دەگێڕنەوە كە لەخاكی خۆیاندا ڕۆمانەكانی تێكشكاند.. هانیپاڵ دەیتوانـی مێشـكی دوژمنەكەی بخوێنێتەوەو نەخشەكانی ئاشكرابكات.

سینل دەڵێت: كچێك دەناسم توانایەكی بەهێزی هەیە لە وەرگرتن و ناردنی شەپۆلە دەروونیەكان. چیرۆكێكی لێدەگێڕێتەوەو دەڵێت: " رۆژێك چوومە ماڵی هاوڕێیەكم ... دوای نیوەڕۆ گەیشتم كەبینیم ژنی هاوڕێكەم چێشتم بۆ ئامادە دەكات...تووشی سەرسوڕمان بوم لەو كارەی چونكە ئەو رۆژەی من چووم رۆژی پشوونەبوو كەبەشێوەیەكی ئاسایی سەردانی ئەو هاوڕێیانەم دەكرد... لە باخچەكەدا كچەكەم ماچ كردو پێی گوتم: "كەواتە ئەم بەیانییە نامە بێتەلەكەی منت پێگەیشت، زۆر تامەزرۆ بووم ئەم دوای نیوەڕۆیە سەردانمان بكەیت". لە راستیشدا ئەو بەیانیەی كە گەشتەكەم دەستپێكرد كە (سێمیل دەبێت بە شەمەندەفەرو بەراستی ئەو بەیانیە ئارەزویەكی زۆر رووەو ئەو ماڵەی بردم". ئەو چیرۆكە بوارێكی فراوانمان بۆ دەڕەخسێنێ لەڕامانی شتەكاندا. ئارەزوویەك لە دەروونی یەكێكدا، پەلكێشی یەكێكی دی دەكات. لە شوێنێكی دوورەوە بۆلای بچێت. ئەو كارە زۆر دوورە لەباوەڕەوە بەلام دەبێت رووبدات.

مرۆڤ هەندێك جار دۆش دادەمێنێت و نازانێت بۆ كوێ بچێت لە پڕێكدا شەپۆلی دەرپەریوی یەكێك داوای هاتنی لێدەكات و بەدەنگیەوە دەچێت و خۆی دەداتە دەست ئەو شتەی بۆی هاتووە.

ئالەوێدا كاریگەرێتی ئەو شتەی كە خەڵكی پێی دەڵێن (بەخت) دەردەكەوێت.. ئەو كەسەی لە دەوورنیدا جیهازێكی بەهێزی هەیە بۆ ناردن و وەرگرتنی شەپۆلەكان، دەتوانێت كار لە خەڵكی بكات و رووەو ئەو شوێنەی خۆی ئارەزووی دەكات ئاراستەیان بكات بەلام ئەو بەستەزمانەی جیهازی شەپۆلەكانی لاوازبووەو هێزەكانی كپ بوون و دڵیشی پڕبووە لە ڕەشبینی، هیچ سوودێك و كاریگەرێتیەكی نابێت

لەسەر دەوروپشتەکەی... چارە رەشەکان ئارەزوی ئەوە دەکەن یەکێك بێتە لایان، بەلأم ئەو کەسە پتر لێیان دوور دەکەوێتەوە داوای شتێك دەکەن دەستیان ناکەوێت. ئەوان کاتێك شتێکیان دەوێت خەیاڵیان ئیرادەیەکی پێچەوانەیان دەداتێ چونکە چەندین جار ژێر کەوتن‌و روخانیان تاقی کردۆتەوەو وێنەی ئەو ژێرکەوتنەشیان لە زیهنیاندا جێگیرکردووە. بۆیە دەیانبینی هەوڵدەدەن‌و خەبات دەکەن‌و لەماندوبوون‌و ئازار چەشتن زیاتریان دەست ناکەوێت.

کەواتە لەولایەنەوە کۆمەلأنی خەڵك دابەش دەکرێن بەسەر دوو تیپدا: تیپێکیان ژیان لەبەردەمیاندا دەنوشتێتەوەو بۆیان نەرم دەبێت‌و کۆمەلأنی خەڵکیش لە خزمەتیاندایە. تیپەکەی دیش تێدەکۆشن‌و رەنج دەکێشن بەلأم ژیانیان گرانترو ئاڵۆزتر دەبێت..

کاتی ئەوە هاتووە کۆمەلأنی خەڵك لە نهێنی (بەخت) بگەن. ئەو نهێنییەی کەلای نەوەکانی رابردوو شاراوە بوو، هەروەها ئاورێك لەدەروونی مرۆڤ بدەنەوە کە چەندین هونەری هێزی لە خۆگرتووە چەندێك ئاگای لێ‌ی نەبێت ئەوەندە لەکارکردندا توندو تۆڵە، کاتێکیش پشتگوێ‌ی بخەین ، ئەو گرنگیمان پێدەدات.

هەروەکو گوتمان ژمارەیەکی زۆر لە توێژەرەوەکان لەگەڵ ئەو بۆچوونەدان کە هێزە نائاساییەکان لە ئەنجامی شەپۆل یاخود لەرینەوە شاراوەکاندا ڕوودەدەن بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێبکات دەکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوە ئەو بۆ چوونەش روو بەرووی چەندین بەرپەچ دانەوە بوەوە گرنگترینیان:-

١-لێکۆڵەرەکان گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی کە هێزە نائاساییەکان ناکەوێتە ژێر کاریگەرێتی (ماوە)وە... کەسێکی بەهرەدار دەتوانێت لەنزیكو دوورەوە مێشکی خەڵکی تر بخوێنێتەوە لەهەندێك تاقیکردنەوەکانی (راین)ەوە دەرکەوتووە کە مرۆڤ لەدوورەوە چاکتر دەتوانێت شتە غەیبییەکان بزانێت ئەو راستیەش گریمانی شەپۆلەکان رەتدەکاتەوە. چونکە هەرچەندێك ماوە دووریەکەی زۆرتربێت ئەوەندە شەپۆلە کارەباییەکان لاوازتر دەبن.

٢- هەروەها توێژینەوە زانستیەکان دەریانخستووە: کە هێزە نائاساییەکانی مرۆڤ هەندێك جار دەتوانێت پێشبینی رووداوەکانی داهاتوو بکات ئەو راستیەش دووبارە گریمانی شەپۆلەکان رەتدەکاتەوە. چونکە مرۆڤ ناتوانێت پێشبینی ئەو شەپۆلە دەرپەڕیوانە بکات کەهێشتا روویان نەداوە یاخود ئەو شتەی هێشتا دروست نەکراوە، وسبەینێش چی بەسەردا دێت.

ئەو دوو بەرپەچدانەوەیەش زۆر بەهێزن. بەلآم لەروویەك لەرووەکانیانەوە خاڵی نین لەلاوازی، لەوانەیە بشتوانرێت رەت بکرێنەوە ئێمە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا شتێکی ئەوتۆ دەربارەی سروشتی هێزە نائاساییەکان نازانینو هەتا ئێستاش لەسەرەتای ڕێگەداینو نازانین لەرۆژگاری داهاتوودا توێژینەوە زانستیەکان چیمان بۆ ڕوون دەکەنەوە دەربارەی نهێنیەکانی ئەو رێگەیە، رەنگە شەپۆلەکانی هێزە نائاساییەکان لە تیشکە وێنەگرەکانو تیشکە گەردوونیەکان زۆر کورتتر بن، لەگەڵ ئەوەشدا. کە شەپۆلە کارەباییە تایبەتمەندیەکانو شێوازی رێڕەوەکانیان جیاوازن لە رووی درێژیو کورتیدا لەیەکتری جیاوازن.

ئەو ئیزگە رادیۆیانەی لەم سالآنەی دواییدا گوێیان لێدەگرین فێری كردووین كە هەندێك جار شەپۆلە كورتەكان لە دوورو نزیكەوە چۆن بەڕوونی و ئاشكرایی گوێمان لێیان دەبێت. چونكە ئەو شەپۆلانە كاتێك لە رووەو ئاسمان بەرزدەبنەوەو لەوێدا لەگەڵ چەند چینێكی دیاریكراودا بەریەك دەكەون و پاشان لە دوورییەكی زۆرەوە دێنە سەر زەوی بەبێ ئەوەی ئەو دوورییە كاریگەرێتیەكی زۆری هەبێت لەسەری... ئێمە چاوەڕێی زانست دەكەین. لەدوا رۆژدا ئەو راستیانەمان بۆ دەربخات ئەوانەی زانراوو نەزانراون... لەوانەیە نەوەكانمان كاتێك دەگەنە ئەو پلە بەرزەی پێشكەوتن، بەو نەزانی و كەمتوانایییەی ئێمە هەمانبووە پێبكەنن.

لێكۆڵینەوەكانی ئەنشتاین ئاماژە بەوە دەكەن: شەپۆلەكان بەبۆشایی ئاسمانێكدا دەڕۆن، ئەو ئاسمانە نییە كە ئێمە پێشبینی دەكەین.. ئێمە وا ڕاهاتوین وا لەبۆشایی گەردوون بكۆڵینەوەو تێبگەین كەسێ دووربەندی هەیە، بەڵام ئەنشتاین دەڵێت: بۆشایی ئاسمان چوار دوربەندی هەیە: (درێژی ، پانی، بەرزی، كات)، لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونەی ئەنشتاین (كات) دووربەندی‌یەكە لە بۆشایی ئاسمان هەروەكو دووربەندیەكانی ترو جیاوازیەكی جەوهەریان نیە.

واتای ئەو لێكۆڵینەوەیەش: پێشبینی ڕووداوەكانی داهاتوو لە جەوهەرەكەیدا هیچ جیاوازیەكی نیە لە هەست كردن بەشتەكان لەكاتی ئێستادا و دەروونی مرۆڤ ئەگەر بتوانێت بەربەستی دووریەكانی شوێن ببڕێت، دەشتوانێت بەربەستی دوریەكانی (كات)یش ببەزێنێت... ئەو دەتوانێت شتێكی شاراوەو نادیار لەخۆیەوە ببینێ لەداهاتوودا،

بەهەمان ئەو ئاسانکاریەی کە شتێکی نادیار لەخۆی دەبینێت لەیەکێك لەو سێ دووربەندیەی تری بۆشایی ئاسمان.

ئێمە ناتوانین ئەو وێنەیە پێشبینی بکەین، چونکە واراهاتوین کات و شوێن جودا لە یەکتری ببینین.

بەڵام توێژینەوە ماتماتیکییە نوێیەکان لەو پێشبینیکردنەدا هیچ بەربەستێك نابینن، لە دیدی ئەوانەوە (کات) درێژبونەوەیەکە لە بۆشایی ئاسماندا هەروەکو درێژبوونەوەکانی درێژی و پانیو بەرزی. دووری نێوان (رابردوو)، (داهاتوو) لە ناوەڕۆکی سروشتەکەیدا هیچ جیاوازیەکی نییە لە دوورییە دیاریکراوەکانی سەر ڕووی زەوی. کەواتە هیچ جیاوازیەك نییە لەنێوان ئەو شتەی مرۆڤ لە ڕوداوەکانی سبەینێدا دەیبینێو ئەو ڕوداوانەی ئێستا لە وڵاتدا ڕوو دەدەن.

بەو پێودانگە (کات) وەستاوەو ئێمە لە جووڵەداین، لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی دی و بە درێژایی هێڵی درێژکراوەی (کات) هەنگاو دەنێین.

ئەوەی لە شەمەندەفەرێکدا سوار بووە، کاتێك لە پەنجەرەکەوە دەڕوانێت لەو باوەڕەدایە کە شتەکانی دەرەوەی شەمەندەفەرەکە دەڕۆن و ئەو ڕاوەستاوە.. لەو ڕوانگەیەوە مرۆڤ وای دەبینێ کە (کات) جوڵاوە، بەڵام لەڕاستیدا (کات) چەسپاو و جێگیرە..

دواڕۆژ بۆ لای ئێمە نایەت و ئێمە رووەو ئەو دەچین.. ئەو لە (ئەوێدا) ... و لە خاڵێك لە خاڵەکانی(کات) دایە. مرۆڤیش ئەگەر بەهرەمەندبێت بەهەستە نائاساییەکانییەوە دەتوانێت ئاگاداری بێت..

خوێنەری بەڕێز: وای دابنێ تۆ لە بەلەمێکدای و بەهێواشی لە ڕووبارێکدا دەڕۆیت، لەو کاتەدا تۆ دەتوانیت خاڵ بە خاڵی کەنارەکە

ببینــی لەوکاتــەدا کــە رووبــەڕوویان دەڕۆیــت.. بــەلام ئەگــەر لەوکاتــەدا فڕۆکەیەك بەهەمان ڕێڕەوی تۆ و بەخێراییەکی زۆرەوە بەسەر سەری تۆدا بـڕوات، دەتوانێـت ئـەو شـتەی تـۆو ئەوانەشـی دوای چـەند کـاتژمێرێك ببینێ.. ئەو بەگوێرەی تۆ دەتوانێ دواڕۆژیش بیبینـێ.. ئەو هەرچەندێك بـەرزتر بێتـەوە هـێزەی بینینـی خاڵــە دوورەکـانی داهــاتوو، ڕابــردوو، گەورەتر و زۆرتر دەبێت.

پرۆفیسۆر (جینز) لەوبارەیــەوە دەڵێـت: (کـات) لـە سـەرەتاکەیەوە هــەتا کۆتاییەکــەی لەبەرامبــەرماندا درێژبوەتــەوە، بــەڵام تەنــها بەیــەك خاڵیـەوە پـەیوەندی دەکـەین، هـەروەکو تایـەی پاسکیل لەیـەك خاڵدا بــە زەوییــەوە پــــەیوەندی هەیــــە. کەواتــــە هــــەروەکو (ڤــایل) دەڵێـــت: (ڕوداوەکان)، ڕوونادەن بەڵکو ئێمە بەلایاندا تێدەپەڕێن.....

بۆ نموونـەو بۆ زیـاتر تێگەیشـتن: ئێمـە بـاجۆرێك لـە بونـەوەر لـە دیدماندا دابنێین کە تەنها دوو دووربەندی هەیە. (درێژی و پانی)، وەکو تارمایییەکان کە (بەرزیان) نییە ئەو بونەوەرانە دووربەندی سێیەم نازانن.. ئەگەر شتێکی خاوەن سێ دوربەندی بەلایدا تێپەڕێت، لەدوو دووربەندی زیاتر نابینێت و دووربەندی سێیەمیان لە دەرەوەی بواری هەسـتیدایە.. دەرکی پێناکات تەنها مەگەر خاڵ بەخاڵ بەلایدا تێپەڕێت.

لەڕاستیدا ئێمــەش وەکـو ئــەو بونەوەرانــەین بەرامبــەر دووربــەندی چوارەم کەپێی دەڵێن (کات)، لەچەند بەشێکی دیـاریکراو زیـاتر هیـچ شتێك دەربارەی گەردوون نازانین. ئەو (حەقیقەتانە) لە چوار دووربەندی پێك هاتوون، بەڵام هەسـتەکانی ئێمـە تەنـها پـەیوەندی بـە سـیانیانەوە

دەکەن. دووربەندی چوارەمیش هەروەکو چۆن زەوی لەژێر تایەی پاسکیلێکدا تێدەپەڕێت بەو شێوەیە بەلاماندا تێدەپەڕێت.

شەپۆلە کارەباییەکان بەهەموو جۆرەکانیەوە لە بۆشایی ئاسماندا بەچوار دووربەندیدا دەجولێن.. بەهەر حاڵ ئەو گریمانە لاوازە، بەڵام کۆمەڵێك شوێنکەوتوو و پشتیوانی هەیە گرنگترینیان:-

١- توێژینەوە فیزیاییە نوێیەکان دەریانخستووە (تیشکە رووناکیەکان) جارێك لەشێوەی شەپۆلەکاندا دەردەکەون و جارێکی دیش لەشێوەی دەرچوونێکی تیژڕەوی یەك لەدوای یەك، چەشنی دەرچوونی ڕێژنەی گوللە خۆیان دەنوێنن.. زاناکان لە لێکدانەوەی ئەو دوو فاقیزمیەی (تیشکە ڕوناکیەکان) دا سەریان سوڕماوە.

٢- هەروەها لێکۆڵەرەکان ئەو هەڵبەزودابەزەی ئەلەکترۆنیان لە گەردیلەدا دۆزیوەتەوەکە لە بوارێکەوە دەچێتە بوارێکی دیو پابەندی بوارێکی چەسپاویش نیە... ئەگەر لەبوارێکەوە بچێتە یەکێکی دی بەهەمان دووری‌دا ناروات کە هەردووبوارەکەی لەیەکدی جیا دەکاتەوە... لە بوارێکدا ون دەبێت و لە یەکێکی دیدا سەرهەڵدەداتەوەئایا لەکاتی ئەو هەڵبەزودابەزەدا بۆ کویّ دەچێت؟؟.

من لەو باوەڕەدام لەو کاتانەدا دەچێتە دووربەندی چوارەمەوە. لەوانەشە بچێتە (کات)ێکی دووری (رابردوو داهاتووەوە) ئێمە چ شتێك دەزانین لەوانەشە لەیەك چرکەدا بچێتە هەزاران ساڵی رابردوو یاخود داهاتووەوەو پاشان دەگەڕێتەوە (کات)ی ئێستامان، هەروەکو هیچ شتێکی ئەنجام نەدابێت.

٣- هەروەها لێکۆڵەرەکان دەڵێن : ئەلیکترۆن لە شەپۆلەکانی نێو گەردیلەدا رەوشتێکی نامۆی هەیە کە هیچ هۆکارێکی نیەو هیچ یاسایەك کۆنترۆڵی ناکات چونکە ئەو بەیەك بواردا ناروات تابتوانرێت دەستنیشانبکرێت.

لەسەر ئەو بۆچوونە (هایزنبرگ ) پرنسیپێکی نوێی لە زانستی فیزیادا داناو ناوی لێنا (دیاری نەکردن). ناوەرۆکەکەشی دەڵێت: سروشت لە پرنسیپە بنەرەتیەکەیدا ناکەوێتە ژێر کاریگەرێتی و دیاریکردنی هیچ یاسایەکەوە، ئەو رێرەوێکی چۆنایەتی دەگرێتەبەر هەروەکو ئەوەی خاوەنی توانایەکی خودی یاخود ئیرادەیەکی ئازادبێت.

بەبۆچوونی (هایزنبرگ)، ئەو یاسا سروشتیانەی لەگەردوندا دەبینرێت، تەنها کۆمەڵێك یاسا(ئەگەرەکان و، هاوکێشەکان)ە بەواتایەکی دی... ئەو یاسایانەی دەبینرێن هاوکێشەیەکی جوتەیی یە کە بلیۆنان (ئەلکترۆنی) گەردوونی پێ دەجولێت. بەڵام ئەلکترۆنی (تاك) جوڵەیەکی بێبنەماو لەخۆوەی هەیە کە هیچ سیستەم و کۆنترۆڵ و پەیوەندییەکی نییە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم بابەتەدا ژمارەیەك لەزاناکان ئەو جوڵە لە خۆوەی رێرەوی ئەلکترۆنەکان دەگێرنەوە سەر کورتبینی چاودێری کردنی ئێمە بۆ جوڵەی ئەلکترۆنەکە... چونکە بەگوێرەی بۆ چوونی ئەوان ئێمە تەنها چاودێری سێبەری ئەلەکترۆن دەکەین و ناتوانین چاودێری خودی خۆی بکەین . چونکە ئەو لە بۆشاییە ئاسمانیەداوەجولێ کە خاوەنی چوار دووربەندیە. بەواتایەکی دی ئەو لە جولەکەیدا. دووربەندی (کات) یش دەگرێتەوە، بەڵام ئێمە تەنها لەرێگەی هەرسێ

دوربەندیەکەمانەوە جوڵەکەی دەبینین پرۆفیسۆر. (جینز) لەوبارەیەوە دەڵێت:-

((.......... ئەو شتەی وامان لێدەکات سروشت بخەینە ژێر دیاریکردنەوە ئەوەیە دەبینین کەلە دووروبەندیە زۆرەکاندا روودەدەن. بۆنموونە: جۆرێك لەکرمی کوێر بێنەپێش چاوی خۆت کە درکەهەستیەکانی تویژاڵێکی زەوی پتر نابینێت و خاوەنی تەنها دوو دووربەندیە، ئەو تەنها ئەوەندە دەبینێ کەزەوی جاربەجار ئاو دایدەپۆشێت... بەلام ئێمە دەتوانین هەست بەدووربەندی سێیەم بکەین و ئەوتەڕیە بەبارینی باران شیبکەینەوە، هەروەها دەتوانین پێشبینی ئەوەش بکەین و ئەو شوێنانەش دیاری بکەین کە باران تەڕی دەکات... بەلام ئەو کرمە کوێرانە هەست بە دووربەندی سێیەم ناکەن و توانای ئەوەیان نیە بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێن کە بەشێکی زەوی تەڕدەکات و بەشێکی تریش وشکە)).

هەروەها (جینز) دەڵێت: ((.... ئەو سێبەرانەی دەکەونە سەر دیوارێك تارماییەکی خاوەن دوو دووربەندی دروست دەکەن لەو ڕاستیانەی کە خاوەنی سێ دووربەندین. لەسەر ئەو بنەمایەش ئەو ڕوداوانەی کە لە (کات)و (شوێن)دا ڕوودەدەن جگە لە ڕیزبەندیەکی جولاوی شێوەی سێبەرە سیحرینەکان پتر نییە کە دێن و دەڕۆن)).

لەو گوتەیەی (جینز)ەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو بێسەرەو بەریەی لە ڕێڕەوی ئەلکترۆنەکاندا دەبینرێن، بێسەروبەرییەکە لەمێشکی خۆماندا.. لەوانەیە ئەو هۆکارانەی دەسەلاتیان بەسەر ڕێڕەوی (ئەلەکترۆنەکاندا) هەیە لە دووربەندی چوارەمدابێت و ئێمە نەتوانین

بیبینـین... هـەروەها ئـەو گوتەیـە دەمانگەیەنێتـە ئـەوەی بڵێـین : ئـەو هۆکارانـەی هــەموو گــەردوون دەجوڵێنــن لــە (کــات)ی (رابــردوو) یــان (داهــاتوو)دا بەرجەســتە دەبێــت. کەواتــە (ئــەلکترۆن) بـــەو پاڵنەرانـــە دەبزوێت کە لـە ساتەوەختێکەوە بـۆ یـەکێکی دی بـۆی دێـت، کـە ئـەو ساتەوەختانە نییە ئێمە تێیدا دەژین.

ئەو گریمانەش لاوازە هەروەکو گوتمان، بەڵام دەتوانین وەریبگرین لەسەر رۆشنایی ئەو تێگەیە نوێیەی کە ئەنشتاین بۆ (کات) و (شوێن)ی کردووە... بەڕاستی ئەو تێگە نوێیەی ئەنشتاین. زۆر ترسناكو گرنگە. هـەروەکو زانراویشـە گرنگترین پێگـەکانی ئەو کودەتایەیە کە ئـەمڕۆ لـە فیزیـای نوێـدا ڕوودەدات لەسـەر بنـەمای ئەوانـەش پێشـبینی کردنـی ڕووداوەکـانی دوارۆژ کـارێکی مـەحاڵ نیـە. ئـەو کەسەشـی بـە مـەحاڵی بزانێت لە هەندێك رووەوە لەو کرمـە کوێرانـە دەچێت کـە نکوڵـی لـەبوونی دوربەندی چوارەم دەکەنو ئەو شـەپۆلە شاراوانەی یارمـەتیمان دەدەن بۆ هەستە نائاسـاییەکان، دەتوانێـت پـەیوەندی بـە دوارۆژەوە بکـاتو ئـەو شـتانەش بزانێـت کـە ڕوودەدەن... ئـەو لـە گـەردوونێکدا دەجوڵــێ کــە (ڕابردوو داهاتوی) نییە... هەموو شتێکیش کە ڕوویانداوەو ڕوودەدەن، لە(ئەرێ) دایە.. لەلایەك لەلایەکانی ئەو گەردوونە سەرسوڕهێنەرو سەیرە.

لەوانەیـە یـەکێك بپرسـێت چـی پەیوەندیـەك هەیـە لـەنێوان ئـەو شەپۆلە شاراوانەو بابەتی عەقڵی ناوەوەدا؟؟

ئەو پرسیارەش سەرنجی خوێنەر بەلای ئەو شتەدا ڕادەکێشێت کە لەمەوبەر لـێی دواین سەبارەت بە ماهیـەتی عـەقڵی نـاوەوە. ئێمـە عـەقڵی نــاوەوە بــەو جیــهازە دەروونییــە دیــاریکراوە دانــانێین کــە خــاوەنی

تایبەتمەندێتی و کارێکی تایبەتی بێت.. لەڕاستیشدا کە ناوی لێنراوە ((عەقڵ)) بەمەبەستی ئاسانکارییە... بەگوێرەی ئەو تێگەیەی ئێمە لەم کتێبەدا لەسەری دەدوێین (عەقڵ یاخود شتێك) نیە کە لەو عەقڵە بچێت ئێمە لە زمانی ئاساییدا مەبەستمانە.. ڕوونتر بڵێین دەستەواژەیەکی گشتییەو سەرجەم ئەو جموجوڵ و چالاکییە دەروونیانە دەگرێتەوە کە کاردەکەنە سەر ڕەوشتی مرۆڤ و ئەو هەستی پێناکات.

بەواتایەکی دی ئارەزووە سەرکوتکراوەکانو هەستە نائاساییەکان لەخۆ دەگرێت. لەو شتانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە عەقڵی ناوەوە دوو جۆر هاندەرو پاڵنەری تێدایە: لەلایەکەوە کانگای گرێ دەروونیو ئارەزووە سەرکوتکەرەکانە.. لەلایەکی تریشەوە سەرچاوەی هەڵقوڵێن و دەرپەڕاندنی هەستە نائاساییەکانە.

بۆیە لەیەك کاتدا دەبێتە سەرچاوەی خێرو شەڕیش..

لەمەوبەر گوتمان هاندەرە ناهەستیەکانی مرۆڤ باشترین ڕێپیشاندەرن بۆ چارەسەرکردنو ڕێکخستنی کاروبارەکانی، مەبەستمان لەو هاندەرانە بوو کە لە بەشە نائاساییەکانی عەقڵی ناوەوە هەڵدەقوڵێن نەك بەشی کانگای ئارەزووە سەرکوتکراوەکانی.. کورتەی ئەو لێکدانەوەیەش: پێویستە ئێمە لە دیاریکردنی هاندەرە ناهەستیەکانماندا زۆر وریابین چونکە هەندێك جار جلوبەرگی ململانێ‌وگرێ‌و وەسوەسە و ئارەزووە سەرکوتکراوەکان لەبەردەکات. و مرۆڤ ڕوەو ڕوخانو ژێرکەوتن و هیچو پووچی دەبات.

کاتێك (ولیم مارستون)، ئامۆژگاری خوێنەران دەکات خۆیان بدەنە دەست (بیرە کوتوپڕەکانیانەوە) مەبەستی خوێنەرانی وڵاتانی

ڕۆژئـاوابووه.. چونکـه شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا یارمـەتی تاکـەکان دەدات لــەپێناو گەشــەکردنی کەســیەتیەکی بــێگرێ.. ئــارەزووە تــاکی و کۆمەڵایەتیـەکان لـەوڵاتانی ڕۆژئاوادا.. ئـەو سـەرکوتکردنە لـە خۆنـاگرێت وەك لە ڕۆژهەڵاتی خۆماندا سەرکوت دەکرێن..

لەوێدا مرۆڤ هەرکەچاوی بە پێویستەکانی ژیانی هەڵێنا دڵنیایە لە لایەنە سێکسی و ژیاریەکانی. بۆیە ناهەستیەکانی پاکترو بەتواناترە لە مرۆڤەکانی ڕۆژهەڵات.

شارســتانیەتی ڕۆژهــەڵاتی ئێمــە، چــەندین هۆکــار و پاڵنــەر لەخۆدەگرێت کـە دەبنـە هـۆی سـەرکوتکردنی ئارەزووەکان و گەشـەکردنی گـرێ دەروونیـەکانی تـاك. بەڵگەنەویسـتە ئـەو هۆکارانـەش لـەنێو چینـە هـەژارەکان و نەخۆشـەکاندا زۆر توندوتیژترە.. کۆمەڵگە دڵرەقەکـەی ئێمـە لەلایەکەوە هۆکارەکـانی هـەژاری و نەخۆشــی دروسـت دەکـەن و لەلایـەکی تریشـەوە ڕق و بـێزاری بەرانبــەریان هــەڵدەگرین. لەئــەنجامی ئەوەشــدا توشی گرێیەکی دەروونی دەبن و لێیدەرباز نابن.

بـۆ نموونـە: ئەگـەر یـەکێك لـە ئێمـە لـەدورەوە کچێك ببینــێ هـەموو جوڵەو ئارامیەکەی لەدەست دەدات لەوانەیە لەچاوتروکانێکدا ببێتە (دون جـوان). یـاخود بەپێچەوانـەوە چـەند پیـاوێك ببینــێ دەبێتـە پاڵـەوانێکی خوێنڕێژ.. یان: دەوڵەمەندو خـاوەن سـەروەت و سـامانێك ببینـێ لەبەری هەڵدەستێ و ماستاوی بۆ دەکات.

ئــەم هــەموو دژینەیــە لــە ئارەزووەکــانیدا بوارێکــی سروشــتی نادۆزنــەوە لــەواقیعی ژیــانیدا ڕوەو لەبلــەبانی و ماســتاوچێتی.. هتــد.. دەیبات.

کەواتە ئێمە لەم ولاّتانەی جیهانی سێدا ناتوانین ئامۆژگاری یەکێك بکەین گوێ لە هاندەرەکانی عەقڵی ناوەوەی بگرێت بەبێ ئاگاردارکردنەوەو وریاییەکی زۆرەوە.. پێویستە زۆر ئاگاداری هەڵچونەکانی ئارەزووە سەرکوتکراوەکانی بێت هەتا نەیکاتە داردەستی خۆی.

هەر یەکێك لەئێمە ئەگەر لە دانیشتی پیاوێکی بەرزو خاوەن دەسەلاّت، یاخود پەرلەمان یان مامۆستایان یاخود هەر دانیشتنێکی تردا بێت، خۆی لەنێوان دوو هەڵوێست دا دەبینێت و نازانێت قسە بکات. یان بێدەنگ بێت، چونکە هەندێك جار (قسەکردن لە هەندێك جاری دیش لەخەڵون)ە.. ئەو لەوکاتەدا هاندەرێك ڕووەو قسەکردنی دەبات و هاندەرێکیش ڕووەو بێدەنگی... بۆیە لەو نێوانەدا سەری سوڕدەمێنێ و نازانێت کام لەو هاندەرانە وەسوەسەیەو کامیان ئیلهامە.

من ناتوانم بنەمایەکی گشتی پێشکەش بە خوێنەر بکەم بۆ ئەوەی لە هەڵوێستیدا لەسەری بڕوات. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بە وریاییەوە بڵێم: ئەو کەسەی هاندەرە جۆراوجۆرەکان بپشکنێ و پاشان پاکیان بکاتەوە و ئەو شتە هەڵبژێرێ کە بانگەشەی دڵسۆزی بۆ دەکات، ئەو کەسە بۆماوەیەکی دوورو درێژ. لەکارەکانیدا سەردەکەوێت.

ئەگەر حەزت کرد لەو دانیشتنەدا قسەبکەی و ئەو پاڵنەرەشت کەڕووەو قسەکردنت دەبات بۆ وەدەستهێنانی ڕێزو حورمەتی ئامادەبووان، یاخود خۆلەپێشکردن بێت بۆ دەسەلاّتدارەکان، دڵنیابە زوو یا درەنگ تۆ دۆڕاوی.

((هێزەکـانی)) نەسـت تەنـها لـە دەرونێکـی پـاکی دڵنیـاوە هەڵدەقوڵێن[1].. ئەگەر بۆ تێرکردنی ئارەزووە سەرکوتکراوەکانت بەکاری دەهێنێت چاوەڕێی خێری لێمەکە..

ڕۆژێـك دەوڵەمـەندێکی بـەناوبانگی بـەریتانیا، کاغـەزێکی پـارەی هـەزار جونەیـهی خسـتە زەرفێکـەوەو بـەڵێنی دا هـەر کەسێك ژمارەی ئـەو پارەیەی پێبڵێ ئەو هەزار جونەیهەی پێببەخشێت. بەڵام ماوەیـەکی زۆر لای مایەوەو کەس نەیزانی، نووسەرەکان لە بەریتانیادا ئەوەیان کرد بە بەڵگەیەك بۆ بە درۆخستنەوەی هێزە نائاساییەکانی مرۆڤ.

سینل، سـەبارەت بـەو ڕوداوە دەڵێـت: هیـوای دەسـتکەوتنی ئـەو هەزار جونەیهە لە مرۆڤدا، شێلگیریو بیرکردنەوەی زۆر دروست دەکات. ئەو بیرکردنەوەیـەش هیچ بوارێکـی نادات بـۆ ئـەوەی زیـهنی ڕووەو پارەکە بچێت و ژمارەکەی بزانێت، هەرچەندێك ئەو مرۆڤە بەهرەداریش بێت.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ شێلگیرە لەسەر وەدەستهێنانی شتێك و واتـای ئـەوەش: بـیری لێدەکاتـەوە بۆیـە نـاتوانێت بەشـێوەیەکی چـاك عـەقڵی نـاوەوەی بەکاربـهێنێت... بەواتایـەکی دی: ئـیرادەو ئیلهامـەکانی لـەو شتەدا کۆنابنـەوە .. هەرچـەندێك ئیرادەکـەت بـەهێز بکـەیت ئیلهامـەکانت لاواز دەبـن: تۆنـاتوانیت سـوود لـە عـەقڵی نـاوەوەت وەرگریـت ئەگـەر مەبەستی کارکردنەکەت ناوبانگ و پارەو دەسەڵات بێت.

ئەو پیاوو ژنە جوامێرانەی بەکارەکانیان ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕیوە بـەرژەوەندی خۆیانیـان نەخسـتوەتە پێش بـەرژەوەندی کۆمـەڵانی خـەڵك.

[1] بسم الله الرحمن الرحيم ((يا أيتها النفس المطمئنة أرجعی لربك راضية مرضية (و).

بەشێوەیەك ڕۆچوونەتە نێو پەیامە کۆمەڵایەتیەکەیانەوە خۆیان و خزمو کەسوکارو ناسیاوەکانیان لەیاد کردەوە.

(تشنەر) لەوباوەڕەدایە، ئەو (فاڵگرانەی) کە دەڕوواننە تۆپە بلوریەکان، بۆ خاوێن کردنەوەو پاککردنەوەی فیکری خۆیانە چونکە لەوکاتانەدا بەهرە نائاساییەکانیان دەکرێتەوە.. (سینل)یش جەخت لەسەر ئەو بۆچوونەی (تشنەر) دەکاتەوە و لەوباوەڕەدایە ئەوانەی بە گۆچانە دۆزەرەوەکانیان ئاوی ژێر زەوی دەدۆزنەوە، یاخود ئەوانەی فنجانو دەست دەخوێننەوە، کە دەڕواننە شتەکانی بەردەستیان (فنجان، دەست) مەبەستیان ئەوەیە جوڵەی بیرکردنەوە ئاساییەکانیان ڕاگرن و زیهنیان بۆ وەرگرتنی لەرینەوە دۆزرەوەکان ئامادە بکەن.

(سینل) مەرجێکی داناوە بۆ ئەوەی (هێزە) نائاساییەکانی مرۆڤ چالاك بێت: جوڵەی مێشك بە شێوەیەکی کاتی رابگیرێ، بەشێوەیەك بکرێت بە " لاپەڕەیەکی سپی" لەوکاتەدا مێشکی مرۆڤ وەکو ئەو رادیۆیەی لێدێت کەمیلەکەی بۆ ئیزگەیەکی دیاریکراو بگەڕێت، تەنها لەو ئیزگەیەشەوە نەبێت شەپۆلەکان وەرناگرێت.

"سینل" کاتێك تاقی کردنەوەکانی لەگەڵ کچێکی بەهرەمەنددا ئەنجامدەدا، لە گیرفانەکانی، یاخود جانتاکەیدا چەندین شتی جۆراو جۆری دەشاردەوە و پاشان پرسیاری لێدەکرد.. هەموو جارێك کچەکە لەسەرەتادا پێی دەگوت: ((تۆزێك چاوەڕێم بە هەتا مێشکم خاڵی دەکەمەوە)).

پاش ماوەیەك دەیگوت: ئێستا من ئامادەم.. لە دواییدا بە وزەیەکی سەرسوڕهێنەرەوە یەك بەیەك ناوی شتەکانی دەگوت..

هەروەکو لە بەشی ڕابردوودا گوتمان عەقڵی دەرەوەو عەقڵی ناوەوە لەسروشتیاندا جیاوازن، یاخود بەواتایەکی دی لە دوولای دژەیەکدان. ئەگەر جموجۆڵی یەکێکیان زیادی کرد ئەوی دیان لاواز دەبێت... لەوانەیە ئەو دژینەیەش هۆکارێکی سەرەکی بێت بۆ ئەوەی لەکاتی خەواندنە موگناتیسیەکاندا هێزە نائاساییەکانی عەقڵی ناوەوە بە چاکترین و روونترین شێوەکانی دەربکەوێت... چونکە ئەو کەسەی بەشێوەیەکی موگناتیسی خەوێندراوە و عەقڵی هوشیاری (دەرەوە) سڕبووە. بۆیە تەنها ئاگای لەو شتانەیە کە خەولێنەری موگناتیسی فەرمانی پێدەکات. لەوکاتانەدا مێشکی دەبێتە (لاپەڕەیەکی سپی) و ئامادەیە بۆ وەرگرتنی ئەو لەرینەوە دیاریکراوانەی لەدەرەوە بۆی دێت.

ئەو شتانەی خەولێنەری موگناتیسی ئاراستەی کەسی خەوتووی دەکات وەکو میلی رادیۆکەوایە، رووەو هەر ئیزگەیەك بیەوێت دەیبات خودی خۆم چەندین شتی سەرسوڕهێنەرم لە خەواندنی موگناتیسی بینیوە کە حەپەساندوومی.. جارێکیان ئەو کەسەی نووستبوو بەبێ ئەوەی لەوەوبەر منی ناسیبێ ناوی من و باوکم و ئیشەکەمی گوت.

لەساڵی ١٩٤٩ دا ئامادەی ئاهەنگی یەکێك لە خەوهێنەرە بەناوبانگەکانی ئەمریکابووم. دەیتوانی ناوی شتێك بڵێت کە لە گیرفانی یەکێك لە بینەراندا بوو.. ئەو دەیتوانی فیکری خەڵکانی دی بخوێنێتەوەو لە گەڕان بەدوای ئەو شتەدا سوودی لێوەردەگرت، بەتایبەتی ئەو کەسەی شتەکەی لەگیرفاندا بوو..

هەر یەکێك لەئێوە دەتوانێت کاری یەکێك لەوانە ببینێت، چونکە لەخودا بەزیاد بێت لەهەموو شوێنێکدا بڵاوبونەتەوە.

لەوانەیە یەکێك بپرسێت: ((ئەگەر خەواندنی موگناتیسی خاوەنی ئەو هێزە نائاساییە مەردانەیەیە، بۆچی خاوەنەکانیان بۆ دۆزینەوەی تاوانەکان یاخود گەڕان بەدوای گەنجینە شاراوەکانی ژێر زەوی بەکاری ناهێنن... وەڵامی ئەو پرسیارە زۆر ئاسان دەبێت ئەگەر مێشکی مرۆڤ وەکو ڕادیۆ دابنێین. چونکە ڕادیۆ پێویستی بە دامەزراوەیەکی توندو تۆڵ و بەهێز و بێ کەموکوڕی هەیە. هەروەها پێویستە ویستگەیەکی بەهێزیشی هەبێت.

یەکێك لە منداڵەکانم بەر لەوەی تەلەفزیۆن بێتە عێراقەوە داوای لێکردم تەلەفزیۆنێکی بۆ بکڕم. وایدەزانی لەو تەلەفزیۆنەوە دەتوانێت هەموو دونیا ببینێ. نەیدەزانی لەو ماوانە لە عێراقدا تەلەفزیۆن بەکەڵکی ئەو نایەت چونکە ویستگەی تەلەفزیۆن هەتا ئەو کاتەش لەعێراقدا نەبوو.. ئەو کەسانەش کە گاڵتە بە خەواندنی موگناتیسی دەکەن هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ ئەو کوڕەی مندانیە.. ئەوان دەیانەوێت، هەموو خەواندنی موگناتیسی هەرچی ئاڵتون و مسی سەرزەوی هەیە بۆی بدۆزێتەوە ئینجا باوەڕی پێدەکەن. نازانن تواناکانی خەواندنی موگناتیسی سنووردارەو بەچەندین شت پێوەندکراوە. هەروەکو هەر توانایەکی تری ئەو مرۆڤە سەرسوڕهێنەرە. خەواندنی موگناتیسی هەروەکو هەموو خەوتنێکی ئاسایی وایە. لەجەوهەرەکەیاندا تەنها یەك جیاوازیان هەیە... ئەویش لەڕێگەی یەکێکی ترەوە دەخەوێنرێت. ئەوخەواندنەو ئەم خەوتنە هەرئەو جیاوازیەشە چەندین ئەنجامی کردەیی گەورەی لێدەکەوێتەوە.

ئەوکەسەی بەشێوەیەکی ئاسایی دەنوێت، مێشکی وەکو ئەو رادیۆیە وایە کە میلی نییە، وێزگەیەك نییە ئاراستەی بکاتو فەرمانی پێبکات و ڕێڕەوەکانی دیاری بکات. عەقڵی ناوەوە لەکاتی نوستنی ئاساییدا کراوەیە بۆ هەموو وەرگرتنێك زۆربەی جارەکانیش بە تاڵکردنەوەی ئارەزووە سەرکوتکراوەکانەوە خەریکە.

بەڵام لە خەواندنی موگناتیسیدا، خوێنەر هەرچی شتێکی بوێت ئاراستەی کەسی خەوتووی دەکات. ئەویش ملکەچبونێکی کوێرانە گوێڕایەڵی دەبێت. جگە لەوشتەی فەرمانی پێدەکرێت ئاگای لەهیچ شتێکی ترنییە. بەوشێوەیەش کلیلی مێشکی دەکەوێتە دەست خەوێنەرەکەی.

ئەو ئامێرانەی کۆمەڵی توێژینەوە دەروونیەکان ئەنجامیاندا لە بەریتانیادا لەوەڵامی ئەو (١٧) هەزار کەسەی پرسیارەکانیان روبەرووکرابوەوە رێژەی راستگۆیی ئەو خەونانەی بینیبویان (١ لە ٤٧)دا بوو.

لەوەدا ڕێژەی ئەو تێکەڵکاریەمان بۆ دەردەکەوێت لەوکەسانەدا کە بەشێوەیەکی سروشتی دەنوون... (هەست) لە خەوتنندا تێکەڵاوی ترس‌و وەهمەکان دەبێت هەرچەندێك عەقڵی ناوەوەی لەوکاتەدا لەژوانی ئەو خۆشەویستەیەوە ئالأوەکە لەوەو پێش لێی قەدەغەکرابوو، یاخود بە گلانی پاروی ئەو خواردنانەوە خەریکە کەلە بە ئاگاییدا لێی بێبەش کراوە. یاخود تۆڵە لەو دوژمنەی دەکاتەوە کە لە ژیانیدا ئازاری داوەو نەیتوانیوە لێشاوی تووڕەییەکەی بەسەردا ببارێنێ. بۆیە پێویستی

بەکاتـەکانی نووسـتن هەیـە. هـەتا ئـەو شـتانەی لـە بـەئاگاییدا خـەمی لێخواردوون لە خەوتندا هەڵیانڕێژێت.

بۆیە زۆر هەڵەیە لە کاروبارەکانماندا پشت بە خەونەکان ببەستین هەروەکو نەخوێندەوارەکان بڕوایەکی تەواویان پێیەتی. پشتبەستنمان بە خەونەکان هەروەکو ئەوە وایە گرەو لەسەر پێشبڕکێی ئەسپ بکەین. ڕێژەی هەڵەکردن زۆر گەورەترە لە پێکانی ڕاستی.. تەنها شێت و گێلەکان ئەو پێشبڕکێیە دەبەنەوە.

ئەم گوتەیەمان بەواتای ئەوە نیە خەونەکان هیچ سودێکیان نیـە، هەندێك جار سوودی لێوەردەگرین بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانـەی بەر لەخەوتن بەدەستیەوە نالآندومانە.

دەڵێن ئیبن سینای فەیلەسووفی بەناوبانگ، ئەگەر گیروگرفتێکی بۆ چارەسـەر نەکرایـە... دەسـتنوێژی دەگـرتو دووڕکـات نوێـژی دەکـردو دەنووست، چارەسەری گیروگرفتەکەی لەخەودا دەبینی.

هەر ئەوەش لە (دیکارت) دەگێڕنەوە.. کاتێك لە خەوێکی بەیانیاندا بـووە ئـەو دۆزینـەوە گرنگانـەی داهێنـاوە. هـەروەها ئـەو کەسـەی (ئەنسۆلینی) دۆزییەوە لەکاتی نووستن دا بیرەکەی بۆهات.. دوای ئەوەی بابەتێکی زۆری لەسەر نەخۆشی شەکرە خوێندەوەو خۆی بۆ گوتنـەوەی وانەیەك ئامادە دەکرد کە ڕۆژی دوایی بیڵێتەوە، دوای باوێشکێکی زۆر خەو بەسەریدا زاڵ بوو.. لە کاتژمێر دووی بەیانیدا لە پڕێکدا ڕاپەڕی و گڵۆپەکەی داگیرساند و سێ شتی لە دەفتەری بیرەوەریەکدا نووسی. ئەو سێ دەسـتەواژەیەش پاشـان بـوو بـە کلیلـی دۆزینـەوەی چارەسـەری نەخۆشی شەکرە.

(ولیم جیمس) سکرتێری پێشوی دارایی لە وڵاتە یەکگرتوەکاندا شێوازێکی تایبەتی بۆ سوودوەرگرتن لە خەونەکان بەکار دەهێنا لەنیوە شەوداو دوای ئەوەی بیرکردنەوە، هێزە عەقڵیەکانی پڕ دەکرد.. قەڵەمێك و کاغەزێکی لەتەنیشت تەختەی نووستنەکەیەوە دادەنا بۆ تۆمارکردنی ئەو چارەسەریانەی خەونەکانی پێشکەشیان دەکردو کە گیروگرفتە زۆرەکانی ژیانی هەندێك جار لە خەونەکەی ڕادەپەڕیو فیکرەیەك لە مێشکیدا بوو، بەپەلە پڕی دەدایە قەڵەمەکەی بۆ نوسینەوەی بەرلەوەی دووبارە ون بێتەوە...

زۆر لە لێکۆڵەرەکان هەوڵیانداوە ڕێگەیەکی دەروونی دیاریکراو دابنێن کە مرۆڤ لە ڕێگەیەوە بتوانێت سوود لە خەونەکانی ببینێ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی.. هەروەکو ئاشکرایە زۆربەی ئەو شێوازانەی داینناوە لەیەك شتدا کۆدەبێتەوە:-

بەر لەنووستن سەرنجێکی وردی عەقڵی ناوەوە بدرێتە بیرێکی دیاریکراو و بڕوا بەخۆبوونی تەواوی ڕوانینەکانی لەلا دروست بکرێت بۆ ئەوەی بە متمانەو بڕوایەکی زۆرەوە ڕووەو ئەو بیرە دیاریکراوە هەنگاو هەڵێنێت.

ئیبن خەلدوون دەڵێت: ((من بەر لەنووستن دوعایەك دەخوێنم (کە ناوی لێناوە حالومیە). ئەو دوعایە پەردە لەڕووی زۆربەی ئەوشتانە هەڵدەداتەوە کە خۆم دەمەوێت))، بەگوێرەی گوتەی ئیبن خەلدون ((حالومیەکە)) لەم چەند ووشە بیانییە پێك هاتووە: (( تماغس، بعدان یسود و غداس نوفنا عادس)).

ئــەوەی جێگــەی سەرســوورمانە ئیــبن خــەلدون بەشــێوەیەك كاریگــەرێتی ئــەو ((حالومیــە))مــان بــۆ شــیدەكاتەوە زۆر نزیكــە لــە شیكردنەوە نوێیەكانی بواری دەروونناسی.

ئیــبن خــەلدون دەڵێــت: (( ..... ئــەو حالومیانــە ئامادەكارییــەك دروست دەكەن لە دەروونیدا بۆ ڕوودانی حاڵەتی خەوبینین. هەرچەندێك ئــەو ئامادەكاریــە بــەهێزتر بێــت، ئــەوەندە نزیكــتر دەبێتــەوە لــە وەدەستهێنانی ئەو شتەی خۆی بۆ ئامادە كردووە... چونكە توانا بۆ خۆ ئامادەكردن هەمان توانانییە. بۆ ئەنجامدانی شتێك)).

واتای ئەو شیكردنەوەیەی ئیبن خەلدون ئەوەیە كە ئەو ووشە بیانیانە هیچ سودێكیان نییە. و هەروەكو گەڕە لاوژەی منالان وایە، نەك گوتەی گەورەكان.. بەواتایەكی دی كاریگەرێتییەكی دەروونیان هەیە. چونكە باوەڕهێنانی تەواو بەو وشانە وا لە دەروونی مرۆڤ دەكات سەركەوتوبێت لەوشتانەی دەیەوێت.

ئەوەی جێگەی تێبینییە لەم بۆنەیەدا بگوترێ، ئەو وشە بیانیانە لەزۆربەی تەڵەسمو دوعاو فاڵ و نووشتەكانی ئێمەی ڕۆژهەلاتیدا بەكاردەهێنرێن.. هەروەكو سەلمێنراویشە كاریگەریشیان زۆر گەورەترە لەو وشانەی واتایەكی روونو ئاشكرایان هەیەو لێی تێدەگەین.

تەموومژاوی ئەو وشانە شێوەیەك لە قەشەنگی و پیرۆزی پێدەبەخشێت بەڵام ئەگەر لێی تێبگەین بەرزیو پیرۆزی و كاریگەرێتیە دەرونیەكەی لە دەست دەدات. گیروگرفتەكەش لەوەدایە هیچ سودێكی نابێت ئەگەر مرۆڤ نهێنیەكانی بزانێت و فەلسەفەی تێدا بكات.

عەقڵی ناوەوە عەقڵی ئیمان و باوەڕی پتەوە. بەڵام عەقڵی دەرەوە عەقڵی بیرکردنەوەو گومانو فەلسەفەکردنە. ئەگەر تۆش دەتەوێت بەشێوەیەکی ڕاست و دروست عەقڵی ناوەوەت بەکاربهێنی لەخەوتن یان هەر حاڵەتێکی تردا.. پێویستە هەموو ئەو شتانە دوور بخەیتەوەو خۆتیان لێ بەدوربگریێ کە رووەو بیرکردنەوەو بەڵگەهێنانەوەو فەلسەفەکردنت دەبات.

بیریارەکانی ئەم سەدە نوێیەمان شێوازەکەی ئیبن خەلدون بەکارناهێنن بۆ سوود وەرگرتن لە عەقڵی ناوەوەیان، چونکە لە نهێنی ئەو وشە بیانیانە ئەو گەیشتوون و دەزانن تەنها وشە گەلێکی بێواتان.. و مەبەستیش لە گوتنیان تەنها دروستکردنی بڕواو متمانەیە.. بەڵام لە کۆندا کۆمەڵانی خەڵك باوەڕیان بەو وشانە هەبوو بەکلیلی کردنەوەی هەموو دەرکە داخراوەکانیان دەزانی بۆیە سوودیان لێوەردەگرت.

بەڵام شێوازی نوێ بۆ سوودوەرگرتن لە عەقڵی ناوەوە ڕێگەی (ئیحاو) و دوبارەکردنەوەیە. هەموو کەسێك دەتوانێت بەر لەنووستن (ئیحا)ی خۆی بدات و دووبارەی بکاتەوە.. یاخود لە هەر کاتێکدا بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیو چارەسەر کردنی نەخۆشی و .... هتد سوودی لێوەربگرێت.

مرۆڤی نوێ بڕواو متمانەی ون کردووە. بیردەکاتەوە و فەلسەفە دەکات.. بۆیە هێزە زۆر بەتواناکانی عەقڵی ناوەوەو هەستە نائاساییەکانی لەدەست داوە.. گومانی تێدانییە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی (ئیحا)و دووبارەکردنەوە سوود لە بەرهەمی عەقڵی ناوەوەی وەربگرێت.

یەکێك چووە لای پزیشکێك و پێی گوت: من کۆمەڵێك نەخۆشی دەروونیم هەیە... ئەو پزیشکە بەڕێزەش زۆری بیستبوو لە کاریگەرێتی (ئیحا) ی دەروونی لەچارەسەرکردنی نەخۆشیەکاندا.. هەر شتێك نەخۆشەکە دەیگوت پزیشکەکە لە چارەسەرەکەیدا پێی دەگوت.. ئیحای خۆت بدەو بڵێ چاك بومەتەوە.

نەخۆشەکەش بەبێ ئەوەی پارە بدات لە کاتی چونە دەرەوەدا بە پزیشکەکەی گوت: ((ئیحای ئەوە بدە بەخۆت کەپارەی پشکنینەکەت لێوەرگرتوم... ئەی پزیشکی خۆشەویست)).

ئەو پزیشکە بەستەزمانە لەوباوەڕەدابوو کە دەتوانرێت لەرێگەی قەناعەت پێکردنی لۆژیکی و بیرکردنەوەی هەستیەوە سوود لە عەقڵی ناوەوە وەربگرێت.

ئەو کەسەی لەرێگەی دەروونەوە چارەسەر دەکات نابێت نهێنی ئەو شێوازی چارەسەرکردنە بۆ نەخۆشەکە باس بکات. نابێت. پێی بڵێت ((ئیحای خۆت بدە)) بەڵکو لەبری ئەو پێی بڵێت: ((ئەوە بڵێ و ئەوەش بەکاربێنە)).

ئەو راستیە سەلمێنراوە کە (ئیحا) توانایەکی سەرسوڕهێنەری هەیە لە چارەسەرکردنی نەخۆشیە جەستەیی و دەروونیەکان. ئەوەش سەلمێنراوە کە هەموو نەخۆشیەکان لە یەك کاتدا دەروونی و جەستەیین. کەواتە هەموو دەرمانێك ئەگەر نەخۆشەکە ئیحای تەواوی لەگەڵدا نەبێت سوودێکی ئەوتۆی نابێت، بەڵام لەوانەیە. ئیحا بەتەنها سوودبەخش بێت. بەڵام دەرمان بەبێ ئیحا هیچ سوودێکی نییە.

ژنێك وا چوبوە مێشكیەوە كە ئێسقانێكی ماسی لە گەروویدایەو خەریكە دەیكوژێت. هەموو پزیشكەكان گوتیان هیچ شتێك لە گەرووتدا نیە. بەڵام باوەڕی پێنەكردن... ئەگەر پزیشكێك نەبایە بەراستی دەمرد. ئەو پزیشكە ماشەیەكی پزیشكی هێناو ئێسكێكی ماسی تێدا شاردەوە، بەژنەكەی گوت باتەماشایەكی گەروت بكەم مەقاش و ئێسكە ماسیەكەی روەو ناوەوەی گەرووی بردو گوتی ((ڕاست دەكەی، تەماشاكە، ئەوە ئێسكەكەیەو وابۆم دەرهێنای))پاش ئەو شانۆگەریە ژنەكە چاك بووەوەو هیچ ئازارێكی گەرووی نەما. عەقڵی ناوەوە هیچ سەلماندنێكی لۆژیكی ناناسێ و سوودی لێوەرناگرێت جگە لە دووبارەكردنەوەی ئەو بیرەی كە مشتومڕ هەڵناگرێت هیچ شتێكی دی لە عەقڵی ناوەوەدا سوودمەند نابێت. بۆیە ئەو كارانە سەركەوتوو دەبن كە پێویستیان بە (متمانە) هەیە نەك بیركردنەوەو نەخشەكێشان.

لەژیانی مەدەنی نوێدا، لەلایەكەوە سوودمەندبووبن و لەلایەكی دیكەوە زەرەرمەندبوون.. هۆكارەكانی ژیانە ماددیەكانمان پێشكەوتنێكی بێوێنەی بەخۆیەوە بینی، بەڵام ڕێگەو شێوازەكانی دەروون و بەرهەمی هێزە نائاساییەكانمان لەدەست دا.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا باشترین هۆكارەكانی چارەسەری ماددیو سەرسوڕهێنەرترین داهێنانەكان بەكاردەهێنین، بەڵام ئەو بڕوا پتەوەمان لەدەستدایە كە چیاكان دەلەرزێنێ.

عەقڵی دەرەوەمان گەشەی كردوە عەقڵی ناوەوەشمان لاوازبووە، هێزە نائاساییەكانی مادەمان بەكارهێناو هێزە نائاساییەكانی نەستمان پشتگوێخست.

# بەشی پێنجەم

## دەروون و مادده

لەسەردەمی (دیکارت)و لەسەدەی حەڤدەدا گێروگرفتێکی فەلسەفی گەورە هاتە ئاراوە، ئەویش گێروگرفتی (فیکرو جەستە) بوو. یاخود بە واتایەکی دی گێروگرفتی کارلێکی نێوان هێزە دەرونیەکان و هێزە ماددیەکان بوو.

بێگومان فیکر کار لەجەستە دەکات، جەستەش کار لەفیکر دەکات. مرۆڤ کاتێك لە شتێك تەریق دەبێتەوە، یاخود شەرم لەشتێك دەکات کوتوپڕ سوور هەڵدەگەڕێت.. کەتوشی ڕوداوێك دەبێت، نەخۆش دەکەوێت، یاخود ڕەنگی دەپەڕێت و لاواز دەبێت.

یەکێك لە ڕێگەی خەواندنێکی موگناتیسی‌یەوە، خەوێندرا پێیان گوت: پشکۆیەکی ئاگر لەسەردەستت دانراوە، کاتێك وەئاگایان هێنایەوە پاشماوەی سوتاوی و تلۆق بەسەر دەستیەوە بوو هەروەکو ئەوەی ئاگرێکی ڕاستەقینەی بەرکەوتبێ[1].

---

[1] برادەرێکم بۆی گێڕامەوە : ڕۆژێك مامۆستا بردینیە هۆڵی تاقیگەی قوتابخانەکەمانەوە. لەوانەی کیمیادا پەرەمێزێکی بچووك ئیشی دەکرد، بە بەرچاوی برادەرێکمەوە کەوچکێکی چام خستە سەر ئاگری پەرەمێزەکە پاشماوەیەك کەوچکێکی ساردم هێناو لەپڕێکدا خستمە سەر دەستی ئەو برادەرەم، ڕاپەڕی و دەستی ڕادەوەشاندو گوتی ((دەستت سوتاندم)) خۆشم حەپەسام کە دەستیم بینی سور ببوەوەو تلۆقی کردووە..

ماددەش لەسەر هەمان ڕێژە کاریگەری دەبێت لەسەر فیکر. مرۆڤ کاتێك مەی یاخود مادەیەکی سڕکەر دەخواتەوە دەبینێ فیکرەکانی بەگوێرەی جۆری ئەو مادەیەی دەیخواتەوە گۆڕانکاری بەسەردا دێت.

((جود)) سەرۆکی بەشی فەلسەفەو زانستی دەروونناسی لە زانکۆی لەندەن لەو بارەیەوە دەڵێت: (( جەستە بەشێکە لەماددە، بۆیە کۆمەڵێك تایبەتمەندێتی ماددەی تێدایە لە قورسایی و شێوەو قەبارەو ....هتد. هەروەها دەکەوێتە ژێر کاریگەری یاسا فیزیاییەکانەوە... بەڵام ئێمە بەشێوەیەکی جیاواز دەڕوانینە فیکر.. کە ئێمە دەڵێین ماددی نیە مەبەستمان ئەوەیە، قورسایی و قەبارەو شێوەی نییە و یاسا فیزیاییەکان نایانگرێتەوە.. ئەگەر فیکرو ماددە بەو شێوەیە جیاواز بن و یەك سیفەتی هاوبەشیان نەبێت، کەواتە چۆن یەکێکیان کار لەوی دیان دەکات؟؟ هەروەها چۆن دەتوانن کارلێك لەنێوانیاندا ڕووبدات؟.. بەردێك دەتوانێت مێروویەك پانبکاتەوە، چونکە مێرووش وەکو بەرد بارستایی ماددەیەکی هەیە. بەڵام بەرد چۆن دەتوانێت کار لە ئارەزوویەك بکات؟ درێژی باسکێك دەتوانرێ بپێورێت، بەڵام چۆن دەتوانین ئەو ئیلهامە بپێوین کە سەمفۆنیای پێنجەمی (بیتهۆڤن)ی داهێنا.

((زیادڕەوی نییە ئەگەر بڵێین ئەو گیروگرفتە بنەڕەتیە لەو گیروگرفتانەیە کە پێویستە سەرجەم قوتابخانەکانی زانستی دەروونناسی هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن... چونکە هەتا ئێستا قوتابخانەیەکی دەروونی چارەسەرێکی سەرکەوتویان بۆ نەکردووە)).

ئەو گیروگرفتەی پرۆفیسۆر (جود) لێی دەدەوێت بە بەرزترین شێوە لەبوارەکانی خەواندنی موگناتیسیو سۆفیگەریو عەقیەدەو....هتد دەردەکەوێت.

یەکێك لەو کارە سەرسوڕهێنەرانەی لەوبارەیەوە بینیومە، ڕوداوێك بوو بەر لەدەساڵ.. لەزانکۆی ئەمریکی لە بەیروت ئاهەنگێکی گەورە بەڕێوەچوو، خەولێهێنەرێکی بەناوبانگ بەشداری تێداکرد.. یەکێك لە کارەکانی چەند تۆپێکی کانزایی ساردی دایە دەست چەند بینەرێکی ئاهەنگەکە.. پاشان بە دەنگێکی بەرزەوە (ئیحای) کردن و پێی گوتن: ((ئەو تۆپانە گەرمن.. گەرمن)): وردە وردە ئەو تۆپە ساردانە لەدەستەکانیاندا گەرم دادەهاتن.. زۆربەیان فڕێیاندایە سەرزەویو لە ئازاردا فویان لە دەستەکانیان دەکرد، یەکێکیان مایەوە سووربوو لەسەر ئەوەی تۆپەکە لەنێو دەستەکانیدا بمێنێتەوە. لەوانەیە ویستبێتی خۆی وەکو قارەمانێك نیشانبداتو سەرنجی کیژەکانی دەوروپشتی ڕابکێشێت، پاش ماوەیەك کەوتە ئەمدەستو ئەو دەست پێکردنی .. لەکۆتاییدا چاری نەماو فڕێیدا.. کە تەماشای ناولەپی دەستەکانیان کرد نیشانەی سووتاوی پێوە دیاربوو.

لەڕاستیدا ئەو تۆپانە لە گەرما سوور هەڵنەگەڕابوون. بەڵکو ئەو شتەی گەرم بوو پێستی دەستەکانی خۆیان بوو. ئەویش لەئەنجامی (ئیحاوە).. ئەوەش زۆر سەرسوڕهێنەر نییە. چونکە هەندێك جار مرۆڤ خەیاڵی نەخۆشی دەکەوێتەسەرو بەڕاستیش نەخۆش دەکەوێت بەخەیاڵ ئازار دەخاتە شوێنێکی لەشیەوەو بەڕاستیش ئەو شوێنە دێتە ئازار.

لەزستانێکدا و لە باخچەی (هایلبارك)ی لەندەن هەژارێکی هیندی ڕووت و قووت هەستی بەو سەرما کوشندەیە نەدەکرد، چەندین شتی نائاسایی ئەنجامدەدا: پارچە شووشەو بزماری وردو تیژی قوت دەدا، ترشی (نەتریك)ی وەکو نۆشی گیان دەخواردەوە، بەپێی پەتی بەسەر پشکۆی ئاگردا دەڕۆیشت.. چەندین کاتژمێر بەخۆڵ دایان دەپۆشی و دەیاننناشت پاشان بە زیندویی دەیان هێنایە دەرەوە هەروەکو هیچ شتێکی بەسەردا نەهاتبێ.

کۆمەڵەی توێژینەوەی دەروونی لە بەریتانیادا بەر لەچەند ساڵێك لە حاڵەتێکی لەو شێوەیەی کۆڵییەوە.. هیندییە هەژار بەپێی پەتی بەسەر پشکۆ ئاگرێکدا دەڕۆشت کە گەرمیەکەی لەسەروی هەزارەوە بوو (بەپێوەری فهرنهایت)، بۆ دووبارە سەلماندنی هێزو توانای دووبارەی کردەووە.. ئەو تاقیکردنەوەیەش لە دۆسیەکانی کۆمەڵەکەدا تۆمارکرا.

سۆفیەکانی عێراقیش چەندین کاری لەو شێوەیەی هیندییە هەژارەکان ئەنجامدەدەن... بە چەك لە خۆیان دەدەن و خەنجەرو شمشێر دەکەن و بەسکی خۆیانداو ئاگر دەخۆن.

ئەو هەموو هێزە نائاساییانە دەکەوێتە قاڵبی (کاریگەرێتی فیکر لەسەر جەستە)، لە ڕاستیدا ئەنجامی باڵادەستی عەقیدەیەکی دیاریکراوە لە جەستەی مرۆڤدا. هەژارێکی هیندی کاتێك بەسەر ئاگردا دەڕوات باوەڕی تەواوی بەوە هەیە. ئەو ئاگرە زیانی پێناگەیەنێت. ئەو عەقیدەیە. بەشێوەیەکی تەواو دەسەڵاتی بەسەر زیهنیدا هەیەو لەو کاتانەدا دەکەوێتە حاڵەتێکی نیمچە لە سەرخۆچونێك سەبارەت

بەشتەکانی دەوروبەری ... بۆیە بەتەنها گومانێك حەتمەن تووشی لەناوچوونی دەکات.

بەڵگە نەویستە ئەو عەقیدەیە گومانێك لە خۆناگرێت، ڕەگێکی قووڵی بەهێزی هەیەو ڕۆچۆتە قوڵایی نەستەوە... لەوێدا مرۆڤ پێویستی بە شێلگیری نییە.

لەراستیدا عەقیدە بەدەستی مرۆڤ نییە، ناتوانێت هەرچۆنی بوێت دەستی بکەوێت، یاخود جێی بهێڵێ و پشتگوێی بخات. چونکە قەناعەتێکی ناهەستیەو لەئەنجامی بڕوایەکی بەهێزو پشوویەکی درێژو قوڵبونەوەیەکی ئەو تۆی دەوێت هیچ گومانێکی لەگەڵدا نەبێت. ئەو عەقیدەیەی لە عەقڵی دەرەوەدایەو ناچێتە قوڵایی عەقڵی ناوەوە زیانێکی زۆری دەبێت. لەوانەیە ئەنجامێکی پێچەوانەی مەبەستەکەشی لێبکەوێتەوە. ئەو کەسەی خاوەنی عەقیدەیەکی رووکەشە کە پێی نایە سەر پشکۆی ئاگرێك، عەقڵی دەرەوە بەترس و لەرزێکی زۆرەوە بەخۆی دەڵێت: ((پێشکەوەو مەترسە، بەڵام عەقڵی ناوەوە لەقوڵایی دەروونـدا زەنگی ترس و مردن لێدەدات.

گێلێك سۆفیەکی بینی شمشێرێکی کرد بەسکی خۆیدا بۆ ئەوەی سەرنجی ئامادەبووان ڕابکێشێ کە لەنێوانیاندا ژنێکی زۆر ئامادەبوون. هەر کە شمشێرەکەی گرت بە دەستیەوە زەنگی مردن هەموو لەشی داگرت، لەوکاتەدا پێویست بوو پاشەکشە بکات و لەخۆی نەدا. بەڵام لە کۆتاییدا کۆتایی بەژیانی هات[1].

---

(1) دەروێشێکی عەرەب لە دەوروبەری کەرکوك دەژیاو ناوبانگی هەبوو... خەڵکی دەڵێن چەندین جار دیومانە (١٤) فیشەکی دەمانچەی بەسەری خۆیەوە ناوەو نەمردووە...

زاناکـانی بـواری هـێزە نائاسـاییەکان و هیندییـەکان دەڵێـن: ئــەو کارانـــە جۆرێکـــە لـــە خـــەواندنی خـــودی لەلایـــەن مرۆڤـــەوە (Autohypnotism).. سۆفی و دەرونیەکان بەرلـەوەی ئەو کارانـە ئـەنجام بدەن خۆیـان دەخـەوێنن. هیندییـەکان شـێوازێکی جیاوازیـان هەیـە لـە لەکاری دەروونیدا. ئەوان کۆمەڵێك راهێنانی دەروونی ئاڵۆزو درێژخایەن ئەنجامدەدەن تا دەگەنە قۆناغی توانای ئەنجامدانی ئەو کارە نائاساییانە. کـە دەگەنـە قۆنـاغی کۆتـایی لـەم دونیایـە دەچنــە دەرەوەو لـە دونیایـەکی تایبـەت بـە خۆیـاندا دەژیـن.. تـا ئـەو ڕادەیـەی کـارە نائاساییەکان دەبێتـە شـتێکی زۆر ئاسـایی هـەر کـاتێك و لەهــەر شــوێنێکدا بیانـەوێت ئـەنجامی دەدەن.

بەڵام سۆفی و دەروێشـەکانی عێراق پـەنا دەبەنەبـەر گـۆرانـی و دەف لێـدان و جۆرێـك لـە سـەماو سـوڕانەوە. دوای ئـەوە دەگەنـە حاڵــەتێکی بێهۆشی کە پێی دەڵێن: ((مەدەد)).. لەڕاستیدا ((مەدەد)) خـەواندنێکی خودیەو هیچی تر.

هـەروەکو لەسـەرەتاوە گوتمـان خـەواندنی موگناتیسـی دەبێتـە هـۆی کـپ کردنـەوەی عـەقڵی هەستیاری (دەرەوە)و عـەقڵی نـاوەوەش بـە تـاقی تەنها دێتـە مەیدانەکـەوە... لـەو کاتـەش دا هـیچ جیاوازیــەك نیـە. ئەگـەر خەواندنەکە خودی یا لەلایەن کەسێکی ترەوە بێت.

کەواتــە ئـــەو شـــتانەی ســـۆفی و دەروێشـــەکان دەیکـــەن لـــەهێزە نائاساییەکانەوە سـەرچاوە دەگرێت و هەرچەندێك هەستەکانی دەروێـش

---

کاتێك جەنگی عێراق – ئێران دەستی پێکرد... نەچوە سەربازیو بوو بەهەڵاتوو.. پاش ماوەیەك گرتیانو لەبەردەم ماڵەکەی خۆیدا گوللەبارانیان کردو مرد. (و).

کەمترو لاوازتر بێتەوە لەکاتی مەدەدەکەیدا ئەوەندە مەترسی مردنی کەمتر دەبێتەوە.

ئەم ڕاستیە ئەو ڕوداوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە لە ئاهەنگێکی دەروێشەکانی تکریتدا خودی خۆم بینیومە.. دەروێشێك ویستی خەنجەرێك بکا بەورگی خۆیدا، لەبەر هەر هۆیەك بووبێت حاڵەتە دەروونیەکەی ئامادە نەبوو بۆ ئەو کارە، خوێن لە سکی هاتە دەرەوەو بێهۆش بوو.. دەروێشەکانی تر دەیانگوت نەگەیشتۆتە حاڵەتی ((مەدەد))[1].. بە هەرحاڵ ئەو دەروێشە نەمرد، بەڵام لەمردن نزیك بوەوە.. ووتەی دەروێشەکان ڕاست بوو.. نەچووبووە حاڵەتی (مەدەد)ی تەواوەوەو بڕێك لە هەستەکانی لە کارنەکەوتبوون لەوانەشە لەوکاتەدا گومانێکیش لە دەروونیدا سەری هەڵدابێ.

سۆفی و دەروێشەکان لەوباوەڕەدان ئەو شتە نائاساییانەی ئەنجامی دەدەن لە ڕاستی عەقیدەکەیانەوەیە، بەڵام لەڕاستیدا لەهێزی عەقیدەکەیاندایە نەك ڕاستی... چونکە هێزی عەقیدە ڕۆچوونە قولایی ناهەستیەوە ئەو کارە سەرسوڕهێنەرانە دروست دەکات.

بەڵام ڕاستیی عەقیدە هیچ پەیوەندیەکی بەو کارانەوە نیە هەموو مرۆڤێك بەهێزە لەو عەقیدەیەی کە خۆی هەیەتی و دەتوانێت بگاتە ئەو ئەنجامەی ئەوان.

---

[1] لە شۆڕیجەی کەرکوك کەریمە کوێرێك هەبوو.. شەوێکیان چووە کۆڕی دەروێشانەوە خۆی گێڕایەوە و گوتی: لەدڵی خۆمدا گوتم من چیم لەوان کەمترە.. دەستم گێڕا، چونکە چاوم نەیدەبینی بەردێکم بەدەستەوە هات و قوتم دا، پرخەپرخم پێکەوت و لە خنکاندا بووم.. کە چاوم هەڵهێنا لە نەخۆشخانەی کەرکووك بە نەشتەگەری بەردەکەیان لەگەروو دەرهێنابووم.

(نەست) جیاکردنەوەی نێوان حەق و ناحەق یاخود ڕاستو هەڵە نازانێت. ئەو شتانە دەکەونە چوارچێوەی کاروبارەکانی عەقڵی دەرەوە.. هەروەکو گوتیشمان عەقڵی ناوەوە، عەقڵی یەقین و عەقیدەیە. بەڵام عەقڵی دەرەوە عەقڵی گومان و توێژینەوەو فەلسەفەکردنە.

کەواتە هێزە نائاساییەکان لەڕاستی عەقیدەوە نییە بەڕێژەی ئەوەی دەلالەت لە هێزەکانی دەکات لە دەروونی مرۆڤدا.

محەمەدی پێغەمبەر دەڵێت: ((باوەڕهێنان بە بەردیش بەسوودە)).. لەو گوتەیەیدا پێغەمبەر زۆر ڕاستی پێکاوە، سۆفیەکانیش ئەو ڕاستیەیان زانیووە.. ئەوان هەموو ئاینەکانیان خۆش دەوێو جیاوازی لە نێوانیاندا ناکەن.. هەموویان بەچەند ڕێگەیەکی جیاواز دەزانن بۆ گەیشتن بەیەك ئامانج.

ئەوانە داوا لەمرۆڤ دەکەن هێزی عەقیدەی بەهێز بکاتو باوەڕ بەو شتەبێنێ کە خۆی دەیەوێت.. شێخ محەمەدی عەرەبی، سۆفی بەناوبانگ لەهەموو پەرستگایەکدا نوێژی دەکرد جیاوازی نەدەکرد لەنێوان مزگەوتو کەنیسە یاخود ماڵی ئاگرو پەرستگای وەسەنیەکان. هەروەکو بڵێت: ((دڵت پاککەرەوەو، لە هەر شوێنێکیش دەتەوێت نوێژبکە)).

زۆربەی زاناکانی ئەمڕۆش بەلای ئەو بڕوایەدا دەیشکێننەوە.. هەندێکیان توشی توندڕەوی بوون و دەڵێن: خودی (خوداوەند)یش تەنها عەقیدەیە. بە بۆچوونی ئەوان خودا، باوەڕی تۆیە، هەرچەندێك عەقیدەکەت بەو بەهێزتربێت ئەوەندە ئەو سوودت پێدەگەیەنێتو تەنگوچەڵەمەت لێدور دەخاتەوە.

(ئۆلیفەر لووج)ی زانای بەناوبانگی بواری سروشتی دەڵێت: نوێژو دۆعاو خوداپەرستی سوودێکی زۆری هەیە.. بەو گوتەیە سێ بیرو بۆچوونی ئەو نکۆڵیلێکەرانە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێن: دۆعا گەڕەلاوژەیەکی بەتاڵەو هیچ توانایەکی نیە لە گۆڕینی یاسا سرووشتیەکان.. دەڵێت: ((ئەوان خۆیان بە دابڕاو لەگەردوون دادەنێن)).. بەلام ئێمە ئەگەر توانیمان بچینە خودی خۆمانەوەو بەشێکی جیانەکراوەی ئەو سیستمەین، هەروەها ئارەزوو داواکاریەکانمان بەشێکە لە ئیرادە دەسەڵاتدارەکان کە ڕێگرێك نابێت لە جووڵەی عەقڵماندا و کاریگەرێتیەکی بەهێزی دەبێت ئەگەر لە گەڵ ئەو ڕێرەوانەدا بڕۆین لە ڕاستترین یاساکان و بەرزترینیاندا.

لودج بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونە نمونەی دەوڵەتێکی دادپەروەرمان بۆ دێنێتەوە کە بیروبۆچوونی تاکەکان بەشێکە لە یاسادانان و توانا، کە ڕێڕەوی تەواوی گرتووە لە هاوسەنگی خۆی و بنەماکانی سیستمەکە.

بەڵام پیاوانی ئاینی ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا یەك ناگرنەوە ئەوان دەڵێن خودا ئەو پادشایەیە کە لەسەر عەرشی خۆی دانیشتووەو چواردەوری بە مەلائیکە گیراوە، ئەویش لەنێوانیاندا ئەمردەکات ..

هەر ئەو وێنەیەشیان گواستۆتەوە ژیانی سیاسیان ئەوان چۆن دەڕواننە حاکمە سیاسیەکان بەو شیوەیەش خودا دەبینن هەولدەدەن ماستاوی بو بکەن و بەشانو باڵیدا هەڵبڵێن •بویە دەیانبینی بە هەموو شێوەیەك گرنگی دەدەن بە ڕیورەسمە ئاینیەکان لەبری ئەوەی گرنگی بدەن بە پاککردنەوەی دڵ و سەلامەتی کارو پاکی نیەتیان.

لــە بەشــی ڕابــردوودا گوتمــان دەرونـــی مـــرۆڤ دەکەوێتـــە ژێـــر کاریگـەرێتی چواردەورە مادیەکانیــەوە، کاریگـەریتیـەکی نەسـتی... لـەم بەشەشدا باسی ئەوەمانکرد کە چۆن دەروون کار لە جەستە ماددیەکەی دەکات.

ئـەوەندە ماوە بزانین ئایا دەرون دەتوانیـت بەهـەمان شـێوە کـار لـە مادەی دەرەکی بکات؟؟..

ئەو پرسیارەش دەمێکە مێشکی بیریارەکانی وروژاندوە. چەندین هەواڵی سەرسوڕهێنەر لە پێغەمبەرو وەلی و ساحیرەکانەوە دەگێڕدرێنەوە کە توانای ئـەوەیان هـەبووە مادده بجوڵێنـنو کـەم یـان زۆر کـاری تێبکـەن بیریارەکان سەبارەت ئەو هەواڵانـە نەسـەریان سووڕدەمێنیّ و نـە دەتوانـن باوەڕی پێبکەنو نە دەشتوانن بەدرۆی بخەنەوە زۆربەی زاناکان هەتا ئەم ساڵانەی دوایی بە درۆیان دەخستەوە[1].

ڕۆژهەڵات زۆرشت دەربارەی ساحیرەکان دەزانێتو (سەدان چیرۆکو داستانو ئەفسانە لە کەلتوورو مێژووی ڕۆژهـەڵاتدا هەیـەو هەندێکیشـیان کەوتونەتە کتێبە ئاینیەکانەوە، بۆ نموونە لەقورئاندا لەزۆر شوێندا باسی سـیحر دەکـاتو بـە ناوبانگترینیشـیان چیرۆکەکـەی موسـایە(و)). بــەڵام ڕۆژئـاوا شـتێکی ئەوتۆیان دەربـارەی سـیحر نــەدەزانی.. لـەم دواییانــەدا

---

(١) سەید ئیدریس هەبوو یادی بەخێر، لە سەیدە عەرەبەکانی دەوروبەری (کـەرکوك) بوو.. بەهۆی ڕوداوێکەوە لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا هاتبوە کوردستان، بەشداری لە هەردو شۆڕشەکەدا کردبوو لەدوای ڕاپەڕینیش کرا بە ئەفسەر لە سوپای یەکگرتوی بەر لەشەڕی ناوخۆ، شتی سەیریان لـەو سـەید ئیدریسـە دەگێڕایـەوە یـەکێك لەوانـە: لەهـەر ژوورێکدابوایە، ئەگەر بیویستایە سـەرجەم شتەکانی ئەو ژوورە دەلەرینـەوە، مـەخابن لەساڵی (١٩٩٤) بە جەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کرد.

چەندین ساحیری بەهرەمەند لەڕۆژئاوادا دەركەوتن. گرنگترینیان سێكەس بوون: (هوم)ی ئوسكەتلەندیو (بلادینۆ)ی ئیتاڵیو (هودینی) ئەمەریكییە. گرنگی ئەو سێكەسەش لەوەدایە مشتومڕێكی توندوتیژیان لە ناوەندە زانستیەكاندا دروست كرد.

بلادینو كچێكی ئیتاڵی بوو، هەندێك جار دەچووە حاڵەتێكی لەهۆش خۆ چوونەوەو چەندین كاری سەرسوڕهێنەری ئەوتۆی ئەنجامدەدا عەقڵ باوەڕی پێناكات.. شتەكانی دەوروپشتی خۆی دەجولاند، هەندێك پارچە مۆسیقا بەبێ ئەوەی یەكێك دەستیان لێبدات لەخۆوە دەكەوتنە مۆسیقا لێدان.. دەستەسڕی یەكێك لە ئامادەبوانی لە گیرفانی دەردەهێناو بەرەو لووتی خاوەنەكەی دەچوو وەكو ئەوەی پەكی بكاتەوە.. چەندین كاری سەرسوڕهێنەری دیكە.

بۆ توێژینەوەی ئەو كارانەی (بلادینۆ) لیژنەیەك لە مامۆستایانی زانكۆی (تورین) پێكهێنراو بەشێوەیەكی ورد حاڵەتەكانیان پشكنیو لەراپۆرتێكی یەك دەنگیدا ڕاستی ئەو شتانەیان سەلماند كە بینویانە.

هەروەها (ئولیفر لودج) سەردانی بلادینۆی كردوو لەبارەیەوە نوسیویەتی: ((من ئێستا بیر لەوە دەكەمەوە ئەو شتەی لە بارەی كارەكانی بلادینۆوە بینیومە بینوسمەوەو بڵاوی بكەمەوە.. چونكە ئەو كارانە دوای ئەوە بەسەر زۆر شێوازی جیاوازدا جێبەجێ كراوە من دڵنیام لە هەندێك كەسدا دەركەوتەیەكی سروشتی نائاسایی هەیە و من ناتوانم شیبكەمەوە. بەواتایەكی دی هێزێك هەیە هەتا ئێستاش زانست پەی پێنەبردووەو نەیدۆزیوەتەوە)).

ئەوەی جێگـەی سەرسـوڕمانە دوای ئـەوەی بلادینـۆ لـە ئـەوروپادا سـەرکەوتنێکی گـەورەی بەدەسـتهێنا چـووە بـەریتانیا، مامۆسـتاکانی کۆلێژی (کمبردج) خستیانە ژێر پشکنینەوەو بە فێڵەکەیەوە گرتیان بۆیان دەرکەوت لەکاتی جوڵاندنی شتەکاندا دەستەکانی بەکار دێنێت.

لەسـاڵی ١٩٠٨دا کۆمەڵـەی توێژینـەوەی دەروونـی بـەریتانیا لیژنەیەکی سێکەسی لە شارەزایانی بواری فێڵو هەڵخەڵـەتاندن ناردە ناپۆلی بـۆ پشـکنینی (بلادینـۆ) .. ئـەو شـارەزایانە دوای پشـکنینی بڕیاریاندا کـە ڕاسـتە ئـەو لـەکاتی بێهوشـیدا بـە مەبەسـتو بێمەبەست دەستی بەر شتەکان دەکەوێت بەڵام بەشێکی زۆری کارەکانی لەسەرووی ئاساییەوە بوون. (فیلدنج) یەکێك بوو لەو سێ شارەزایەو نووسیویەتی: ((من سوپاسی بلادینۆ دەکەم. چونکە دوو شتی فـێرکردم: یەکـەمیان: هـەموو کـارێك فێـڵو هەڵخەڵـەتاندن نییـە. دووەم: هـەموو فێـڵو هەڵخەڵەتاندنێکیش بە مەبەست نییە)).

بـەڵام (هـۆم)ی ئوسـکوتلەندی جیـهانی مەدەنیـەتی بـەکارە سەرسوڕهێنەرە سیحرییەکانی سەرسام کرد.. شتەکانی بەرز دەکردەوە بەبێ دەست لێدانیان، فڕینـی لـە پەنجەرەیەکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر لـە تـەلارێکی بـەرزدا.. سـەروچاوی خـۆی دەخسـتە کوانـوی پشـکۆیەکی گڕگرتوی سورهەڵگەڕاوەوە.. پارچەکانی مۆسیقا هەر لەخۆیانەوە مۆسیقا لێدەن.. زانکۆی (هارفەرد) چوار لە مامۆستاکانی خۆی ناردە لای (هۆم) بۆ تاقیکردنـەوەی کارە سەرسوڕهێنەرەکانی. دوای ئـەوە هـەر چواریـان بڕوانامەیـەکیان ئیمزاکـرد و گـەواهی ئـەوە دەدەن کـە لـەنێو ئـەو دەرکەوتانـەی دیویانـە: یـەکێکیان لەسـەر مێزێك دانیشت و زۆر بـەتوندی

مێزەكە كەوتە لەرینەوە، پاشان كەوتە سەرو قاچ. دوان لە هاوڕێكانی چونەلای و لە تەنیشت ئەوەوە دانیشتن ساحیرەكە داوای لێكردن دەستو قاچی ببەستنەوە.. ژورەكە بەشێوەیەك ڕووناك بوو مامۆستاكان توانیان هەرچۆنێك خۆیان دەیانەوێت هۆم تاقی بكەنەوە. لە كۆتاییدا بۆیان دەركەوت كە هۆم فێڵی لێنەكردوون و هەڵی نەخەڵەتاندوون.

(ولیم كردكس) یش چاوی بە هۆم كەوتو لە تاقیگە فیزیاییەكەی خۆیدا خستیە ژێر تاقیكردنەوەوە. كردكس لە گۆڤاری زانستی (Quarterly Journal of Science) دا ڕاپۆرتێكی نووسیوە دەڵێت: ((هەموو ئەو شتانەی دیومن پێچەوانەی پرنسیپە زانستیە بڕیار لەسەر دراوەكانە: وەكو یاسای كێشكردن لە كاریگەرێتی رەهای بەردەوام لەسەر شتەكان ئێستە من لەمێشكمدا ململانێیەك لەنێوان عەقڵم كە بڕیاردەدات ئەو شتانە مەحاڵە لە لایەن كۆمەڵی زانستیەوە ڕووبدەنو، هەستەكانم كە ئەو شتەی بەچاوەكانم ببینم و دەستم لێدان درۆنەبوون ڕویانداوە..

لە بەریتانیا خەڵك گاڵتەیان بە كارەكانی تۆم دەهات : و بەكردەوەی سیحری چاویان دەدایە قەڵەم كە ئەمڕۆ پێی دەڵێن ((خەواندن)) ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ساحیرەكانی ئەم سەردەمە دەڵێن: دەتوانین هێزە نائاساییەكانی (تۆم) لێكبدەینەوە و فێڵە گونجاوەكانی دەبینین.

بەڵام (هودین)ی ئەمریكی .. كارە سەرسوڕهێنەرەكانی لەسەر تەختەی شانۆكانەوە ئەنجامدەدا.

پڕۆفیسۆر (فیلیب حەقی) نووسەری کتێبی (مێژووی ناسراوی عەرەب) بینیویەتی و لە گۆڤاری (مقتطف) ڕاپۆرتێکی لەبارەیەوە نووسیوە.. دەڵێت: ((دەیخەنە گونیەیەکەوەو توند دەیبەستن ئەو گونیەش دەخەنە سندوقێکەوە و بەدوو قوفڵ دایدەخەن، پاشان سندوقەکەیش لە چوار لاوە بەپەتێکی توند دەبەستن. پاش چەند چرکەیەك هودینی لەو دیو پەردەکەوە بە دەستو قاچ کراوەیی دەردەکەوێت)).

(ئارتەر کونن دویل)یش لەبارەیەوە نووسیویەتی (موعجیزەیە..)) بەڵام هودینی خودی خۆی دان بەوەدا دەنێت کە کارەکانی لە ئەنجامی دەست سووکی و خێراییدایە و هیچ جۆرە سیحرێکی نائاسایی تێدانیە[1].

ئەو چیرۆکە سەرسوڕهێنەرانەی سەبارەت بەو سێ ساحیرە گێڕامانەوە. لە گریمانی ڕاستگۆییاندا ئەو گوتەیە ناسەلمێنن کە هێزە دەروونیەکان کار لەمادده دەرەکیەکان دەکات.. هەندێك لە لێکۆڵەرەکان دەڵێن: ئەو کارە سیحریانەی خەڵکی دەیبینن و دەیگێڕنەوە تەنها لە ڕێگەی سیحری چاوەکانەوە ڕوودەدەن. سیحری چاو جۆرێکە لە خەواندنی موگناتیسی بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێبکات بەسەریدا

---

[1] لەوانەیە د. عەلی وەردی ڕەحمەتی (دیڤید) ساحیری بەناوبانگی نەبینیبێ یاخود (دیڤید) لە دوای مردنی ئەوەوە دەرکەوتبێ کە هەموو کەسێك لە کوردستانی خۆماندا کارەکانی لە تەلەفیزیۆن بینیوە.. دەفرێت و فارگۆنێکی گەورەی شەمەندەفەر ون دەکاتو لە تاقیگەکان ڤیاگراوە لە ناو سندوقێکدا خۆی دەخاتە خوارەوەو لەناو قاسەیەکی پارەدا بینایەکی چەند قاتی بەسەردا دەڕوخێننو پاش چەند چرکەیەك دێتە دەرەوەو دەیان کاری سەرسوڕهێنەری دی ئەنجامدەدات.

ڕوودەدات.. کەسـی خـەوتوو درك بەهـەموو ئەوشـتانە دەکـات کـە لـە دەوروپشـتیدا ڕوودەدەن، توانـای وەرگرتنـی ئیحـای زۆر بـەهێزە.. ساحیریش لەو حاڵەتەدا ڕۆڵی خەوێنەر دەبینێ. و ئیحای ئامادەبووان دەکات کە ئەوشتە دیاریکراوانە دەبینن، ئەوانیش بەڕوونی و ئاشکرایی دەیبینن. کە لەواقیعدا هیچ بوونێکی نیە[1].

چەندین تاقیکردنەوەی زانستی تر لەسەر کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی کرا لەسەر ئەو شێوەیەی سەرەوە و ئەنجامەکانیان زۆر سەرسوڕهێنەربوو پیاوێکیان خەواندو پارچەیەك قوماشیان دایە دەستو گوتیان ئەوە سەگە.. پیاوەکە باوەڕی کردوو هەروەکو سەگ هەڵسوکەوتی لەگەڵ قوماشەکەدا دەکرد. بەپیاوێکی تریان گوت تۆ ئێستا هیچ کەسێك نابینی، سەرجەم دانیشتوان لەبەرچاوی ون بوون.

لەسەر ئەو ئاوازە هەندێك کەس لەو باوەڕەدان ئەو کارانەی (هوم، بلادینو، هورین) ئەنجامیان داوە تەنها وەهمێکەو گەیەندراوەتە زیهنی ئامادەبووان. بەڵام هەندێك لەزاناکان دەڵێن نەخێر ئەو شتەی ئێمە بینیمان ڕاستییەکەو روویداوە.

لە ڕاپۆرتەکەی مامۆستایانی زانکۆی (تورین) داهاتووە ((ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین هەندێك لەوانەی تووشی پەشێوەی عەقڵی هاتوون یاخود کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی وەهمەوە دەڵێن ئەو شتانەی بینیویانەو

[1] هەتا گوتەی زاناو لێکۆڵەرەکان پەسەندە. ئیحا کردنی مرۆڤەکان لەڕووی زانستیەوە تەواو ڕاستە، بەڵام خۆ کامێرایەکی ڤیدیۆ ناتوانرێت ئیحا بدرێت و بخەوێنرێت و هەرچی ساحیرەکە دەیکات ئەو تۆماری بکات. ئەدی چۆن ئەو وێنە زیندوانە تۆمار دەکات کە (دیفید) دەفڕێ..). (و).

بیستویانە لە خەیاڵدا نەبێت بوونیان نییە .. ئێمە ناتوانین ئەوە بە هەموو خەڵکی بڵێین ئێمە توشی ئەو پەشێویە نەبووین. بۆیە لێکۆڵینەوەکانمان لەوکارانەدا چڕ کردۆتەوە کە دوای ڕودانی کارەکان و لە ڕۆژی دواییدا و بەڕۆژی رووناك بینیومانەو بیستومانەو مەحاڵە هیچ پەیوەندیەکیشی بە وەهمەوە هەبێت.

بە هەرحاڵ ئەو بابەتە گفتوگۆو مشتومڕێکی توندو تیژی خستەوە، لە دواییدا (راین) هەوڵیدا بیخاتە سەر مێزی تاقیکردنەوەی زانستیەوە کەهیچ گومانێك لەخۆی ناگرێت .

(راین) بۆ ئەو مەبەستە شێوازێکی تایبەتی داهێنا.. لە تاقیکردنەوەکانیدا شەش پاڵویەکی یاریکردنی بەکارهێناو ئەنجامەکانیشی زۆر سەرکەوتوو بوون. لەو بارەیەشەوە دەڵێت: ((دوای چەندین ساڵ لە توێژینەوەی بەردەوام... گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە هەندێك کەس توانایەکی کەمیان هەیە لە گۆڕینی فڕێدانی زاردا)).

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە یاریزانە قومارچیەکان ئەو ڕاستیەیان زانیووە بەرلەوەی (راین) بە شێوازە زانستیەکەی ئاشکرای بکات ئەوان دەزانن لە هەندێك حاڵەتی دیاریکراودا دەتوانن کار لە فڕێدان و نیشتنەوەی زارەکە بکەن (بەچاکی و خراپی).. ئەوان هەست بەوە دەکەن جارێك لە بەرژەوەندی ئەوان دەنیشێتەوە و جارێکی تریش بە پێچەوانەوە.. ئەوان بەچەندین شێوە کە لەگەڵ هەستەکانیاندا بگونجێت ئەو دەرکەوتە نامۆیە شیدەکەنەوە.. زۆربەی جاریش دەیبەنەوە سەر بەختی خۆیان یاخود ئەوکەسەی لە تەنیشتیانەوە دادەنیشێت..

(راین) لەو شێوازەیدا گەیشتە ئەنجامێكی یەكلاكەرەوە كە: دەروونی مرۆڤ بەبێ یارمەتیەكی هەستی دەتوانێت كار لە ماددەی دەرەكی بكات. لەهەمان كاتدا دان بەوەشدا دەنێت كە ئەو كاریگەرییە زۆر لاوازە بەرێژەیەكی زۆر كەم تێكڕایی ڕێكەوت تێدەپەڕێنێت...ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە تێكڕای كۆمەڵانی خەڵك وەكویەك نین لەو كاریگەرێتیەدا.. گومانی تێدا نیە كە جیاوازیان هەیە لە هێزو لاوازی سەبارەت بە گەشبینیو باوەڕو .. شتیتر.

لەمەوبەر باسی ئەوەمان كرد كە دەروون بەهۆی باوەڕێكی بەهێزەوە دەتوانێت كار لە ماددەی جەستەی خۆی بكات، بە هەڵەشدا ناچین ئەگەر بڵێین ئەو دەروونانە هەندێك لەو كاریگەرێتیە یان دەخەنە سەر ماددە دەرەكیەكان.

كاریگەرێتی دەروون هەرچەندێك بێت لەسەر ماددە دەرەكیەكان هەندێك جار ئەنجامی گەورەی لێدەكەوێتەوە.

واقیعی ژیان ئەوەی سەلماندووە كە هەندێك جار هێزێكی زۆر بچكۆلە لە بارودۆخێكی تایبەتیدا دەبێتە هۆی تەقاندنەوەی شارێكی گەورە.... یاخود گۆڕینی چارەنووسی تاكێك یان نەتەوەیەك.

بۆنموونە: ئوتومبیلێكی پر لە نەفەر زۆر بەپەلە دەڕوات و بەربەستێكی بچووك دێتە ڕێگەیو وەردەگەرێت و ژمارەیەك لەنەفەرەكانی دەمرن، هەندێك جار ئوتومبێل دەكەوێتە بارودۆخێكی نائاساییەوە، ڕۆیشتنێكی خێرای زۆر تێكچوونی هاوسەنگییەكی كوتوپڕ دەبێتە هۆی وەرگەڕانی.. لەوانەیە هێزێكی دەروونیكەم لە یەكێك لە نەفەرەكانەوە كاریگەرێتیەكی زۆری هەبێت لە وەرگەڕان یاخود سەلامەتی ئوتومبێلەكە.

دەڵێن هێستر سوارەكان كاتێك دەگەنە بەرزاییەكانی چیاكانی ((ئەلب)) دەنگی ئەو زەنگەی بەگەردنی ئەسپەكانیانەوە هەڵواسراون رادەگرن، چونكەە ترسی ئەوە هەیە دەنگی ئەو زەنگانە ببێتە هۆی هەرەس هێنانی بەفری سەرچیاكان.... شارەزایانیش ئاگاداری تەقەنەكردن و دەنگ هەڵبڕین و هاوار كردنیان بلاوكردۆتەوەو دەڵێن چەندین پارچە بەفری زەبەلاح، یاخود بەردی گەورە زۆر بەلاوازیو كەمی بە شوێنەكەیانەوە گیرساونەتەوە، بچوكترین لەرینەوە لە (با)دا كە لەئەنجامی زەنگ یاخود هەر شتێكی ترەوە رووبدات جوڵەیەكی زۆر بچوك دەخوڵقێنێ و دەبێتە هۆی هەرەسی ئەو پارچە گەورانەو خلۆربونەوەی..

چەندینجار ئەو خلۆربونەوەیە گوندێكی تێكداوەو كشتوكاڵەكانی داپۆشیووەو كێڵگەكانی تەفروتونا كردووە.

لۆژێكی كۆن وای راهێناوین بەشێوەیەكی جیددی بڕوانینە كاروبارەكان و لەسەر بنەمای (دژینەكان) بەراوردیانبكەین بۆ نموونە سەبارەت یەكێك لە هێزەكان دەڵێین: (دەتوانێ یاخود ناتوانێ) كاریگەریتی بەسەر شتێكەوە جێبهێڵێ.ئێمەش لەروانگەی ئەو لۆژیكە كۆنەوە سروشتە تێكچڕاوەكانی بارودۆخەكانمان لە یاد دەچێت كە هەندێك جار دەتوانێت هێزێكی بچووك بەهێزترو بە تواناتر بێت لەهێزێكی زۆر گەورە بۆ بەرهەمهێنانی دەركەوتەیەك لە دەركەوتەكان هۆكارەكانی گەردوون زۆرجار هاوسەنگیەكی نائاسایی‌یان هەیە. بۆیە هێزێكی بچووك روبەرووی دەبێتەوەو كودەتایەكی گەورەی ئەوتۆ دروست دەكات عەقڵ لە ئاستیدا ڕادەوەستێ.

دەڵێن (( فارکۆنی)) لە پاپۆرەکەی خۆیداو لەئاوی ئیتاڵیادا رۆژێك بەهۆی ناردنی ئامارژەیەکی بێتەلەوە توانی هۆڵی ئاهەنگێکی گەورە لە ئوسترالیادا روونـاك بکاتـەوە. ئـەو ئامارژەیـەش مـارکۆنی ئاراسـتەی ئوسترالیای کرد بەهۆی هەندێك گەیەنـەری تایبەتیـەوە توانـی کلیلێکـی دیاریکراو بجولێنێ‌و بەهۆی ئەو جوڵەیەشەوە تەزووی کارەبای هۆڵەکە کەوتە ئیش‌و ئاهەنگەکەی رووناککردەوە.

نموونەی ئەوشتەشم لەئەمریکا دابینیم ... چەندین دەرگام دەبینی هەر کەسێك روبەروویان دەهات لە خۆیانەوە دەکرانەوە ئەو کاریگەرێتیە بچـووك‌و کەمـەی سـێبەری ئەوکەسـەی روەودەرگاکـە دەهـات کـاری لەجیهازێکی چاو (کەهروبانۆریە) دەکرد کە بەدەرگاکەوە بوو، ئەویش لە رێگەی خۆیەوە تەزووە کارەباییەکەی هەڵدەکردو. دەرگاکەی دەکردەوە.

هـەر ئـەو شتەشـە لەچـەکێکی نـاوکیدا روودەدات، کـە چیـاو شارەکانیش وێران دەکات... دابەشبوونی ناوکەکانی گەردیلەیەك دەبێتە هـۆی کـارلێکێکی زنجـیرە بـەند. هـەروەکو لای شـارەزایانی گەردیلـە ناسراوە... ئەو کارلێکەش لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی رودانـی کارەساتە جۆراو جۆرەکان‌و بەسەر کۆمەڵانی خەڵکدا دادەبارێ ئەو کارگەرێتیەش کـە لەسـەر (چاوپیسـی) دەیگێڕنـەوە، دەتوانـین هـەمان لێکدانـەوەی بـۆ بکەین.. لەراستیدا چاو کار لە هیچ کەسێك ناکات، بەڵکو دەروون لە سەرچاوەی کارەکانی چاوە هەر ئەو دەروونەشە شەپۆلە کارەباییەکان بۆ کۆمەڵانی خەڵك دەنـێرێت ... ئـەو شـەپۆلە وێرانکەرانـەش وەکـو یـەك‌و بەیەك رێژە کارناکەنە سەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵ.

چاو تەنها زیان بەو کەسانە دەگەیەنێت کە باوەڕیان پێی هەیە.

هـەر ئـەو باوەڕەشـە والـەو شـەپۆلانە دەکـات کەلـە چاوێکـەوە دەردەپـەڕێت کاریگەرێتیـەکی زنجیرە بـەندیان هـەبێت لەسـەر مێشـکی قوربانیەکەو دەیدات بەزەویدا.

روداوەکانی توشبوون بەچاو پیسی تەنها لە کۆمەڵگە نەزانەکاندا روودەدات کەزۆربـە ئاسـانی خورافـات بـەنێوانیاندا بڵاودەبێتـەوە لـەو کۆمەڵگایانەدا. کۆمـەڵانی خـەڵك هەرکـە چاوپیسـێکیان بینـی لـە بـەری هـەڵدێن ئـەو ئـاو هـەواو بارودخـە ترسـناکە دەبێتـە هـۆی کەوتنـەوەی کۆمەڵێك قوربانی لە رێگەی ئیحاوە.

لـەم دواییانـەدا لەیـەکێك لـە رۆژنامـەکانی بـەغدادا نوسـرابوو:- پیاوێك بـەهۆی چاویـەوە کارگەیـەکی گـەورەی شووشـەی لـە دیمەشـقدا تێکشکاندووە، بەشێوەیەك هەموو بزوێنەرەکانی لەکار خستووە... دوای ئەوەی ئەندازیارەکان دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەو توێژینەوە ((هـەروەکو هەواڵەکە دەڵێت)) بینیان پارچە شوشەیەکی بچوك رێگـەی لـە گـەورەترین بزوینـەرەکان گرتـوەو وێنـەی چاوێکێشـی لـە سـەر ئـاوی ژێـر بزوێنـەرەکـە دروست کردووە.

رۆژنامەکە دەڵێت: ئەو پارچە شووشەیەی کە (چاوەکە لـیّ ی داوە) گوێزرایـەوە زانکـۆی ئـەمریکی لەبـەیروت[1]، مـن نـاتوانم هیـچ شـتێك دەربارەی ئەو هەواڵە سەیرو سەمەرەیە بڵێم، لەوانەشـە حـەزم لـەوە بێـت بـەدرۆی بخەمـەوە. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا دەتـوانم بڵێم: ((لـەم سـەردەمەدا

[1] لەکەلتووری کوردەواری خۆشماندا سەدان چیرۆك لەبارەی چاوپیسیەوە گوتراوە.. من سـەدانم بیسـتووە، پێـم باشـە نووسـەرێکی بـەڕێز بـە ئەمانەتـەوە کۆیـان بکاتـەوە، و لەچوارچێوەی کتێبێکدا چاپیان بکات. (و)

هەموو شتێك لەوبارەیەوە دەکرێت ڕووبدات، سەردەمی دۆزینەوەی وزە ئەتۆمیو ناوکییەکان و هێزە ناهەستیەکانی مرۆڤ))ە.

هەندێك کەس لەو باوەڕەدان هێزە دەروونیەکان کاریگەرێتیەکی ماددی هەستپێکراویان نیە لەسەر شتەکانی دەوروبەر.. ئەوان ڕەشبین و گەشبینن، بەختەوەرنو دڵتەنگن.. ئاگایان لەوەنیە کە ئەو هەڵچوونە دەروونیانە کار لە شتە بێگیانو بێهەستەکانی دەورپشتیان دەکات (زۆر یان کەم) و هەندێك جاریش ئەنجامێکی کردەیی زۆر گرنگی لێدەکەوێتەوە.

لەوانەیە زۆربەی (بێبەختەکان) بە دەستی خۆیان ئەو نەگبەتیانەی ژیانیان خوڵقاندبێ.. ئەوان چاودێری ڕوداوەکان دەکەنو لەشەڕو ناخۆشی زیاتری تێدا بەدی ناکەن، بۆیە ڕێژەی ڕوداوە ناخۆشەکانی ژیانی ئەوان زۆر گەورەترە لەوانەی کە هەمیشە گەشبینو کراوەو ڕوخۆشن... بەو هەنگاوەیان کار لەگۆڕینی ڕوداوەکە دەکەن دژی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، هەروەکو چۆن پیاوێکی قومارچی کار لە نیشتنەوەی زارەکە دەکات.

لەوانەیە ئەو ڕەشبینانەش دەستیان نەبێت لە دروستکردنی ڕەشبینیەکەی دەروونیاندا، چونکە ئەوان قوربانی ئەو بارودۆخەن کە تێیدا لەدایك بوون.. لە منداڵیەوە لەسەر ئەوە ڕاهاتوون لەژیانیاندا جگە لە زوڵمو دڵڕەقی و چەوساندنەوەو دەرکردن پتر نەبینن بۆیە لەگەڵ گەورە بونیاندا وێنەیەکی سەرنەکەوتنو هەرەس و رووخاوی لە خەیاڵیاندا تۆمار دەکرێت.

چاوەڕێکردنی بەدبەختی هەموو کاتێکیش بەدبەختی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ، بەڵام کار لە تێکڕایی دەرکەوتنی دەکات بەشێوەیەکی ئاسایی ڕێکەوت جیاوازی ناکات لەنێوان تاکێك‌و تاکێکی تردا.. بەشێوەیەکی نیمچە هاوسەنگ خێرو شەڕ ئاراستەی مرۆڤەکان دەکات.

هەروەکو باسمان کرد لێکۆڵینەوەکانی (راین) ئاماژە بەوە دەکەن کە دەروونی مرۆڤ کار لە نیشتنەوەی روویەك لە ڕوەکانی زاری قومار دەکات کەپتر لەوانی دی دەربکەوێت، بەرێژەیەکی گەورەتر لە ڕۆڵی ڕێکەوت.. بەواتایەکی دی: مرۆڤ بەهۆی هێزە دەروونییەکانیەوە ڕێکەوت ببەزێنێت‌و بەسەریدا زاڵ بێت.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کۆمەلانی خەڵك چەمکی (بەخت)، لەبری (ڕێکەوت) بەکاردەهێنن‌و هەردووکیان ناوناوە (Chance)، نەخوێندەوارو نەزانەکانی رۆژهەلاتیش لەگفتوگۆو مشتومڕە ئاسایییەکانیاندا بەزۆری بەکاری دەهێنن... دەبینی وشەی ((بەخت، شانس)) لە پێشبڕکێی ئەسپ سواری، بازرگانی‌و هەڵبژاردن‌و....هتد بەکاردەهێنن.

لەراستیدا تەنها (ڕێکەوت) بەس نیە بۆ لێکدانەوەی ((بەخت)) چونکە هێزە دەروونیەکان رۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە دروستکردنیدا (چاك‌و خراپ).

هێزە دەروونیەکان نەك تەنها کار لە ڕێڕەوی رووداوەکان دەکەن بەڵکو دەتوانێت شتە شاراوەکانیشی ببینێت‌و بزانێت لە رابردووشیدا چیی روودەدات: هێزێکی هەستیارو دەسەلاتداری هەیە، لەکاریگەریتیەکەیدا بەسەر ڕێکەوتدا زاڵ دەبێت‌و ململانێی هێزەکەشی دەکات .... کەواتە خاوەنی بەختێکی باش دوو توانای هەیە. ئەو بەپاکی

زیـهن‌و بـڕوا بـەخۆبوون‌و سـەرکەوتنی دەتوانێـت هــەندێك کاریگــەرێتی هـەبێت لەسـەر رووداوەکـان‌و رووەو بەرژەوەندیـەکانی ئاراسـتەیانبکات ئەوشتەشی نەتوانێت کاری لێبکات بەرێگەیەکی ترچارەسەری دەکـات، ئەویش رێگەی پێشبینی‌یە.

لەو ڕێگەیەشەوە دەتوانرێت خۆی لەگەڵ هەر شتێکدا بگونجێنێت کــە ســبەینێ روبــەڕووی دەبێتــەوە.. هــەنگاوێك لــە زەرەرمـــەندی دوردەکەوێتەوەو هەنگاوێکیش لە سودمەندی نزیك دەکەوێتەوە.. کەواتە ئەو لەلایەکەوە کاریگەرێتیە دەروونیەکـەی ئاراسـتە دەکـات‌و لەلایـەکی تریشەوە پێشبینیە دۆزەرەوەکانی دەخاتەسەر.. بەو شێوەیەش دەتوانێت چارەنووسی زارە فڕێدراوەکەی لەهەوادا ڕوەو ئەو شتەو شوێنەی خۆی دەیەوێت یاخود پێشبینی دەکات بنیشێتەوە.

ئەو کارە بەشێوەیەکی ناهەستی ڕوودەدات، زۆربەی جار سـەری ســوڕدەمێنێ لــەخۆی و ئــەو توانــا سەرســوڕهێنەرەی هەیــەتی لــە وەدەسـتهێنانی دەسـتکەوت‌و دوورکەوتنـەوە لـە زیـان.. ئەگـەر بیـەوێت بەزۆرو بە ئەنقەسـت و بەمەبەسـت بەختەکـەی چـاك بکـات زۆر بـەکپی و هێمنی بەجێی دەهێڵێ.

لـەو هـەموو شـتانەی لەسـەرەوە لـێی دوایـن دەگەینـە ئـەوەی بڵێـین سنوورێکی تـەواو نیـە لـەنێوان وەهـم‌و حەقیقـەتدا.. زۆربـەی جارەکـانیش وەهم حەقیقەت دروست دەکات.

دەتوانین بڵێین: کاتێك (باستور) میکرۆبی دۆزیـەوە خـودی خـۆی دروستی کرد.. چونکە باپیرەکانی ئێمە نەیاندەزانی میکرۆب چییە کەواتە بەر لە (باستور) میکرۆب بوونی نەبووە. بەڵام دوای ئەوە میکرۆب بوو بە

(بونێکی) هەستپێکراو و کۆمەڵانی خەڵك لێی دەترسان و ژمارەیەکی زۆریش لەترسی میکرۆب تووشی نەخۆشی (راڕایی) بوون.

گومانی تێدانییە ئەو کەسەی لە نەخۆشیەك بترسێت تووشی دەبێت.. چونکە ترسی بەردەوامی بیری نەخۆشیەکەی لە دەروونیدا بەهێز دەکات. بۆیە میکرۆبەکان لەلاشەیدا کێڵگەیەکی بەپیت دەدۆزنەوە بۆ گەشەکردن و زۆر بوون.

یەکێك لە پزیشکە بەناوبانگەکان دەڵێت: ((تەنها کاری پزیشك ئەوەیە یارمەتی نەخۆش بدات خۆی، خۆی چارەسەر بکات.. بواری پزیشکی کەس چارەسەرناکات.. سەرچاوەی چاك بونەوەی مرۆڤ دەروونی خۆیەتی. کاری پزیشکیش تەنها یارمەتی دانی دەرونە لە ڕوبەڕوو بوونەوەی نەخۆشیدا)).

(د. دوراند) تاقیکردنەوەیەکی بۆ ژمارەیەك لە نەخۆشەکانی ئەنجامدا.. ((شلەیەکی دانێ کە هیچ جۆرە دەرمانێکی تێدانەبوو.. دوای پازدە خولەك گەڕایەوە لایان و داوای لێبودنێکی زۆری لێکردن کە ئەو شلەیەی خواردویانەتەوە دەرمانی ڕشانەوە بووەو بەهەڵە داویەتی بەوان)).. کۆکەو لرخە لرخ کەوتە ناو نەخۆشەکان و پاش ماوەیەك زۆربەیان ڕشانەوە.

بانگەشەکەرانی هەقیقەت لەهەموو کاتێکدا هەوڵدەدەن قەلاچۆی وەهم بکەن.. هەست بەو ڕاستیە ناکەن کە لەوانەیە هەندێك جار وەهم لە حەقیقەت سودمەندتربێت. چونکە ئەگەر مرۆڤ بەتەنها لەسەر ڕێڕەوەکانی حەقیقەت بڕۆشتایە.. دەمێك بوو تیاچووبوو.

ژیانی مەدەنیەت سەدان جۆر لە دەرمان و شێوازە سودمەندەکانی بۆ دروست کردووین، بۆیە لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکاندا توانیومانە بەسەر وەهم و خورافاتدا زاڵ بین.. بەڵام ئەو کەسانەی کە لە دایک بوونیانەوە لە دارستانەکانی ئەفریقیادا دەژین، یاخود ئەو لادێیەی لە گوندێکی دوورەو پەرێز دەژیت هەمیشە ڕوبەڕووی نەخۆشی و مەترسیەکان دەبێتەوە چی شتێك بکات، ئەو بەرامبەر نەخۆشی و مەترسیەکانی بۆ خۆپاراستن هیچ جۆرە شێوازێکی ماددی شك نابات.. کەواتە زیانی پێدەگەیەنن ئەگەر داوای لێبکەین دەستبەرداری وەهم و خورافات بێت و لە بیرکردنەوەکانیدا واقیعی بێت، زیانی پێدەگات.

لەزۆربەی شارستانیەت و کۆمەڵگەکاندا وەهم ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ، لەو دەوروبەرانەی دەرمانی تێدانیە ، ئەو دەبێتە دەرمانی چارەسەر وەکو (بەردی تەندروستی) لای ئەوانەی هەتا ئێستاش هۆکاری نەخۆشیان نەزانیوە و نازانن کە سەرچاوەکەی میکرۆبە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە هەندێك لە نەخوێندەوارە لەخۆباییبووەکان لە عێراقدا، داوا لە خەڵکانی لادێ دەکەن واز لە وەهمەکانیان بێنن و خۆشیان هیچ هۆکارێکی نوێی چارەسەریان پێشکەش ناکەن.

حەقیقەت و وەهم لە دروستبوونی مرۆڤەوە لە ململانێیەکی توندوتیژدان، مرۆڤیش هەر لەخۆوە نەبووە هەندێك جار لە ژیانیاندا بەکاری دێنن.

هەندێك جار مرۆڤ بەدوای حەقیقەت دا دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە، بۆیە ناچار دەبێت بەوەهمەکانی حەقیقەتێکی تایبەت بەخۆی دروست بکات، و لە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیدا پشتی پێ دەبەستێت.

باپیرە گەورەکانی ئێمە نهێنی نەخۆشیەکانیان نەزانیوە، ئەگەر بەدوای دۆزینەوەی نهێنیەکیشدا بچوونایە نەیاندەدۆزییەوە. هەتا خودی ((باستور) یش ئەگەر لە سەردەمی باپیرانی ئێمەدا بوایە نەیدەتوانی نهێنی میکرۆب بدۆزێتەوە.. یاخود بەواتایەکی دی بەر لە توێژینەوەو لێکۆڵینەوە پزیشکیو کیمیاییەکان لە دایك بوایە.

لەسەر ئەو بنەمایە پێشینەکانی ئێمە پەنایان بردۆتە بەر داهێنانی تەڵەسم و دوعاو نەخۆشیەکانیان پێ چارەسەرکردووە.. ئێمە زوڵمیان لێدەکەینو دوژمنایەتیان دەکەین کاتێك بە خورافات و تەڵەسمو دۆعاکانیان پێبەکەین.. ئێمە ئەو راستیە نازانین کاتێك نەخۆش باوەڕی بە دۆعاو تەلەسم هەبێت لە دەرمانی ماددی زیاتر سوودی پێدەگەیەنێت.

بڕوای تەواو لە زۆر لایەنەوە سوودی بۆ مرۆڤ هەیە... نکۆڵی لەوەش ناکرێت کە لە کۆمەڵێك لایەنی ترەوە زیانی پێدەگەیەنێت گیروگرفتی ژیانیش لەوەدایە، تۆناتوانی بەبێ زیان شتێکی سوودمەندت دەستکەوێت، یاخود زیانێکی بێسوودت ڕووبەڕووبێتەوە.

عەقیدە باوەڕ بەخۆبوونی تەواو لە خودی مرۆڤدا دروست دەکاتو سروشتی سەرکەوتنو چارەسەرو دڵنیایی پێدەبەخشێ، بەڵام لەهەمانکاتدا ڕێگرێك دەبێت بۆ ژیانێکی واقیعیو حەکیمانەو وای لێدەکات پشت ئەستوری بۆ شتو وشە هیچو پووچەکان بێت لە روبەرو بوونەوەی حەقیقەتە تاڵەکاندا.

لە شارستانیەتە سەرەتاییەکانی جەنگەڵەکانی ئەفریقیاو بیابانەکانی ئوسترالیاو دورگەکانی ئۆقیانووسی ئارام دا چەندین هێزی دەروونی سەرسوڕهێنەر دەردەکەون.

لەو شارستانیەتانەدا هێزە دەروونیەکان بەهەردوو بەشەکەیەوە (سودمەندو زیانبەخش) کاریگەریتیەکەیان زۆر ڕوون و ئاشکرایە ... چەندین دابو نەریتی هیچ و پوچ و بیروباوەڕی خورافی ئەوتۆ دەبینین گەیشتۆتە ئەوپەڕی. لەهەمانکاتدا چەندین هێزی نائاسایی و نامۆی بەتوانا دەردەکەون.

مرۆڤە سەرەتاییەکان لە چوارچێوە فیکریەکەیاندا جیاوازیان هەیە لەگەڵ مرۆڤە مەدەنییەکان، ئەوان وەکو مەدەنیەکان ناڕواننەگەردوون و وەکو ئەوان لێکی نادەنەوە لە ملکەچبوونی بۆ کۆمەڵێك پێوەری سروشتی چەسپاو یاخود ئەو ڕێڕەوەی بەگوێرەی پرنسیپی (هۆکارو ئامانج) دەپێورێت... بەواتایەکی دی ئەوان وا بۆگەردوون دەڕوانن کە پڕە لە روحەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە.

مرۆڤە سەرەتاییەکان لەو باوەڕەدان هەردەرکەوتەیەك لە سرو شتدا هۆکارەکەی ئیرادەیەکی دەرپەڕیوە لەیەکێك لەروحە دیاریکراوەکانەوە... ئەو روحانەش (لەروانینی ئەوانەوە) ڕێڕەوی گەردوون دیاری دەکەن هەروەکو ئەو تاکانە وایە کە کۆمەڵگەیەك پێك دەهێنن... بۆیە لەهەموو کارێکیاندا روحەکان رازی دەکەن نەوەك غەزەبیان لێبگرێ و کارەساتیان بۆ بخولقێنێ.

مرۆڤە مەدەنیەکان هەوڵدەدەن گیروگرفتەکانیان بەچارەسەرە عەقڵی و زانستیەکان چارەسەر بکەن... بەڵام سەرەتاییەکان پەنادەبەنە بەر هونەری سیحرو جۆرەکانی تەلەسم و .... هتد.

یەکێك لە گەشتیارەکان دەڵێت: جارێکیان چوومە گوندێکی ئەفریقیا ... بەڕێکەوت ژنێکیان ون ببوو، یەکێك لە ساحیرەکانیان

تاوانبار کرد کە ژنەکەی فڕاندووە...دوای چەند رۆژێك تیمساحێکم لە نزیك کەپرەکەمەوە بینی و کوشتم، لە دەمی تیمساحەکەدا خوناوکەو خشڵی ئەو ژنە ونبووەم دۆزییەوە... بردمە لای خەڵکی گوندەکەو شتەکانیان ناسیەوەو گوتیان هی ئەو ژنەیە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سووربوون لەسەر ئەوەی ساحیرەکە ژنەکەی بەهۆی سیحرەکەیەوە کوشتووەو تیمساحەکە هیچ دەسەڵاتێکی لەو کارەدا نیەو لەوانەیە تەنها هۆکارێکی ساحیرەکە بووبێت بۆ کوشتنەکە.

ئەو چیرۆکە دوو عەقڵیەتی پێچەوانەمان بۆدەسەلمێنێ (سەرەتایی و مەدەنی) ... گەشتیارە مەدەنیەکە بەگوێرەی (پرنسیپی هۆکاری) دەکۆڵێتەوەو ئامانج وەردەگرێت بەڵام ئەوی دیان کە باوەڕی بەکاریگەرێتی سیحرو هێزە روحانیەکان هەیە لە کارەکانیاندا و هەرگیز لەو بڕوایەش لانادەن.... ئەو عەقڵیەتە پێچەوانەیەش لە هەموو شوێنێك بەپلە جیاوازەکان هەیە. لەوانەیە چەندین نموونەی عەقڵیەتی سەرەتایی لە نێوگەلانی مەدەنیدا ببینرێت.... چەند ساڵێك بەر لەئێستا لەهەندێك قوتابخانەی ئەمریکادا باوکانی قوتابیەکان نەیانهێشت منداڵەکانیان دژی نەخۆشی ئاوڵە بکوترێن چونکە دژی ویست و ئیرادەی خوایە.

خودی خۆشم هەتا ئێستەش ئەو چیرۆکەم لەیادەکە کە یەکێك لە نەخوێندەوارەکان سەروچاوی هاوڕێکەی شکاندبوو چونکە گوتبووی

((باران لە هەڵم دروست دەبێت))[1] وای دەزانی کفرێکی گەورەی کردوەو پێچەوانەی دەسەڵاتی خودایە.

هەریەکە لەو دوو عەقڵیەتە سەرەتایی و مەدەنیە، چاکەو خراپەیان هەیە... عەقڵیەتی سەرەتایی بڕوایەکی تەواو و متمانەیەکی بێهاوتا دەبەخشێتە مرۆڤ، لەهەمانکاتدا رووەو باوەڕهێنانی خورافات و شتە هیچ و پووچەکانی دەبات... بەڵام عەقڵیەتی مەدەنی لەیەك کاتدا مرۆڤ تووشی لادانی ئیمان و کەم باوەڕبوونی بەخورافات دەبات.

ئەو گیرو گرفتێکی دوو فاقییە... ژیانیش لێوانلێوە بەو گیروگرفتانەی کە لەیەکێکیان دەربازی نابێت روبەرووی یەکێکی تر دەبێتەوە.

بەشێوەیەکی ئاسایی عەقڵیەتی مەدەنی حیکمەت و دوربینی زیاترە لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا. بەڵام گومان و رارایی و دوو دڵیەکەی هەندێك جار لاوازتری دەکات لە مرۆڤە سەرەتاییەکە بۆ روبەروبوونەوەی گیرو گرفتەکانی (هەروەکو لەمەوبەر لێی دواین).

ئەگەر ساحیرێك بیەوێت بەسیحرەکەی یەکێك بکوژێت، پەیکەرێکی قوڕینی بۆ دروست دەکات، هەندێك وشەی تەومژاوی دەڵێت و چەقۆکەی بەرزدەکاتەوەو لەسنگی پەیکەرەکەی دەدات... (مریزر) لێکۆڵەری بەناوبانگی بواری شارستانیەت دەڵێت: ئەو کەسەی ساحیرەکە ویستویەتی بیکوژێت هەرکەبیستی ئەو شتەی دەربارەکراوە، کتوپڕ پەنا

---

[1] مەلا حوسێنێك هەبوو لەکەرکوك، مامۆستای سەرەتایش بوو لەساڵی (١٩٦٩) وە کەمرۆڤ گەیشتبووە سەرمانگ ئەو باوەری نەدەکرد... ئێستەش چەندین کەسی دی باوەڕ بە شتە زۆر سەرەتاییەکانی زانست ناکەن. (و).

دەباتە بەر ساحیرێکی دی بۆئەوەی کاریگەرێتی ئەو کوشتنەی لەسەر هەڵبگرێت... ئەگەر ساحیرێکی دەستنەکەوت خۆی ئامادە دەکات بۆ بەڵاکەو هەتا دەمرێت نان ناخوات...)).

بێگومان پیاوێکی مەدەنی بەهیچ شێوەیەك و لەژێر هیچ فشارێکدا بەوشێوەیە خۆی ناکوژێت، ئەگەر هەزار پەیکەری قوڕی بۆ بکەن و هەزار چەقۆشی لەسنگ دابکوتن.

ئەو ساحیرەی دەتوانێت بەو ڕێگەیە یەکێك بکوژێت، بەهەمان ڕێگەش دەتوانێت مرۆڤە سەرەتاییەکان چاك بکاتەوەو برینە سەختەکانیشیان چارەسەر بکات. ئەگەر کۆمەڵانی خەڵك باوەڕ بەهێزە دەروونیەکان بکەن لە هەردوو لایەنی(چاك‌و خراپەوە)، زیان دەبەخشێ و سوودمەندیشە.

مرۆڤە سەرەتاییەکان لە بەکارهێنان‌و بەرهەمهێنانی هێزە دەروونیەکانیاندا دە ئەوەندەی مەدەنیەکان کارامەو لێهاتووترن.

(سینل) دەڵێت : کاتێك لەسەردەمی جوڵانەوەی (مەهدی)دا لەخەرتووم (غردون پاشا) کوژرا... یەکێك لە مرۆڤە سەرەتاییەکانی باشووری ئەفریقیابەسات‌و شوێنی ڕووداو پێشبینی کوشتنەکەی کردبوو. هەرچەندە ماوەی نێوان خەرتوم‌و ئەفریقیا نزیکەی چوار هەزار میل دەبێت.

یەکێك لە ڕۆژنامەکانی ئینگلیز چیرۆکێکی لە ژێر ناونیشانی ((بێتەلی مرۆیی)) نوسیبوو: ((پیاوێکی بەساڵاچووی ئەسکیمۆیی بەچەند گەشتیارێکی ڕاگەیاندبوو کە لەرۆژهەڵاتی کەنەدا دابەلادێیەکاندا دەگەران کە هاوڕێیەکیان لە ئەمریکای ناوەراست کوژراوە... ئەو پیاوە

بەسالاچووە زۆر بەوردیو وەکو ئەوەی خۆی لەوێ بووبێت رووداوەکەی گێڕابووەوە ... دوای سالێك کە هاوڕێکانی سەردانی شوێنی روداوەکەیان کرد بۆیان دەرکەوت ئەوشتانەی پیاوە پیرەکە گوتبووی هەموو وردەکاریەکانی راست بوون.

هەروەها سینل چیرۆکێکی تر دەگێڕێتەوە لە سەر کوڕەکەی خۆی کاتێك ئەندامی وەفدێك بووە بۆ ناوچەکانی باشووری سودان. کورتەی چیرۆکەکە ئەمەیە: ((کوڕەکەی لەیەکێك لە جەنگەڵەکاندا ون ببوو، شەوێك بەتەنها مایەوە بۆ بەیانی پیاوێك هاتەلای بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە. کاتێك پرسیاری لێکرد چۆنت زانی من ون بوومو لەم شوێنەدام، وەلامی دایەوە ((خودا پێی گوتم)).

زیاد ڕەوی ناکەین ئەگەر بلێین : مرۆڤ هەرچۆنێك شارستانیەتە ماددیەکەی ئالۆزتر بێتو ڕووناکبیریە عەقلیەکەی زیاتر بێت ئەوەندە هێزە دەروونیەکانی لاواز دەبێت. هەوەکو دەروونو ماددە لە دوولای پێچەوانەدان... هێزێکیان لەسەر حیسابی ئەوی تریان بەهێز دەبێت.

(سمنەر) لێکۆلەری بەناوبانگی کۆمەلناسی دەلێت: کاتێك مرۆڤە سەرەتاییەکان دوو روداوی یەك لە دوای یەکیان بینی دەیبەنەوە سەر (هۆکارو ئامانج). سمنەر چەندین چیرۆك بۆ رونکردنەوەی ئەو بۆچوونەی دەهێنێتەوە:

لە یەکێك لە دورگەکانی ئۆقیانووسی (ئارام)دا یەکێك لە مرۆڤە سەرەتاییەکان بە پیشەسازی نەخشو نیگارەوە خەریك بوو. بەڕێکەوت رۆژێك مرد. خەلکی دورگەکە مردنەکەیان گێڕایەوە بۆیەکێك لە ئەنجامەکانی ئەو پیشەسازیە.. بۆیە ئەو پیشەسازیەیان بەشێوەیەکی

بنـەڕەتی لـەنێو خۆیـاندا قەدەغـە کـردو تاهەتایــە ئــەو پیشەســازیە لــە دورگەکەیاندا هەڵگیرا.

جارێکی دی پیاوێکی سپی پێست گۆچانێکی پێشکەش بەیەکێك لە مرۆڤە سەرەتاییەکانی باشووری ئەفریقیاکرد. بەڕێکەوت دوای ئـەوە مرۆڤـە سـەرەتاییەکە مـردو گۆچانەکـە مایـەوە بـۆ کوڕەکـەی بەڕێکــەوت ئەویش مرد.

دانیشتوانی دورگەکە هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە (مەلائیکەی مردن) لەنێو ئەو گۆچانـەدا خـۆی شاردۆتەوە. بەپەلـە گۆچانەکـەیان بـردەوە بـۆ خاوەنەکەی، لەترسی ئەوەی نەوەکو هەموو دانیشتوانی دورگەکە بمرن.

هەروەها دانیشتوانی یەکێك لە گوندە سەرەتاییەکان کە بۆیەکەمجار حوشتریان بینیو بەڕێکەوت هەر لەوکاتەدا نەخۆشی ئاوڵە لە نێوانیاندا بڵاوبـوەوە، هۆکـاری توشـبوونی ئـەو نەخۆشـیەیان بـردەوە سـەر ئـەو حوشترە بەستەزمانە. ولەگوندەکە دەریان پەڕاند.

سمنـەر چیرۆکێکی دی دەگێڕێتــەوەو دەڵێـت: ڕۆژێـك کۆمـەڵێك لــە ئەسکیمۆکان چـوون بـۆ راو بـەڵام هیچیـان دەسـت نەکـەوت. یـەکێکیان گەڕایـەوە کەپرەکـەیو ئێسکێکی سەگی لـێبوو دەستی کرد بەخواردنی ئەو برە گۆشتەی بە ئێسکی سەگەکەوە بوو... بەڕێکەوت کە گەڕایـەوە بۆ راوکـردن پارچە ئێسـکی سـەگەکەی هەربەدەسـتەوە بـوو ... سـەگلاوێکی بینیو راوی کرد.... ئەو سەرکەوتنەی لەراوکردنی سەگلاوەکەدا بردەوە سەر پارچە ئێسکی سەگەکە، بۆیە هەرچی جارێك دەچووە راو ئەو پارچە ئێسکەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

ئەو شێوازی بیركردنەوەیە لەنێو مرۆڤە سەرەتاییەكاندا بڵاوبۆتەوە دەبێتە هۆی زۆربوونی خورافاتو دابو نەریتی هیچو پووچ.

ئەگەر یەكێكیان شتێكی دیاریكراوی كردو پاش ئەوە لەكارێكدا سەركەوتنی وەدەستهێنا، دەڵێت رۆحێكی شاراوە لە پشت ئەو سەركەوتنەی منەوە هەیە. بەو شێوەیە ئەو كارە دەكەوێتە چوارچێوەی دابو نەریتو هەڵسوكەوتە بۆ ماوەییەكانەوەو وردەوردە دەبێتە شتێكی پیرۆز.

لەسەر ئەو پێودانگە هەنگاو و كارە هیچو پووچە پیرۆزەكان نەوە لەدوای نەوە كەڵەكە دەبنو دەبنە كەلتورێك.

شتێكی بەڵگەنەویستە ئەو شێوازە بیركردنەوەیە هەندێك جار بەرادەی زیانەكانی سوود بەخشیشە. ئەو كەسەی لە هەموو ڕاوو شكارێكدا پارچە ئێسكی سەگێك لەگەڵ خۆیدا دەبات و باوەڕێكی تەواوی هەیە رۆحی ئێسقانەكە دەپیارێزێ و سەركەوتنی بۆ مسۆگەر دەكات. ئەوە لەڕاوكردندا زۆر بەهێزترە لەوەی پارچە ئێسك یاخود عەقیدەیەك شك نەبات.

ئەو ڕاوچی‌یەی لەخۆی دڵنیایەو باوەڕی بە سەركەوتنەكانی هەیە بێزیانتر دەبێت لەو ڕاوچیە ترسنۆكەی هەر كەچاوی بە ئاژەڵێكی دڕندە كەوت هەتا بۆی بكرێ ڕادەكات.. ڕاوچی ترسنۆك بۆ ڕاوكردنی نێچیرێك دەڕوات، بەڵام خۆی دەبێتە نێچیری ئاژەڵێكی دڕندە.

ڕاوچیە ئەورووپیەكانیش ئەو حەقیقەتە دەزانن كاتێك دەچنە دارستانەكانی ئەفریقیاو هیندستان.. راوچی‌یە لێهاتووەكانیان بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر باوەڕیان بەخۆیان هەیە. ئەوان لەو

باوەڕەدان بەختی یاوەریانە، یاخود لەلایەن هێزێکی شاراوەوە دەپارێزرێن، زۆربەی جارەکانیش پارچەیەکی یادگاری لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن و ئەگەر بەڕێکەوت وونی بکەن ترس دەچێتە دڵیانەوەو توشی دڵەڕاوکە دەبن.

بەڵام بیرکردنەوەی زانستی کە ژیانێکی مەدەنی دەخوازێت لەسەر ئەو ڕێڕەوە ناڕوات.. ئەو داوا لەهۆکارەکان دەکات چەندین جار دووبارە ببنەوە، هەموو جارێکیش هەمان ئەنجام وەدەست دەهێنێت. کەسێکی مەدەنی باوەڕی بەو یاسا سروشتیانە هەیە کە لە هەموو کات و شوێنێکدا لە سەر یەك ڕێڕەو دەڕۆن.. لەڕوانینی ئەودا ئەو یاسایانە (تایبەتی) نین و بەسەر هەموو کەسێکدا و بەبێ جیاوازی جێبەجێ دەبن. هەر ئەو بیرکردنەوە زانستیەشە پاڵنەری بەهێزی تاکێکی مەدەنیە بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی سروشت و دۆزینەوەی زۆربەی هێماکانی.

کەسی مەدەنی کلیلی مادەی بەدەستەوە گرتووە، بەڵام لەهەمانکاتدا کلیلی دەروونی لەدەست داوە.. لەیەك کاتدا تاکێکی واقیعی دوربین و ڕاڕایەکی دوو دڵی بێئارامە.

بەدەگمەن یەکێك دەتوانێت بیرکردنەوەی مەدەنی و دڵنیایی بیرکردنەوەی فیکری لەیەك کاتدا کۆبکاتەوە.

لەمەوبەر ئامارەمان بەوەدا کە عەبقەری دەتوانێت عەقڵ و شێتی بەیەکەوە گرێ بدات، هەروەها هەوڵدان و تەمبەڵی، ئیرادەو ناموبالات.. دەمانەوێت ئەوەشی بخەینەسەر کە: دەتوانێت بیرکردنەوەی فیکری و بیرکردنەوەی مەدەنی لەیەك کاتدا کۆبکاتەوە.. بەواتایەکی دی:

عەبقەریــەت بریتییــە لــە کۆبونــەوەی هــەموو کەمووکورتیــەکان لەیــەك کەسایەتیدا..

ئەو کەسەی لەهەموو کاتێکدا عاقڵە، هەروەکو ئەوە وایە هەمیشە شێت بێت.. زۆربەکەمی شتی چاك بەرهەمدێنێت.

چالاکێکی شێلگیر کە لەهەموو کاتێك دا وردەکاری دەکات.

جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ تەمبەڵێکدا نییە تەنها لەو شتانەدا نەبێت کە لە ئەنجامی یاریەکانی ژیاندا وەدەستی دێنێت. ئەو کەسەی خاوەنی بیرکردنەوەیەکی زانستیە هەروەکو کەسێکی خاوەن بیرکردنەوەی فیتری لەژیانیدا سەرکەوتوو دەبێت، ئەو لەلایەکەوە قازانج دەکات و لایەکی تر لەدەست دەدات.

ئەگەر لە کەسایەتی زۆربەری سەرکەوتوەکانی دونیا وردبینەوە دەبینین زۆربەیان هەڵسوکەوتێکی سەیریان هەبووە. ئەوان لە بیرێکی دیاریکراودا بۆماوەیەکی دورودرێژ نامێننەوە. هەر رۆژە لەسەر ئاوو هەوایەکن.. ئالەوێدا پیاوی سەرکەوتووی دەگمەن لە کەسێکی ئاسایی جیادەکرێتەوە کەسێکی ئاسایی خاوەنی لایەنێکی چەسپاوی چەقبەستووە، بە دەگمەن نەبێت ناگۆڕێت.. تۆ دەتوانیت لەهەموو کاتێکدا بە ڕەنگ و ڕویدا بیناسیتەوە. بەڵام پیاوی عەبقەری هەمیشە هەڵدەچێ و لەشوێنێکدا ئارام ناگرێت. هەندێك جار دەبینی ساردو سڕو کپ و بێدەنگ هەندێك کات حەکیمەو هەندێك جاری دیش پیاوێکی خورافییە.. لەساتەوەختێکدا عاقڵەو لەساتێکی دیدا شێتێکی ماڵوێرانە.. هەندێك جار باوەڕدارێکی تەواوەو، هەندێك جاری دیش گومان لەو ساتەوەختانەی داهاتوشی دەکات.

کەسیەتی پیاوێکی عەبقەری زۆر ناوازەیە.. جێگەی شەرمەزاریە هەندێك لە کەسە ئاساییەکانی کۆمەڵ دەبینین دەیانەوێت لاسایی پیاوە عەبقەریەکان بکەنەوە.. عەبقەریەت تێکەڵەیەکی سەیرە لە بەهرەکانی هەستو نەست.. پیاوی لێهاتوو هەوڵدەداتو کۆدەکاتەوەو ورد دەکاتەوەو لێدەکۆڵێتەوە هەتا ساتی یەکلاکردنەوە دێت، ئالەوکاتەدا دەستی خۆی دەوەشێنێتو ناکەوێتە ژێر فشاری هیچ وردبونەوەو لێکۆڵینەوەیەکەوە.

بۆ نموونە بڕوانە محەمەدی عەبقەری .. ئەو پیاوە دەگمەنە (دانایەکی) واقعیو دوربین بوو، لە نەخشەدانانو بەڕێوەبردنی شەڕەکاندا. ئەگەر روی لە خودای خۆشی بکردایە خۆی لەبیر دەکردو ڕۆدەچووە ئەو ئیمانە سەرسوڕهێنەرەیەوە. کە لەو حاڵەتەدا دەبینرا هەر لە شێت دەچوو شێتیش نەبوو.

دەگێڕنەوە بەر لەدەستپێکردنی شەڕی بەدر، پرسو ڕای بە هاوەڵەکانی دەکرد، سەربازەکانی ئامادە دەکردو هەروەکو هەموو سەرکردەیەکی لێهاتووی تر شمشێرەکەی خۆی ڕادەکێشا.. تا لە ساتەوەختی دەستپێکردنی شەڕیشدا هەردوو دەستەکانی ڕوەو ئاسمان بەرزدەکردەوەو بانگی لەخودای خۆی دەکرد.

بەهەموو شێوەیەك گڕی دەگرت. ئەو لەکاتی خۆئامادەکردنیدا زۆر جیاوازبوو لە قۆناغی هێرشکردن، بەڵام شوێنکەوتووانی محەمەد، هەروەکو (مەعری) دەڵێت: یان عاقڵێکی بێئاین بوون، یاخود ئیماندارێکی بێعەقڵ بوون.

# دوا ووتـــــــە

چینـە دەسـەڵاتدارەکان بـەدرێژایی و جیاوازی قۆناغـەکانی مێـژوو، چەندین بەڵگەو بیانویـان بۆ دەســەڵاتە چەوسـێنەرو داپڵۆسـێنەرەکانیان بەسـەر هاولاتیـانو کۆمـەلانی خـەلکی ولاتـەکانیاندا هێناوەتـەوە... بـۆ نموونە لەسـەدەکانی ناوەڕاستدا دەیانگوت: ئـەوان دەسـەڵاتەکانیان لـە خوداوە پێبەخشراوە... و سەربازی خـودا، یـاخود سـێبەری خـودان لەسەر زەوییدا.

دوای ئـەوەی شۆڕشـی پیشەسـازیش لــە ڕۆژئـاوادا دەسـتیپێکرد بیانوی: ((هەر کەسێك لەپێناو کارێکدا تێبکۆشێت وە دەستی دەهێنێت)) یـان دەهێنایـەوە.. ئـەوان بـەچاوی رقو کینـەوە لـە کۆمـەلانی خـەڵکیان دەڕوانی و بە گێلو تەمبەڵیان لە قەڵەمدەدا کە نەیانتوانیوە بە پەیژەکانی سەرکەوتندا بچنە سەرێ.

لەمەوبەر گوتمان پرنسیپی (هـەرچ کەسێك بـەدوای کارێکدا بڕوات وەدەستی دێنێت)) دەکرێت لە پەروەردەکردنی منداڵو مێرد منداڵـەکاندا بەکاری بهێنین، بەڵام پرنسیپێکی مەترسیدارە ئەگەر تەڵقینی گەورەکانی پێبدەین، چونکە ئەگەر لەنێو گەورەکاندا بڵاو بووەوە، دەبێتـە بەڵگەیـەك بەدەســت بەهێزەکانــەوە بــۆ ئــەوەی لاوازەکــانی پــێ قــوت بــدەن و بیانچەوسێننەوە. ئەگـەر لاوازەکانیش داوای مافەکانیان لێبکـەن دەڵێـن: ((هـەوڵبدە، هـەرچ کەسـێك بـەدوای کـارێکدا بـڕوات و سـوربێت لەسـەری وەدەستی دێنێت)).

لەو بەشانەی پێشووی ئەم کتێبەدا باسی ئەوەمان کرد کە سەرکەوتنەکانی مرۆڤ بەهەموو جۆرەکانیەوە چەندین هۆکاری جیاوازی هەیە، لەوبەشانەدا هەوڵمانداوە باس لە هۆکارە دەرونیەکانی سەرکەوتن بکەین. بەلآم هۆکارە کۆمەلآیەتیەکانیش رۆڵێکی گرنگ و کاریگەر دەگێڕن لەوبابەتەدا.. لەوانەیە هەندێك جار هۆکارە کۆمەلآیەتیەکان کاریگەرتربن لە هۆکارە دەرونیەکان... ئەو مرۆڤەی لە ماڵێکی هەژاردا لەدایك دەبێت و بەهەژاریش گەورە دەبێت، ئەوکاتە لە دەوروبەرە دیاریکراوەکەیدا دەنێژرێت. هەرچەندێکیش بەهرەمەندو عەبقەریش بێت ناتوانێت قۆناغەکانی سەرکەوتن ببڕێت.

کەواتە سەرکەوتنەکانی مرۆڤ هەموو کاتێك تەنها پەیوەندو پەیوەست نییە بە بیرکردنەوەو نەخشەکێشانی لەبارو گونجاوەوە بەڵکو لەو بوارەدا پێوەندکراوی کۆمەڵێکی زۆری بەربەستەکانە.. خۆ ئەگەر بتوانێت لە پێوەندە دەروونییەکانی دەربازبێت چەندین پێوەندی کۆمەلآیەتی لە بەردەمیدا دەبن بە بەربەست... گەلی عێراقیش لەولایەنەوە گیرۆدەی ئەو دەرکەوتە کۆمەلآیەتیە بووە کە لە نەخۆشییە کوشندەکان مەترسیدارترە.

خوێنرێژەکانی عێراق و بەشێك لە خوێندەوارەکانیش بەچاوی رق و کینەوە دەڕواننە کۆمەلآنی خەڵك، رەنگە هەست بەو رق و کینەیەشیان نەکەن چونکە لەقولآیی ناهەستییاندا حەشاردراوەو روەو ئەو هەڵسوکەوتانە پەلکێشیان دەکات..

رۆژێـك لەگـەڵ خوێندکـارێکی میسـریدا کـە لـە ئـەمریکا بەیەکـەوە دەمـانخوێند، کەوتمـە گفتوگـۆوە. مـن گـووتم سروشـتی گـەلی میسـری جوتیارانەیـەو سـورییەکانیش بازرگانانـە هەڵسـوکەوت دەکـەن. . . لـە راسـتیدا مـن دەمویسـت بەشـانوباڵی گـەلی میسـردا هـەڵبڵێم و لـەپاکی و سادەییدا بە جوتیاری بچوێنم. من لەوباوەڕەدابووم جووتیار کۆمـەڵێك تایبەتمەندی چاکی هەیە کەلای بازرگان دەست ناکەوێت. . . بەڵام ئەو کوڕی پادشایە لە گوتەکەی من نەگەیشت، چوونکە لە قووڵایی عەقڵی نـاوەوەیدا گرێیـەکی شـاراوەو حەشـاردراو هەیـەو هەسـتی پێناکـات و پاڵنـەرێکی بەهێزیشـە بـۆ ئـەوەی رق و کینـە بەرامبـەر جوتیارەکـان هـەڵبگرێت و بـە مرۆڤێکـی نـزم لێیـان بڕوانێـت کـە خـاوەنی هیـچ جـۆرە کەرامەتێك نین ئەو کوڕی پادشایەی هاوڕێم جوتیـار دەچەوسـێنێتەوەو نانی عەرەقی نێوچەوانیان دەخوات، سەرەڕای ئەوەش رقی لێیانە.

من لەوباوەڕەدام جەللادەکانی عێراق لەو کوڕە پاشایە پتر رقیان لە جوتیـارو هـەژارەکانی ئـەم وڵاتەیـە، چونکـە لـە عوسمانیـەکانی بـەر لـە خۆیانەوە بۆماوەییەکی نا هەستیان بۆ بەجێماوە.

ئەگەر لە نوسینگە، یاخود شوێنی کارەکەی چویتە لای یەکێك لەو خوێنمژانـە، ئاگـای لـەخۆی نیـەو سـەری خـۆی پێنـاخورێ و زۆر بـەگرانی دەدوێـت، چونکـە بـە بانگەشـەی خـۆی بـیری لای خۆشەویسـتی وڵات و گەلەکەیەتی، هیچ کاتێکی نییە بۆ گوێگرتن لە سکالای ئەو هاوڵاتیانـەی رودەکەنە ئەو شوێنە، ئەوانەی بەبۆچوونی ئەوان هیچ خێرو چاکەیەکیان نییە بۆ نیشتمانەکەیان.

گێروگرفتی سەرەکیش لەوەدایە، چەوساوەو زوڵملێکراوانی ئەم وڵاتە ناتوانن باس لە خۆیان بکەن.. لەولاشەوە دەرگای نوسین و گوتارەکان لەسەر پشتن بۆ ئەوانەی خۆشدەگوزەرێنن و دەنوون‌و دەخۆن.

دەبینی زوڵملێکراو بێدەنگەو زاڵمیش دەدوێت‌و دەنگ هەڵدەبڕێت، ئەو راستیەش رێژەو رادەی ئەو ئازارو بێبەشییەمان بۆ دەردەخات کە ئەم گەلە چەوساوەیە بەدەستیەوە دەناڵێنێ.

جارێکیان لە شۆستەی شەقامێکی نیویۆرکدا پێڵاوەکانم بۆیاخ دەکرد. . . بۆیاخچیەکە جارجارێك دەوەستاو لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەدوا کە لە تەنیشتمانەوە وەستابوو، هەردوکیان باسیان لە گەشتێکی راوو شکار دەکرد کە ئەو پیاوە بەهەیبەتە لەگەڵ ژنەکەیدا و لەکەنارەکانی کالیفۆرنیا ئەنجامی دابوو. . . پاش ماوەیەك پیاوەکە رۆیشت‌و بە بۆیاخچیەکەم گوت: ئەو پیاوە کێبوو؟

گوتی: ((هاورێمە. . . و بەرێوەبەری ئەو نەخۆشخانەیەیە)). بەدەستی ئاماژەی بۆ نەخۆشخانەیەکی نزیك کرد کە لە گەورەییدا، نەخۆشخانە حکومییەکانی ئێمە تەنها ئەوەندی ژووری مەتبەخەکەی دەبێت.. من تووشی سەرسوڕمان بووم ئەو بەرێوەبەرە گەورەیە لەگەڵ بۆیاخچی پێڵاوەکانی مندا دەدواو هاورێی بوو. . . لەو کاتەدا چیرۆکێکی عەلی کوڕی ئەبو تالیبم کەوتەوە یاد، کە لەسەردەمی خەلافەتیدا لە کوفە دەچووە دوکانی بەقاڵێکی هاورێی، ئەگەر هاورێکەی بەکارێك بڕۆشتایە عەلی لەجیاتی ئەو خورمای دەفرۆشت.

جەعفەری کوڕی محەمەدیش دەڵێت: ((ئەو کەسەی خۆی بە گەورە بزانێت، یاخود زوڵم بکات، لەدەرونی خۆیدا هەست بەکەم و کورتیەك دەکات)). لە زۆر حاڵەتدا ئەو گوتەیەی جەعفەر راستی پێکاوە.

لێکۆڵەرەکان دەڵێن: خۆبەزلزانین و لوتبەرزی هەندێك جار وەکو رووپۆشێك لەلایەن تاکەکانەوە بەکاردێت ئەو کەسەی تایبەتمەندییەکی جیاوازی هەیەو لەخەڵکی جیای دەکاتەوە پێویستی بەو رووپۆشە نییە.. ئەو بەبێ خۆ بەزلزانین و بە سروشتی ئاسایی خۆیەوە دەچێتە نێو کۆمەڵانی خەڵکەوە، بەڵام ئەو کەسەی هەست دەکات لە خەڵکی کەمترە، یاخود بەلای کەمەوە وەکو ئەوانە، هەوڵدەدات پەردەیەکی خۆ بەزلزانین و لوتبەرزی لەنێوان خۆیو کۆمەڵانی خەڵکدا دروست بکات، بۆ ئەوەی حەقیقەتە ئاساییو سروشتیەکەی بۆ خەڵکی ئاشکرا نەبێت.. زۆربەی جارەکان ئەو کەسانە رێکەوت گەیاندونیەتە پلەو پایەیەکی بەرز کە شایانیان نییە، پەنا دەبەنە بەر دروستکردنی ئەو رووپۆشە. لەوکاتەدا ناچار دەبن رەوشتو هەڵسوکەوتێکی تایبەت بەکاربهێنن بۆ ئەوەی لەخەڵکیجیایان بکاتەوە. بەواتایەکی دی: ئەوان تایبەتمەندییەکی جیاکراوە بۆ خۆیان دروست دەکەن بۆ ئەوەی ئەو شتەی لە جیاوازییە سروشتیەکەیانەوە لە دەستیان داوە بیگێڕنەوە.. ئەو جیاکارییە دروستکراوەی مرۆڤە (کەم)ەکان بەکاری دەهێنن ئارەزویەکی ناهەستی رووەو سەرکەوتنو هەڵکشانو بەرزبوونەوە لە دەرونیاندا دروست دەکات.

(فبلن) لێکۆڵەری ناسراوی ئەمریکا دەڵێت: ((ئەندامانی چینە بەرزەکانی کۆمەڵ، یاخود چینی (predatory) هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ

ئـەوەی جیاوازییـەکی دەسـتکرد دابـهێنن و لـە چینـەکانی دی جیایـان بکاتەوە بەتایبەتی چینی هەژارو زەحمەتکێش.

گرنگترین ئەو جیاوازییە دەستکردانە (زمـان)ە، ئـەندامانی چینـە بەرزەکان کاتێکی زۆر لە فێربوونی رێزمان و رەوانبێژییدا بەفیڕۆ دەدەن... کـە لەگـەڵ یـەکێکدا دەدوێـن ئـەو بنەمایانـەی زمـان بـەکار دەهێنـن کـە زەحمـەتکێش و چەوسـاوەکان لـێ‌ی تێناگـەن... بـەبۆچوونی (فبلـن) زەحمەتکێشـەکان ئـەو کاتـەیان نییـە بـۆ فـێربوونی بنـەماکانی رێزمـان و رەوانبێـژی..زمـانی ئاخـافتنی زەحمەتکێشـەکان تـا ئەوپـەڕی سـادەو سـاکارە، بۆیـە بەرامبـەر چینـە بالاًکـانی کۆمـەڵ وەکـو گێـل و نـەزان دەردەکەون.

ئەو تیۆرییەی (فبلن) لەناوەندە زانستیەکانی ئەمریکادا رەواجێکی چاکی هـەبوو، بەسـەر واقیعـی ژیانیشـدا جێ‌بـەجێ دەبێـت. بەتایبـەتی دوای ئەوەی لەشارستانیەتی ئیسلامیشدا خەلافەت بوو بە کۆکردنـەوەی موڵـک و پـارەو سـامان و رابـواردن، ئـەو جیاکردنـەوە دەسـتکردە بەشێوەیەکی ترسناك بڵاوبوەوە. زۆربـەی جارەکـان ئەنجومـەنی دەوڵـەت لەهەموو کارەکانی رادەوەستا، تەنها بۆ ئەوەی ململانێیـەکی زمانـەوانی نێوان رێزمانزانێك و گۆرانی بێژێك ببینن.

لەسـەردەمی عوسمانیەکانیشـدا، لـە عـێراق هـەمان شـت دووبـارە بوەوە، ((ئەفەندییەك)) رق و کینەیەکی زۆری بەرامبەر زمانی گەلانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی هەڵگرتبوو بەزمانە تورکیەکەیان دەدوان.

كە دەوڵـەتی عـێراقیش دروسـت بـوو. سـەروەری و نەمرییـەكانی (عــەدنان)و (قــەحتان)و (نــزار) جێگــەی (حیكمــەت)و (مەدحــەت)و (حیشمەت)یان گرتەوە.

(ئەفــەندی) پاشەكشــەی كـردو زمـانی (سـیبەوەی)و (نەفتەویــە) جێگەی ئەو زمانە ئاڵۆزو پڕ لە خوڕەو شەپۆلە توركیانەی گرتـەوە.. ئـەو تیۆرییەی (فبلن) ئـەمڕۆ لـە عێراقدا بەسـەر خوێندكارەكانیشـدا جێبەجێ دەبێت.. ئەمڕۆ نەمری و سەروەری پێشینەكانیان لە رویەك لـە روەكانـەوە زینـدوو دەكەنـەوە.. هەریـەكێكیان گوتـەكانی لێوانلێـو دەكـات لـە وشـەی تـەمومژاوی و دەسـتەواژەی نـامۆ، بۆ ئـەوەی لاوازییەكـەی دابپۆشـێت... لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین: ((هەرچەندێك كەسێك زانیاری كەم بێت‌و روناكبیرییەكـەی بێتـە خوارەوەپـەنا دەباتـە بـەر دەسـتەواژە نامۆكـان و لــە هەموو دانیشتن‌و شوێنێكدا هەڵیاندەڕێژێت.

لەو رێگەیەوە بە شێوەیەكی ناهەستی پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئـەوەی ئـەو گـرێ داپۆشـراوو مۆڵدراوانـە دابپۆشێت كـە لــە قولایـی دەرونیدایــەو هەموو ساتەوەختێك و بەبێ هیچ بنەمایەك پاڵی پێـوە دەنێت رووەو خـۆ جیاكردنەوەو بەرزەفڕی.

لەبەشـی یەكـەمدا باسـی چوارچێـوە فیكرییـەكانمان كـرد و گوتمـان مـرۆڤ نـاتوانێت بەشــێوەیەكی تــەواو لەبیركردنـەوەكانیدا لــە چوارچێـوە فیكریەكــەی دەربــازی بێــت، چونكــە كۆمــەڵێك پێوەنــدی دەرونــی‌و كۆمەڵایەتی‌و شارستانی لەقاڵبیان داوە.

هــەروەكو گوتیشــمان مــرۆڤ كــاتێك بــیر دەكاتــەوە هەســت بــەو پێوەندانە ناكات، چونكە لە قوڵایی نەستەوە هەڵدەقوڵێت، هەرچـەندە خۆی واهەست دەكات لەبیركردنەوەكانیدا ئازادە بەڵام بەهەموو شێوەیەك و لەهەموو لایەكەوە پێوەندكراوە.

لەبەشی چوارەمدا پێكهاتەكانی نەستمان لێكدایەوە كەهەندێك جار دەبنــە ســـەرچاوەی خـــێرو داهێنانـــەكانی مـــرۆڤ و هـــەندێك جـــاریش سەرچاوەی شەڕو زوڵم و زۆرو كەم و كورتییە.. لەلایەكەوە هەڵقوڵێنەری هێزە نائاساییە دەروونییەكانی مرۆڤەو لەلایەكی دیكەوە كێڵگەی ئارەزووە سەركوتكراوەكانە...

ئێمە لەم قۆناغـە پـڕ لـە تەنگژەیـەی مێژوومـاندا كـە لێوانلێـوە لـە هەرەس و روخان و ژێركەوتن، پێویستە گرنگی بدەین بە لێكۆڵینـەوەی نەســت و پـــەردە لـــەڕووی ئـــەو شـــتانە هەڵبدەینـــەوە كـــە لـــە كاروبـــارە كۆمەڵایەتیەكان و بەبێ ئەوەی هەستی پێبكات دەیجوڵێنێ و ڕێڕەوەكانی دیاری دەكات.

بەشـــێكی زۆری مەینەتیـــەكانی ئێمـــە لـــە ســـەرجەم گوتـــارو ئامۆژگارییـــەكانماندا تەنـــها پشـــت بـــە هەســـتەكانمان دەبەســـتین و نەستەكانمان پشتگوێدەخەین، گـەر بمانـەوێت مرۆڤێك بخەینــە ســەر ڕێگەیەك پەنا دەبەینە بەر مشتومڕێكی توندی لۆژیكی، كاتێكیش زاڵمێك دەمانچەو سێنێیتەوە بانگ لە ویژدانی دەكەین و داوا لە عەقڵی دەكەین سنورێك بۆ دەستدرێژی و زوڵمەكانی دابنێت. هەربۆیە دەیـان سـەدەیە هاوار دەكەین و داوای یارمەتی دەكەین و كەس نایەت بە دەنگمانەوە.

پێكهاتەكانی (نەست) ی مرۆڤ سێ بەشن:-

١- بەشی یەکەمیان: پێکهاتووە لە هێزە نائاساییەکانی نەست، بۆ لێکۆڵینەوە لەو هێزە نائاساییانەش بەشێکی زۆری ئەم کتێبە تەرخانکراوە.. لە ئەنجامی خوێندنەوەشدا خوێنەر بۆی دەردەکەوێت، کاتێك مرۆڤ دەرونی خۆی پاك دەکاتەوەو لەپێوەندو گرێکانی دەربازی دەبێت چەند بەرزو باڵا دەردەکەوێت و یارمەتی دەدات لە کارەکانیدا.

٢- بەشی دووەمی پێکهاتەی نەست بریتییە لە ئارەزووە سەرکوتکراوەکان و گریێ دەرونییەکان، ئەوەشمان باسکرد کە ئەو بەشە چۆن و بەچی شێوەیەك دەبێتە ڕێگرێك لەبەردەم هێزە نائاساییە داهێنەرەکانی مرۆڤداو هەندێك جاریش چ شێوەیەکی دزێوو ناشایستە بە مرۆڤ دەبەخشێت.

٣- بەشی سێیەمیان ناوی دەنێین بەها کۆمەڵایەتیەکان، ئەو بەهایانەش بەشێکی زۆری چوارچێوە فیکرییەکان پێکدەهێنن، کە لەبەشی یەکەمدا لێی دواین. زۆربەی جارەکانیش ویژدانی مرۆڤ پشتئەستوری ئەو بەهایانە دەبن. لە کۆنەوە هەتا ئێستا مرۆڤ زۆر توندڕەوانە پشتی بە (ویژدان) بەستووە وایانزانیوە ویژدانی مرۆڤ حەقی ڕەهاو دادپەروەری تەواوە لە خودی مرۆڤدا.. ئەو بڕواو متمانەیە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە چونکە ویژدانیش هەروەکو (بیر)ی مرۆڤ بەلای شتێکدا دایدەشکێنێ و لەڕێڕەوەکانیدا تووشی لادان دەبێت.

نابێت زوڵملێکراو پشت بەویژدانی زاڵمەکەی ببەستێت، ئەو زاڵمەی کاتێك دەچەوسێنێتەوەو زوڵم دەکات خودی خۆی بەهیچ شێوەیەك

هەست ناکات زوڵمی کردوەو یەکێکی چەوساندۆتەوە. چونکە ئەو لەڕێگەی دوربینێکی تایبەتیەوە بۆ شتەکان و رووداوەکان دەڕوانێت، کە لەهەموو لایەن و رویەکەوە جیاوازە لەو دوربینەی زوڵملێکراوە کە روداوەکانی پێدەبینێ.

ویژدانی زاڵمەکان لەسەر بنەمای ئەو بەها کۆمەڵایەتیانە دروست بووە کە زاڵمەکە ڕێزیان لێدەگرێت و باوەڕی پێهێناون.. دوربینەکانی زاڵم لەو پێوەرانە پێکهاتووە کە لە کەسوکارو خوێندکارو ئەندامانی چینە کۆمەڵایەتیەکەی خۆیەوە فێری بووە.

دادپەروەری و زوڵم و زۆر دوو کاری ڕێژەیین، زوڵملێکراو سەری سوڕدەمێنێ کاتێك زاڵمەکەی دەبینی ویژدانی ئاسودەیە هەروەکو هیچ شتێکی نەکردبێ و کەسی نەچەوساندبێتەوە... ئێمە لەو حاڵەتەدا ماف دەدەین بە زاڵمەکە کاتێك زوڵم لەتۆ دەکات و دەروونی ئاسودەیە، چونکە کردەوەکانی بەپێوەری ئەو کۆمەڵگەیە دەپێورێ کە تێیدا دەژی، ئەو لەو باوەڕەدایە بەگوێرەی ئەو پێوەرە راست و دروستانە هەنگاو دەنێت کە بۆ هەموو کاتێك و شوێنێك گونجاوە... هەست بەو راستیە ناکات ئەو پێوەرانە ئیعتیبارین و تەنها تایبەتن بەخۆی و کۆمەڵەکەیەوە. بەها کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵێك هەروەکو گرێ دەرونییەکانی تاکێك وایە، هەردووکیان رەوشتەکانی مرۆڤ ئاراستە دەکەن و بەبێ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن بیرکردنەوەکانیان پێوند دەکەن.

یەکێك لەو رووداوانەی هەرگیز ناتوانم لەیادی بکەم، دەیان ساڵ بەر لەئێستا لەکازمیەی بەغدا کۆمەڵێك لەبەر هەر هۆیەك بووبێت خۆپیشاندانێکیان رێکخست و لەناوەندی شاردا ئاژاوەو بارگرژییەکیان

دروست کرد.. یەکێك لە خوێنڕێژەکانی بەغدا بە خۆیو کۆمەڵێك پۆلیسەوە هاتنو بەدەسترێژی گوللە کۆمەڵێکی زۆریان لێکوشتن. ئەو خوێنڕێژە بەوەشەوە نەوەستاو رووی چەکەکەی کردە چایخانەیەکی نزیك کە پڕبوو لە دانیشتوان ژمارەیەکی تریشی لە چاخانەکەدا کوشت، دەنگی تەقەو گریان شاری گرتەوە.. من لەوکاتەدا خوێندکاری ناوەندی بووم ئەو نموونە بەزو بالاو پرنسیپە رەهایانەی مامۆستاکانمان بەسەرماندا دەیانباراند لە زیهنمدا چەسپیبوون. بۆیە هەر کە ئەو دیمەنەو خوێنڕشتنەکەم بینی حەپەسامو توشی سەرسوڕمانێکی زۆر بووم لە بوێری ئەو خوێنڕێژە کە بەو شێوەیە خەڵکانی بێتاوانی دەکوشت بەبێ ئەوەی گەورەو بچوك، هاولاتیەکی ئاسایی و خۆپیشاندەرێك لە یەکتری جیابکاتەوە.

مامۆستاو گوتار خوێنەکانمان وانەی ئەوەیان پێدەگوتینەوە کە ویژدان تاقە زەنگی حەقو دەنگی دادپەروەرییە لە مرۆڤدا، لەسەر ئەو پێودانگەش من وامدەزانی ئەو خوێنڕێژە لەئەنجامی جەرگسووتاندنی دایکاندا هەروەکو بەفر دەتوێتەوەو ویژدانیشی هەتا مردن ئازاری دەدات.. بەلام لەم دواییانەدا هەواڵی ئەوەم پێگەیشت کە خوێنڕێژەکە بووەتە پاڵەوانێکی ئەم ولاتەو پەنجەی شانازی بۆ درێژ دەکرێت. لەو کاتەدا تێگەیشتم هەرگیز پشت بە ویژدانی مرۆڤ نابەسترێت.

کاتێك لە پێکهاتەکانی نەستی مرۆڤ دەکۆڵینەوە وێنەی جیهان و گەردوون لە دیدەماندا سەرەولێژ دەبێتەوە دوای ئەوەی ئەو هەموو شتە شاراوانەمان لە مرۆڤ دا دۆزیوەتەوە، ئێستە تێدەگەین کە باب و

باپیرانمان (خوا لێیان ببورێت) لە تێگەیشتنی شتەكاندا چەند بە هەڵەدا چووبوون.

ئەو پشتئەستوورییەی باپیرانی ئێمە تەنها بە عەقڵی هوشیاریی مرۆڤ رووبەڕووی كۆمەڵێكی زۆر لە تەنگژەو كاری خراپی كردوونەتەوە. نەزانیو بێئاگایی لەنەستی مرۆڤو پێكهاتەكانی وایلێكردبوون لەوباوەڕەدابن كە مرۆڤ هەرچ كاتێك بەچاكی بیری كردەوەو هەوڵێكی زۆریدا دەتوانێت بگاتە سەركەوتنو حەقو دادپەروری. باپیرانی ئێمە بە سەرنەكەوتویەكیان دەگوت: ((هەر كەسێك هەوڵبدات بۆ كارێك وەدەستی دەهێنێت))..

بەتاوانبارێكیان دەگووت: ((بگەڕێوە بۆ عەقڵی خۆت)). بە زاڵمێكیان دەگوت: ((ئایا ویژدانت نییە؟)). لەو هەموو گوتانەیاندا تاڕادەیەكی زۆر بە هەڵەدا چووبوون.

جێگەی داخێكی زۆرە (هەتا ئێستاش) خوێندنگاو كۆلێژەكانمان لە پەروەردەكردنی خوێندكارەكانیاندا تەنها گرنگی بە (هەست) دەدەنو (نەست)ی مرۆڤ پشتگوێدەخەن. بە واتایەكی دیكە: عەقڵی دەرەوە پەروەردە دەكەنو، عەقڵی ناوەوەش پیشتگوێدەخەن چۆنی بوێت، گەشە دەكات. بەو شێوەیە لەپێكهاتەی كەسیەتی خوێندكارەكاندا دوو فاقییەكی مەترسیدار دروست دەكەن، عەقڵی ناوەوە لەزۆربەی هەڵسوكەوتو كارەكاندا مرۆڤ دەجولێنێو ڕەوشتەكانی ئاراستە دەكات. بەڵام عەقڵی دەرەوە تەنها روپۆشو پەردەیەكە، ئێمەش هەرچەندێك گرنگی بە عەقڵی دەرەوە بدەینو پرنسیپە ئەفلاتونیو زانیارییەرەهاكانی تێبخزێنین لە نێوان ئەو دوو عەقڵەدا بەربەستێك دروست دەكەینو

کەسیەتی مرۆڤیش دەکەین بە دوو کەرتەوە... لەو کاتەدا مرۆڤ شتێك دەڵێتو شتێکی دی ئەنجامدەدات، بانگەشەی شتێك دەکاتو کارێك یاخود گوتەیەکی دژی دەکاتو دەڵێت.

کاتێك دەنوسێو گوتار دەدات و ئامۆژگاری دەکات دەبینی چەندین وشەی بریقەدارو پەندی بەرزو باڵا دەڵێت، بەڵام کاتێك بەدوای پاروەنان یاخود کارێکدا دەڕوات، یان دەکەوێتە ململانێی ناسیاوو هاوڕێو هاوەڵەکانیەوە دەبینی هەروەکو خەڵکانی دی عەقڵی ناوەوەی روەو تەماعکاریو چاوچنۆکی، یاخود ئارەزویەکی نزم یان خۆشەویستی ناوبانگو پلەوپایەدا بە حەقو ناحەق هەوڵدەدات.

ئێمە لە خوێندنگەکانماندا روکاری دەرەوە دەدرەوشێنینەوەو بۆیەی دەکەین بەڵام ناوەڕۆکە شاراوەکەی قوڵایی کەسیەتی تاکەکان پشتگوێدەخەین.

مامۆستاکانیشمان نایانەوێت لە کۆشکەکانی کەشکەڵانی فەلەك بێنە خوارێ، ئەوان دەزانن لەپشت پەردەکانەوە چی روودەدات، بەلام بەردەوامن لەسەر گوتارو ئامۆژگارییە پڕو پووچەکانیان کە هیچ پەیوەندییەکیان بە واقیعەوە نییەو بەسەر خوێندکارەکانیدا دەبارێنن. خوێندکارەکانیشمان لەسەر دەستی ئەوان گەشە دەکەنو گەورە دەبن، لەلایەکەوە بانگەشەی پرنسیپە رەهاکان دەکەنو لەلایەکی دیکەوە لە ململانێو کێبەرکێکانیاندا بەجۆرێکی تر رەفتار دەکەن.

کاروباری ئەم گەلە چەند نامۆو سەرسوڕهێنەرە، تاکەکان دووفاقیزمیەکی کەسیەتییان هەیەو کۆمەڵگەش ویژدانی کەرتکراوە.

پرۆفیسۆر (لندس) مامۆستای کۆمەڵناسی لە کۆلیژی واشنتۆن، سەبارەت بە ویژدان دەڵێت: (( مرۆڤ دەتوانێت لە سەگیشدا جۆرێك لە ویژدان فێر ببێت، ئەگەر سەگێك تێبینی ئەوەی کرد کارێك لە ڕێگەیەکی تایبەتی‌یەوە ئەنجام بدات، لە ڕێگەی سزادان و سەرزەنشتکردنەوە تێدەگات کە ئەنجامدانی کارێکی پێچەوانە هەڵەیەکی گەورەیە، بۆیە دەبینین کاتێك شتێکی نەگونجاو دەکات کە پێچەوانەی ئامۆژگاریەکانی خاوەنەکەی بێت، لەسەر ئەژنۆکانی رادەوەستێ و کلکی دەخاتە نێو گەڵی، یاخود لە زەویدا بە شێوەیەك کە داوای لێبوردن بکات رادەکشێ.. ئەوەش جۆرێکە لە ویژدان و هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ویژدانی مرۆڤدا نیە، مرۆڤ بەهۆی زاکیرەیەکی فراوان و توانای وەرگرتنی سۆز و هەستە کۆمەلایەتی‌یەکانەوە، هەروەها بەهۆی توانای ئیحاو بیرکردنەوە دەتوانێت ویژدانێکی بەهێزتر لە ویژدانی سەگەکە لە خودی خۆیدا دروست بکات)).

(( ... ئەو شتەی پێی دەڵێن ئازاری ویژدان، تەنها هەستکردنێکە بە پەشیمانی، کاتێك مرۆڤ هەست دەکات خیانەتی لە تاکێك یاخود لە کۆمەڵێك کردووە، ئەو تاکە، یاخود کۆمەڵەش سەرزەنشتیان کردووە... بەو پێودانگە ویژدان دەبێتە شێوازێکی کارامە و چالاك لە شێوازەکانی کۆنترۆڵی کۆمەلایەتی.. خودی خۆشی لە بنەماکەیدا بە شێوەیەکی کۆمەلایەتی دروست دەبێت، چونکە لە کارکردنیدا پەیوەستە بە دامەزراوەو بەها کۆمەلایەتیەکانەوە. رادەی کاریگەرێتیەکەشی لە لایەنی کۆمەلایەتیەوە سنووردارەو پەیوەندە بەو بەهایانەی کە تاکی تێدا گەشە دەکات)).

کەواتــە ئــەو ویژدانــەی لــە تــاکێکدا دروســت دەبێــت لــە بــوارو ڕێڕەوەکانیدا هەموو کۆمەڵانی خەڵك ناگرێتەوە. بە دەگمەنیش نــەبێت سنووره دیاریکراوەکەی خۆی نابــەزێنێت.. بــۆ نموونــە پیــاوێکی ڕێگــر بەرامبەر پیاوەکانی خۆی و کۆمەڵــە چەتەکــەی ویژدانێکــی زۆر بــەهێزی هەیە، هەمیشە سۆزیان پێدەبەخشێ و لە پێناویاندا خۆی بەخت دەکات، کاتێکیش خیانەت لە (بەها)یەکیان بکات خۆی بە شەرمەزاریان دەزانێت و لە ناخەوە نیگەران دەبێت، بەڵام کاتێك لە ڕێگەیەکدا ڕووبەڕووی قافڵەیەك دەبێتــەوە هەســت بــە هیــچ جــۆره ســۆز و بەزەییــەك ناکــات و دەبێتــە خوێنڕێژێکی دڵرەق، بە بچووکترین هۆ دەکوژێ و سەردەبڕێ، کە لەگەڵ پیاوەکانیدا دەگەڕێتەوە شوێنی حەسانەوە و نیشتەجێبوونی پێدەکەنێ و ڕووخۆش و بەختەوەره هەروەکو ئەو کارەی ئەنجامی داوە خزمەت بە نیشتمانەکەی دەکات و سوودی نەتەوەکەی تێدایە.

گــەورەترین نەهامــەتی و تــەنگژە ڕووبــەڕووی گــەل، نەتەوەیــەك دەبێتەوە ئەوەیە کە خاوەنی دوو ویژدان بێت، ویژدانێك تایبەت بێت بە سەرکردەکانی و ویژدانێکیش تایبەت بێت بە هاووڵاتیان و نەتەوەکە ... ئــەو کەرتبوونــە لــە ویژدانــدا پاڵنــەرێکی چاکــە بــۆ ئــەوەی دەســەڵاتدارو فەرمانڕەواکان بچەوسێننەوە و خودی خۆشیان لەو باوەڕەدان پیاوێکی دادپەروەرن.

مــەخابن وڵاتــی عــێراقیش لــەو لایەنــەوە گــیرۆدەی ئــەو بــەڵا کۆمەڵایەتییە ترسناکە بووە.

دەڵێــن حکومــەتی بــەریتانیا ســندوقێکی دانــاوەو نــاوی نــاوە ((سندوقی ویژدان))، بۆ ئەوەی ئەو هاوڵاتیانەی باجیان نەداوە، یاخود

پاشماوەی باجەکانیان لە یادکردووە بیخەنە ئەو سندوقەوە.. بۆیە ناویان ناوە ((سندوقی ویـژدان)) چونکە ئـەو تاکانـەی کۆمـەڵ کـە بـاجێکی کـەمتریان داوە هەسـت بـە ئـازاری ویژدانیـان دەکـەن بەرامبـەر یاسـای وڵاتەکەیان ئەگەر ئێمە لە بەغداد سندوقێکی لەو جۆرە دابنێین، پاش چەند رۆژێك تالان دەکرێت، ئەوەش بەو واتایە نییە کە ئەو قوڕەی خەڵکی ئەم وڵاتەی لێدروستکراوە جیاوازە لەو قوڕەی گەلی بەریتانیای لێدروستکراوە. مرۆڤ لە بنەمای سروشتی دروستبوونیدا و لەهەموو وڵاتێکدا چوونیەکن لەو کارەدا هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان عێراق و بەریتانیادا لەنێوان عەرەبی و عەجەمیدا.. جیاوازییەکە تەنها لە بەرکەوتنی بەها کۆمەڵایەتیەکان و کەرتبوونی ویژدانیاندایە.

هەندێك لە کارمەندانی بەریتانیاو لەکاتی ئەم جەنگەی دواییدا هاتنە عێراق بۆ جێبەجێکردنی ئیشوکارەکانی خۆراك. یەکێکیان گوتبووی: ((عێراقیەکان هەموویان دزن)).. ئەو کارمەندە بەریتانییە لە بڕیارەکەیدا زۆر هەڵە بووە، چونکە ئەو لە کۆمەڵگەیەکەوە هاتووە تەنها یەك ویژدان شك دەبات و دەسەڵاتدارو بێدەسەڵاتی گرتۆتەوە.. نەیزانیوە کۆمەڵگەی عێراقی دوو ویژدانیان هەیە.

بازرگانانی بەغدا لەرووی ملکەچبوونیان بۆ بڕیارەکانی حکومەت و رێزگرتنیان لە یاساکان وەکو بازرگانانی لەندەن هەڵسوکەوت ناکەن.. بازرگانانی خۆمان رقیان لە هەموو ئەو کەسانەیە کە حکومەت لەسەرپێچی و لەیاسا لادانەکانیان ئاگادار دەکەنەوەو بە پیاوێکی نزم و دووزمان لەقەڵەمی دەدەن. بەڵام لە لەندەن بازرگانەکان لەوباوەڕەدان ئەو

کەسەی لەسەرەڕۆیی و تاوانەکانیان حکومەت ئاگادار دەکاتەوە کارێکی چاك و شەرەفمەندانەی کردووە.

گەلی بەریتانیا دامەزراوەکانی حکومەت بە موڵکی خۆی دەزانێت کە لەپێناو بەرژەوەندییەکانی ئەودا دامەزراوە. هەروکو بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی و خێزانەکەی چاودێری یاساکانی وڵاتەکەی دەکات[1].

بەڵام لەعێراقدا پیاوی بکوژو خوێنڕێژ لەنێو کۆمەڵانی خەڵك دا خۆی دەشارێتەوەو ئەوانیش شانازی بەشاردنەوەو داڵدەدانی تاوانبارانەوە دەکەن.. دزێك هەڵدێت و ئەوەی پۆلیسی لێ ئاگاداربکاتەوە بە دووزمان و سیخوڕ لەقەڵەم دەدرێت.. ئەوەش تەنها خاڵی جیاوازییە کە عێراق لە زۆربەی کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.

---

(1) بەسەرهاتێك دەگێڕنەوە، ئەگەر دروستکراویش بێت راستی ئەو گوتەیەی سەرەوە دەسەلمێنێت. کە گوایە کوڕێکی کورد لەوڵاتی سوید دراوسێی ژنێکی بەتەمەنی تەنها دەبێت. شەوێك لە شەوان ژنەکە نەخۆش دەکەوێت، کوڕە کوردەی خۆشمان بە پەلە دەیخاتە ئۆتۆمبێلەکەی خۆیەوەو دەیبات بۆ نەخۆشخانە، لەڕێگە بۆ ئەوەی ژنەکە بە پەلە بگەیەنێت سەرپێچیەکی یاسای هاتووچۆ دەکات، کە ژنەکە دەگەیەنێتە نەخۆشخانەو دەگەڕێتەوە، لەڕێگە ئۆتۆمبێلێکی هاتووچۆ رایدەگرێ و لەسەر سەرپێچییەکەی غەرامەی دەکات، سبەینێ دەچێتەوە لای ژنە بەتەمەنەکە بۆ هەواڵ پرسینی. ژنەکە پێی دەڵێت: شەو کە گەڕایتەوە هیچ شتێك رووی نەدا، ئەویش دەڵێت: بەڵی لەسەر سەرپێچییەکەم غەرامەیان کردم، ژنەکە دەڵێت ئەوە من لە نەخۆشخانەوە تەلەفۆنم بۆ کردن، کوردەی قارەمانی لەمەڕ خۆشمان لەو هەڵوێستەی ژنەکە دەتاسێ و پێی دەڵێت: من لەبەرخاتری تۆ و نەبادا بمریت ئەوەم کرد تۆ لەجیاتی چاکەکەم بۆ ئەو خراپەیەت لەگەڵ کردم. ئەویش دەڵێت: ئەگەر من بشمردمایە نەدەبوو تۆ یاساکانی هاتووچۆ پێشێل بکەیت. (و).

بەهــەرحاڵ ئــەو کــارە چــەندین هۆکــاری مێژوویـــی هەیــە، و دەرکەوتەیـەکی نوێنییـەو لەشــەوو رۆژێکـدا رویدابێـت. ئـەو شـتەش جێگەی نیگەرانیە، خوێنرێژەکـانی ئێمـە هیـچ کارێکیـان نـەکردووە بـۆ کەمکردنـەوەی ئەو حاڵەتــەو بـە پێچەوانـەوە یـاریدەدەرێکی بـەهێزیش بووە بۆ گەشەکردنی.

بەڵگەنەویستە هەڵبژاردنی راستەوخۆ گرنگترین ئەو هۆکارانەیە کە یارمەتی کەمکردنەوەی دەلاقەکانی نێوان کۆمەڵانی خـەڵك و حکومەتـە. لەراستیدا هیچ گەلێك ویژدانیـان یـەکگرتوو نـەبووە هـەتا کۆمـەڵانی خـەڵك هەستیان بــەوە نـەکردبێت کـە حکومەتەکـەیان بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ لەلایەن خۆیانەوە هەڵنەبژێردرابێت ئەو گەلەی کە دەبینێ نوێنەرەکانی لە حکومـەتدا بـەناوی ئـەوەوە دەدوێـن و دەیانـەوێت پارێزگـاری لێبکــەن و بەرژەوەندیـەکانیان بپارێزێت، ئـەو کاتـە هەستدەکەن ئـەندامێکی کـارای یەکگرتوون لە دەوڵەتدا.

برادەرێکم چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە: ئەگەر لەم وڵاتەدا نـەبێت کـەس باوەڕی پێناکات، گوتی: لەیەکێك لە هەڵبژاردنەکاندا بروسکەیەك کرا بۆ موتەســەریفی لیوایــەك، بروســکەکە فــەرمانی کردبــوو دەنــگ بدرێــت بەکەسێکی دیاریکراو، خــۆم و کۆمــەڵێك لـە هاوڕێکـانم چوینـە لای ئـەو کەسـە خواپێداوە بـۆ پیرۆزبـایی لێکردنـی، ئـەویش بـە بەختەوەرییـەوە پیرۆزباییەکەی لێوەرگرتین، بەڵام هێشتا رۆژی دیاریکراوی هەڵبژاردنەکە نـەهاتبوو، بەواتایـەکی دی ئێمـە بـەر لـە هـەڵبژاردن چویـن بـۆ پیرۆزبـایی کردن.

ئەو نوێنەرەی بەو شێوەیە هەڵبژێردرێت بەهیچ شێوەیەك هەست ناکات نوێنەری کۆمەلانی خەڵکە، هەروەها کۆمەلانی خەڵکیش هەست بەوە ناکەن لە حکومەتدا یەکێك هەیە بەناوی ئەوانەوە دەدوێت و پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانیان دەکات، بەو شێوەیە دەلاقەیەکی گەورە دەکەوێتە نێوان کۆمەلانی خەڵك و حکومەتەوەو ویژدانیش دووکەرت دەبێت.

دووفاقیزمی کەسیەتی و کەرتبوونی ویژدان دوانەیەکی تەواوکەری یەکدین، لەبەرهەمهێنانی عەقڵیەتی خوێنمژەکانی عێراقدا. تووشی سەرسوڕمان دەبین کاتێك دەبینین نەوەیەکی خوێندەواری عێراق هەر کە گەیشتە کورسی دەسەلات لە ئارەزوو ئاراستەو ڕێڕەوەکانی ویژدان و بیرکردنەوەکانیدا دەبێتە چەوسێنەرو خوێنمژێکی بێوێنە.

شێوازی خوێندن و پەروەردەکردنی کۆلێژەکانیشمان هۆکارێکی بەهێزن و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو دەرکەوتە کۆمەلایەتییە لە عێراقدا بەرهەمدەهێنن..

ئێمە زانیارییە ئەندێشەییەکان بەسەر خوێندکارەکانماندا پەخش دەکەین کە هیچ پەیوەندییەکیان بەواقیعی ژیان و گیروگرفتەکانیەوە نییە، ئێمە قوتابی و خوێندکارەکانمان هاندەدەین و فێریان دەکەین سووربن لە پاراستنی حەق و دادپەروەری و چاکەدا، بەلام ڕێڕەوی ڕەهای ئەو پرنسیپە ڕەهایانەیان لە ژیانی پراکتیکیدا بۆ شیناکەنەوە.. کەواتە ئەو خوێندکارەی خوێندن بەشێوەیەکی توندڕەوانە تەواو دەکات، مەحالە لەگەڵ هەموو بیرێك و پێچەوانەکەیدا مامەڵە بکات. هەر کەدەسەلاتی گرتە دەست ئەو توندڕەوییەو شێلگیرییەی لە خزمەتکردنی کەسوکارو

ناسیاوو خزمو خۆشەویستەکانو ماستاوچیو ریاکەرانی خۆیدا بەکار دەهێنێت.

دەبینی لە کۆڕو دانیشتنەکانیدا بانگەشەی ئەوە دەکات لە خزمەتکردنی گەلو نەتەوەکەیدا وەکو پەروانە سووتاوە، بەڵام لەراستیدا مەبەست لەو سوتانە خزمەتکردنی پیاوەکانی خۆیەتی.

پیاوێکی نیشتمانپەروەر دەناسم لەهەموو کەسێك پتر خۆی بە دڵسۆزو نیشتمانپەروەر دەزانێت بەرامبەر کۆمەڵانی خەڵك، بەڵام هەر کە بووبە لێپرسراوو لەسەر کوسی دەسەڵات دانیشت لەشەوو رۆژێکدا بوو بە زاڵمێکی دڵڕەق بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی خۆشی نەدەویستن.. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەو پیاوە (دڵسۆزە) ویژدانی لەدەستداوە، هەتا ئێستەش لەناخی خۆیدا ئەو ویژدانە روەو کاری چاکە پاڵی پێوە دەنێتو هانی دەدات، بەڵام چاکە بەرامبەر هاوڕێو ماستاوچیو ناسیاوەکانی خۆی.

لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا کەسێك نییە خاوەنی ویژدان نەبێت، چونکە ویژدان هەروەکو کەسیەتی لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام لە رێڕەوو ئاراستەکانیدا جیاوازییان هەیە. ئەو کەسەی پێی دەڵێن ((بێویژدان)) لەواقیعدا ویژدانێکی هەیە، هەندێك جار ئەو ویژدانە زۆر بە هێزیشە، بەڵام ویژدانێکی بەلادا شکاوە، ئەو بەلادا شکاندنەوەیەش سنووری ئەو کۆمەڵگەیە تێناپەڕێنێت کە ئەو تاکە گۆرانی بە هاوپێوەرەکانیدا هەڵدەڵێت.. ئەمەش حەقیقەتی ئەو ویژدانە کەرتبووەیە کە خوێنمژەکانی ئەم سەردەمە گیرۆدەی بوون.. یەکێکیان دەبینی نییەتێکی زۆر چاكو پاكو بێگەردی هەیە بەرامبەر کەسوکارو

ناسیاوەكانی خۆیو ئەوانیش دەبنە پیاوی ئەڵقە لەگوێی ئەو. پارەو موڵكو سامانی دەوڵەتو (حیزبیش) دەخاتە خزمەتی بەرژەوەندییەكانیانەوە، بەڵام ئەگەر هاوڵاتیەكی نەناسراو بێواسیتەو (بێ پشتوپەنا) بچێتە لای، دەبینی نێوچەوانی گرژ دەكاتو دەنەڕێنێ و دونیا لەبەرچاوی تاریك و تەنگ دەبێو (بچوكترین هاوكاریو یارمەتی نادات).. هەندێك لە مامۆستاكانمان چەوسێنەرێكی دڵڕەقن و لە پێستی مامۆستادان بەبێ ئەوەی هەست بكەن یارمەتی كەرتبوونی ویژدانی قوتابیو خوێندكارەكانیان دەدەن، هەمیشە گۆرانی بەباڵای چاكەو حەقدا دەڵێن ئەگەر پرسیاریشیان لێبكەی حەقیقەت چیە؟ بەبێ سێو دوو بەزندیق و خۆفرۆشو نانیشتمانپەروەر تاوانبارت دەكات.

ئێمە دەمانەوێت خوێندكارەكانمان بەو شێوەیە تێبگەیەنین كە(ماف) بۆ زۆربەی كۆمەڵانی خەڵكو رەشو روتەكانی وڵاتەو حەقیقەتیش بەرزكردنەوەی رادەی گوزەرانو ژیانیانە.. دەمانەوێت ئەوە بزانن كە (ماف) تەنها كۆمەڵێك لەخەڵك ناگرێتەوە، حەقیقەتیش لە بۆشاییدا ناژێت، بەڵكو دروستكراوی كۆمەڵگەیەو رەنگدانەوەی ئامانجو هیواكانی ئەو كۆمەڵگەیەیە، بەڵام مامۆستاكانی ئێمە ئەو گوتەو بۆچوونەی ئێمە بە سەفسەتە ناو دەبەن.

ئێمە نەوەیەكی سادەو ساكارمان دەوێت، باوەشی بۆ هەژارانو نەدارانو پیسو پۆخڵانی وڵاتەكەی بكاتەوەو خۆی لەوان بەرزتر نەزانێت.. ئەو هەژارو نەدارانە لەواقیعدا بەئیرادەی خۆیان، یاخود بە ئەنقەست نەگەیشتوونەتە ژیانێكی پڕ لە چەرمەسەریو هەژاریو پڕ لە خورافات... ئێمە پێویستیمان بە جۆرێكی دی لە خوێندەوارەكان هەیە،

ئـەو راسـتیە بزانـن کـە ئـەو سـەرکەوتنەی لـەبواری زانسـت و ئـەدەبو ....هتد وە دەستیان هێناوە. ئەنجامی هەوڵو تێکۆشانی خۆیان نەبووە، بـەڵکو ئـەو هۆکـارە کۆمەڵایـەتیو دەرونیانـەی دەوری داون دروسـتی کردوون.

{ ئەوانەی رقو کینە بەرامبەر هەژارەکان هەڵدەگرنو بە سەروەتو سامانەکەیانەوە شانازی دەکەن، خودای گەورە گیرۆدەی چوار شـتیان دەکـات: بێوەفـایی زەمانـە، جەوروسـتەمی سـوڵتانەکان، شـەڕەنگێزی دەسەڵاتدارەکانو دڕكو چقڵی دوژمنەکان}.

ئەو حەدیسەی پێغەمبەر تا رادەیەکی زۆر بەسەر ئێمەدا جێبەجێ دەبێـت، زۆربـەمان بـەگوێرەی ئەوانـەی لـەخۆمان بـەرزترن کـەمترین و بەرامبـەر ئەوانـەی لـە خۆمـان نزمـتر و کـەمترن لوتبـەرزین و لەپـەنای زاڵمـەکاندا خۆمـان مـەلاس دەدەیـنو دەنـگ بەسـەر هـەژارەکاندا هـەڵدەبڕین... بـەگوێرەی کـەرتبوونی ویژدانمـان کەسیەتیشـمان کەرتبووە.. عومەری کوڕی حوسەین دەڵێت: ((زوڵم مەکە بەتایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەی تەنها خودا شك دەبەن)).

مێژوو ئاماژە بەوە دەکات ئەو زاڵمانەی هەژارەکان دەچەوسێننەوە ئەگـەر دوای ماوەیـەکی دورو درێژیـش بێـت یـەکێك دێو زوڵمیـان لێدەکاتـەوە[1]..ئـەو زوڵملێکـراوەش چـەکێکی مـاددی شـك نابـات بـۆ تۆڵەسەندنەوە لەزاڵمەکەی، چەکێکی دیکەی هەیە کە زۆر بەهێزترە لـە چەکە ماددییەکان، ئەویش چەکی دەرونێکی گڕگرتوو هاوارو ناڵەیەکی هێندە بەهێزە پریشکەکەی دەگاتە ئاسمان...

---

[1] کورد دەڵێت: هەموو زاڵمێك زەواڵێکی هەیە، یاخود تووشی گونڕەشی خۆی دەبێت.

ئەو خوێندەوارەی رقی لەو کەسەیە لە پلەیەکی زانستی کەمتر لەخۆیەتی، ئەو دەوڵەمەندەی رق و کینە بەرامبەر هەژاران هەڵدەگرێت، ئەو خوێنڕێژەی رقئەستورە بەرامبەر کلۆڵو نەدارانی ولاتەکەی .. بەو کارەیان پەردە لەڕووی ریسوایی دەروونی خۆیان هەڵدەدەنەوە، هەروەها ئەو هەستکردنەی کە لەقولایی عەقڵی ناوەوەیاندا خۆیان بەکەم دەزانن. ئەو هەستەش درەنگ یا زوو بەسەریاندا زاڵدەبێتو لەناویان دەبات.

چینە بالاکانی کۆمەڵ کاتێك رقیان لە چینەکانی خوارەوە دەبێتەوە بیانوو بۆ ئەو رقو کینەیان دێننەوە کە گوایا ئەو چینە نزمانەی کۆمەڵ خاوەنی دابو نەریتێکی نەشیاوو رەوشتێکی خراپ، یاخود ئاژاوەچینو بۆ ئەوە بەکەڵك نایەن لەسەر کورسی دەسەلات و فەرمانڕەوایی دابنیشن.

رۆژێك گوێم لە یەکێکیان بوو لە ئاهەنگێکی میللیدا ئاماژەی بۆ چەند هەژارێك دەکردو بەهاوڕێکەی دەگوت: ((بڕوانە ئەوانە، خودا لە شەڕیان بتپارێزێت، ئەگەر دەستیان بڕوات خوێنڕێژێکی ئەوتۆن بەزەییان بەکەسدا نایەتەوە)).

لەراستیدا ئەندامانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ بەهۆی بارودۆخی توندوتیژی ژیانیانەوە نەیانتوانیوە وەکو چینە بەرزو بالاکانی کۆمەڵ ببنە خاوەنی دەرکەوتەکانی ئەدەبو فەنتازییەکانی رەوشتی بالا، ئەوەش نەنگی نییە بۆ ئەو هەژارانەبەڵکو نەنگیو ریسواییە بۆ ئەو کەسانەی فەرمانڕەوایەتیان دەکەنو سەروەتو سامانەکەیان بەتالان دەبەن.

پەندێکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: ((ئەگەر رۆژگارەکانی مرۆڤ تێکچوو رەوشتیشی تێکدەچێت)).

زاناکانی کۆمەڵناسیش تا رادەیەکی زۆر جەخت لەسەر راستی ئەو پەندە دەکەنەوە، زۆربەی جارەکان یەکێك دەبینین میزاجێکی توندو تیژی هەیەو حەز بە ئازاردانی خەڵك دەکات، بەڵام کە بارودۆخی ژیانی چاك بوو دەبێتە کەسێکی روخۆش‌و حەز بە هاوکاری و یارمەتیدانی خەڵك دەکات‌و دڵنەوایی کردن‌و دەربڕینی سۆزو بەزەیی لە ژیان‌و هەڵسوکەوتەکانیدا رەنگدەداتەوە.

پێشینەکان لەو باوەڕەدابوون رەوشتی خراپ‌و هەڵسوکەوتی ناشایستە لەئەنجامی نەزانی‌و بێمێشکی مرۆڤدایە، ئەو گۆتە بەناوبانگەی سوکراتیان دەگوتەوە: ((زانین چاکەیەو نەزانین خراپە))، هەندێك لە بیریارەکانی ئەم سەردەمەش لەسەر هەمان ژێی ئەو ئاوازە کۆنە دەڵێن: ((هەر کەسێك قوتابخانەیەك بکاتەوە زیندانێك دادەخات)).

زیادڕەوی ناکەین ئەگەربڵێین: قوتابخانە تەنها رووکەشێکی دەرەوەی مرۆڤ رێکدەخات، بەڵام زۆر بەکەمی کاریگەری هەیە لەسەر دەروون‌و قووڵایی عەقڵی ناوەوەی مرۆڤ.

بەشێوەیەکی گشتی رەوشتی مرۆڤ لەسەر بنەمای نەست‌و لەبەها کۆمەڵایەتی‌و گرێ دەرونیەکان دروست دەبێت. کەواتە فێرکردن تەنها لەرێگەی ((ببە، و مەبە)). بەس نییە بۆ چاککردن‌و راستکردنەوەی مرۆڤ. هەندێك کەس دەبینین خوو رەوشت‌و دابونەرێتێکی زەرەرمەندو بڕوایەکی هیچ‌و پووچیان هەیەو ئێمەش لۆمەیان دەکەین‌و رق‌و کینەیان بەرامبەر هەڵدەگرین.. نازانین هەریەکە لە ئێمەش ئەگەر لەو بارودۆخەی ئەواندا بژین رووبەڕووی هەمان ئەو ژیانە دەبینەوەو وەکو ئەوانمان

لێدێت. رەنگە بەو رقلێبوونەوەی ئێمەو سەرکوتکردن و چەوساندنەوەیان بەبێ ئەوەی هەستبکەین تۆوی شەڕو خراپەکاری زیاتریان لە دەرووندا بچێنین.

چەوسێنەران و دیکتاتۆرەکان لەهەموو سەردەمێکدا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێویستە کۆمەلانی خەڵك لەشەڕی خۆیان بپارێزین. (جون ستیوارت مل) نوسەری بەناوبانگی ئینگیز لەسەر ئەو گوتەو هەڵسوکوتی دیکتاتۆرەکان دەڵێت: ((... هیچ نەتەوەیەك پێویستی بەوە نییە لەشەڕی خۆی بپارێزرێ، هیچ مەترسیەکیش نییە ئەگەر خودی خۆیان زوڵم لە خۆیان بکەن.. با دەسەلاتدارو فەرمانڕەواکانیان هەست بە لێپرسراوێتی بکەن بەرامبەریان، ئەو کاتە بەدڵنیاییەوە دەسەلات دەگرنە دەست و پێویستیان بە چەوساندنەوەی کۆمەلانی خەڵك نییە)). خۆزگە چەوسێنەران و دیکتاتۆرو خوێنڕێژەکان خودی خۆیان بەکەڵك دەبوون بۆ فەرمانڕەوایی و پاشان کۆمەلانی خەڵکیان لەشەڕی خۆیان دەپاراست.. ئەوان دەیانچەوسێننەوەو بانگەشەی ئەوەش دەکەن خەڵك لەشەڕی خۆیان دەپارێزن. لەو کاتەدا وەکو ئەو پیاوەیان لێدێت بەشێوەیەکی خراپ منداڵەکەی پەروەردە دەکات و پاشان لەسەر بەدڕەوشتی سزای دەدات.

یەکێك دەڵێت: ((گەلێك روناکبیر بکەو پاشان مافی هەڵبژاردنی راستەوخۆی بدەرێ)).

ئامادەکردنی کۆمەلانی خەڵك بۆ هەڵبژاردنی راستەوخۆ تەنها لەرێگەی جێبەجێ کردنی هەڵبژاردنی راستەوخۆوە دەبێت و پێویستە جار لەدوای جار لەسەر ئەو هەڵبژاردنە رابهێنرێت هەموو گەل و

نەتەوەیەك لەسەرەتادا هەڵبژاردنی راستەوخۆیان نەزانیوە، بەڵام لەدوای نەوەو جار لەدوای جار لەسەری راهاتوون.

دەگێڕنەوە پیاوێك دەیویست کوڕەکەی لەسەر دۆشەك و لەماڵەوە فێری مەلەوانی بکات پاش ماوەیەك راهێنان بردییە سەر روبارێك و گووتی ئەوا فێربووی دەفەرموو مەلەوانی بکە.. کوڕەکە هەر کەچووە ئاوەکەوە ئاو چووە گەرویەوەو لە خنکاندا بوو، باوکەکە بە توڕەییەوە پێی گوت: ئەی من لەسەر دۆشەك فێری مەلوانیم نەکردی؟ کوڕەکەش لەدوا هەناسەدانیدا وەڵامی دایەوە: باوکە گیان هیچ کەسێك لەسەر دۆشەك فێری مەلەوانی نابێت.

ئێمە ناتوانین مرۆڤێك فێربکەین رەوشتێکی دیاریکراوی هەبێت و مێشکی پڕ بکەین لە ئامۆژگاری و زانیاریە ئەندێشاوییەکان. چاکسازی کردن لە مرۆڤدا لە هەموو روویەکەوە بە لەبەرکردن و تەڵقیندان ناکرێت، هەروەکو لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا لە قوتابخانەو خوێندنگاکانماندا پیادەی دەکەین، چونکە چاکسازی هەروەکو زاناکانی کۆمەڵناسی دەڵێن: رێڕەوێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی پێویستە، کەواتە تەنها بە دەستەبەرکردنی هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان گەشە دەکات.

لە گۆتە بەناوبانگەکانی ئەرستۆ: ((مرۆڤ لە سروشتیدا شارستانیە)) مەبەستی ئەوەبووە مرۆڤ لە پێکهاتە سروشتیەکەیدا کۆمەڵایەتیە، لەراستیدا مرۆڤ لەیەك کاتدا مەدەنی و دڕندەشە، کۆمەڵایەتی و خۆپەرستیشە.. کەواتە نابێت هەموو کاتێك پشت بە سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ ببەستین و هەمیشە داوای لێبکەین لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و کۆمەڵ و نەتەوەکەیدا قوربانی بدات.

مرۆڤ خاوەنی ئارەزوو شەهوەتەو دەیەوێت بە هەرچی شێوەیەك بێت تێریان بكات. ئەوەندە خودی خۆیو ئارەزوو ئاراستەكانی خۆشدەوێت، حەق و حەقیقەتی خۆشناوێت هەر كاتێكیش هەست بكات ئەو ئارەزووانەی سەركوتكراون لەیاساكان دەردەچێت.

ئارەزووەكانی مرۆڤ جۆراو جۆرنو زاناكان لە ژماردنو دیاریكردنیاندا جیاوازیان هەیە لەنێوانیاندا. ئێمەش دەتوانین بڵێین گرنگترین ئەو ئارەزووانە سێ شتن:

١- ئارەزووی ژیان.
٢- ئارەزووی سێكس.
٣- ئارەزووە ئیعتیبارییەكان.

بەر لە هەموو شتێك مرۆڤێك ئەگەر تێكڕای مرۆڤایەتی بمرن و لەناوبچن حەز دەكات تەنها خودی خۆی بمێنێتو بەخۆی دەڵێت: ((ئەگەر ئاو نەبێ من بیخۆمەوە، خوادەكات هەموو كەسێك لە تینواندا دەمرد)). بەڵام هەندێك جار بە پێچەوانەوە خۆی دەردەخات و زۆربەی جارەكان لە خۆبایی بووەكانمان دیوە بەچ شێوەیەك بانگەشەی قوربانیدانو (نەتەوە پەرستیو حەق پەرستیو ....هتد) دەكەن لەپێناو بەرژەوەندی گشتیدا.

ئەوەش درۆیەكی گەورەی شاخدارو هەڵبەستراوە، ئەگەر ئەو لەخۆبایی بوانە هەژاركەوتن و منداڵەكانیان نان نەبوو بیخۆن، دەستدەكەن بە گریان و قوڕپێوانو تاوانكردن.

ئەفسانەكان دەگێڕنەوە: لەكاتی لافاوەكەی نوحی پێغەمبەردا ژنێك منداڵێكی ساوای لە باوەش گرتبوو، سەرەتا ویستی ساواكەی لە خنكان

رزگار بکاتو بەرزی کردەوەو خستیە سەر سەری خۆی هەتا ئەو کاتەی ئاوی لافاوەکە گەیشتە لووتی، کە زانی دەخنکێ منداڵەکەی داگرتو خستیە ژێر پێی بۆ ئەوەی کەمێك بەرزبێتەوەو خۆی نەخنکێ.. ئائەوە سروشتی مرۆڤ بووە لە هەموو سەدەو سەردەمێکدا[1].

مرۆڤ کاتێك تێری خواردو ژیانو گوزەرانی دەستەبەرکرد ئارەزووی رەگەزی مێینە دەکات بۆ لەزەت وەرگرتن. لەو بوارەشدا بانگەشەی ئەوە دەکات ئامادەیە لە پێناو خۆشەویستەکەیدا قوربانی بدات، بەڵام هەر کە گەیشتە مەبەستەکەیو چێژی سێکسی لەخۆشەویستەکەی وەرگرت، نەك هەر خۆی بە قوربانی ناکات بەڵکو لێی بێزار دەبێو رەنگە دەستبەرداریشی بێت.

لاوەکان گۆرانی: ((ژیان خۆشەویستیەو خۆشەویستیش ژیانە)) دەڵێنەوە.. لە وساتەوەختانەدا لەو برسیە دەچن گۆرانی بە پارچە نانێکدا دەڵێتو شیعری پیا دەڵێت. هەر کە نانی خواردو تێربوو ئەوەی لەیاد دەچێت ماوەیەك بەر لەئێستا تەنانەت برسیشی بووە.

کاتێك مرۆڤ لەنانو چێژی سێکسی تێری خوارد بەدوای ناوبانگدا دەگەڕێت، هەر ئەوەشە پێی دەڵێن ئارەزووی خۆدەرخستن.

---

[1] زاناکانی دەروونناسیش بۆ زانینی سروشتی خود پەرستی مرۆڤ مەیمونێکیان لەگەڵ بێچوەکەیدا خستە ژورێکەوە، پلێتێکی ئاسنیان پڕاوپڕی ژوورەکە راخستبوو، لەژێرەوە ئاگریان بەردایەو پەیتا پەیتا پلێتەکە گەرم دەبوو مەیمونی دایك بێچووەکەی لە باوەش کردو لەگەرمیدا پەیتا پەیتا هەڵبەزو دابەزی دەکرد، بەڵام کە زۆر گەرم بوو سورهەڵگەڕا لە پڕێکدا بێچوەکەی خستە سەر پلێتەکەو خۆی چووە سەرپشتی. (و).

مرۆڤ دەیەوێت لە نێو خزم و کەسوکارو نەتەوەکەیدا دەرکەوتوو بێت و ئاماژەی پێبکەن. زۆربەی ئەوانەی بانگەشەی حەق و حەقیقەت دەکەن لەراستیدا تەنها داوای ناوبانگ بۆ خۆیان دەکەن و حەقیقەتیش بەلای ئەوانەوە تەنها شێوازێکە بۆ ئەو ئەنجامەی کە خۆیان خۆشیان دەوێت و ئارەزووی دەکەن.

ئەو سێ ئارەزووە لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەلام بەپلەی جیاوازو وێنەی جۆراوجۆر .. لە عەقڵی ناوەوەشدا خۆیان مەلاس داوەو پاڵنەرێکی بەهێزیشن بۆ ڕێڕەوو ئاراستەکانی مرۆڤ و خودی خۆشی واهەستدەکات رووەو حەق و حەقیقەت هەنگاو دەنێت.

ئەو مرۆڤەش نەتوانێت ئەو سێ ئارەزوە، یاخود یەکێکیان تێر بکات دەبێتە مرۆڤێکی ئاڵۆزی سەرکوتکراو.

دەبینی بەهەموو ڕێگەو شێوازێك دەیەوێت هەناسەیەك بەو ئارەزووانەی بدات و زۆربەی جارەکان دەبێتە تاکێکی ئاژاوەچی، یاخود تاوانبارو دەستدرێژی دەکاتە سەر خەڵکانی دی. یاخود درۆزنێکی لێهاتووی لێدەردەچێت. ئەو کاتێك خۆی دەبینێ بێبەش و زوڵملێکراوو پێوەندکراوەو خەڵکانی دیش دەستکراوەو حەساوەو بەختەوەرن، لەقوڵایی دەرونیدا پاڵنەرێکی ناهەستی روەو ئازاردان و ئاژاوەو دزی و درۆکردن ئاراستەی دەکات.

موحەمەدی پێغەمبەر دەڵێت: ((هەندێك جار هەژاری پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ کوفر کردن)). لەراستیدا لەو حەدیسەی پێغەمبەردا چەمکی کوفر جیاوازییەکی جەوهەری نییە لەچەمکی تاوان لەڕوانینی زانستی نوێی کۆمەڵناسی. هەردووك لەروویەك لە رووەکانەوە دەرچوونە لە

(پێکهاتە) ئەو هەژارەی لە برساندا دەمرێت ناتوانین چاوەڕوانی ئەوەی لێبکەین سرودێکی نیشتمانی بچڕێت[1].

باوکم چیرۆکی دارتاشێکی هاوڕێی بۆ گێڕامەوە. ئەو هاوڕێ دارتاشەی باوکم لە رۆژانی گرانی و نەبوونی و هەژاریدا هیچ شتێکی نەبوو، پارەنانێکی پێبکڕێت بۆ منداڵەکانی، رۆژێکیان تا درەنگانێك چاوەڕێی کارێکی کرد بۆ ئەوەی نانی پێبکڕێت، چاوەڕوانییەکەی زۆری خایاندو کەسێك نەهات و بێزارو بێتاقەت بوو، حەزی نەدەکرد بچێتەوە ماڵێ چونکە کیژێکی بچووکی هەبوو رۆژێك لەسەر کۆڵانەکەدا چاوەڕوانی دەکرد بۆ وەرگرتنی ئەو شتەی دەیهێنایەوە.. بە هەرحاڵ بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە ماڵێ، منداڵەکانی دەوریان لێداو چاویان دەگێڕا بۆ خواردنێك، ئەویش چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و رووی کردە ئاسمان و پڕ بەگەرووی هاواری کرد: ((خودایە.. هەتا حەرمەلەش ئەو کارەی تۆی نەکردووە))[2].

لەدیدی پیاوانی ئایینەوە، ئەوانەی لەلایەن چەوسێنەران و خوێنمژو دیکتاتۆرەکانەوە دەمیان چەورکراوەو تەڕپۆش و خۆشگوزەرانن، گوتەی ئەو دارتاشە هەژارە کوفرێکی تەواوە.

---

(١) بیریارێکی دی دەڵێت: ((هەژارێك تێربکەو ئینجا داوای پیاوەتی لێبکە. (و).

(٢) حەرمەلە : ئەو پیاوەبوو لەکاتی شەڕی کەربەلادا تیرەکەی خستە نێودەمی منداڵە ساواکەی حوسەینی کوڕی عەلیەوە، ساواکەش لە تینواندا دەستی کرد بە مژینی سەری تیرەکە، حەرمەلەش بێبەزەییانە دەستی لێڕاکێشاو لە پشتی سەریەوە تیرەکە دەرپەڕی و کوشتی.

خۆشــگوزەران و خواپێداوەکــان چونکــە ژیانەکــەیان وای بــۆ رەخساندوون وەکو هەژارەکان کوفـر ناکـەن و لـەتاوان دووردەکەونـەوە، لەبری ئەوەش گوتار دەدەن و ئامۆژگاری دەکەن و بە دادپەروەریو حەقو چاکەدا گۆرانی دەچڕن.

بۆ نموونە هاروونە رەشیدی خواپێداو، بڕوایەکی هێندە پتـەوی بەخودا هەبوو هەر کەسێك شتێکی سەبارەت بە ئـایین بگوتبا ئـەوەندە دەگریا هـەتا لەسەرخۆ دەچوو. نیعمەتی ئـەو بارودۆخـە لـەبارو نـەرمو نیانـەی هارونـە رەشـید بەسـەریدا باریبوو کـە هـەزاران کـەنیزەك لـەنێو دەستەکانیدا کەمەریان دەجوولایەوە پاڵنەرێکی بەهێزبوو بۆ ئەو ئیمانو باوەڕە پتەوەی بەرامبەر بە خودای بەخشندە هەیبوو.

لەدەروونی هارونە رەشیدا هیچ جۆرە ئارەزوویەکی سـەرکوتکراو نەبووە. ئەگەر تۆش دە یەکی ئەو کەنیزەك و سەماکەرو گۆرانیبێژانەی هارونە رەشید بدەی بە من لەو پتر نوێژ دەکەمو خوودا دەپەرستمو هەموو رۆژێکیش لەترسی خودا دەیان جار لەسەر خۆ دەچوومو دەبورامەوە.. ئـەوەش جێگـەی نیگەرانیو سەرسوڕمانە ئـەو خـودا پێـداوە دەیویسـت هەموو مرۆڤێك وەکو خۆی ئیمانداربێت، ژمارەیەکی زۆری لە جـەللادو خوێنڕێژەکــان تــەرخانکردبوو بــۆ بــەدوادا چوونــی زەندیقــەکانو ملپــەڕاندنیان. مـن زۆر سوپاسـی خـودا دەکـەم کـە لەسـەردەمی ئـەو خواپێداوە بەختەوەرەدا نەژیاوم، چونکـە خـۆش رابـواردنو زیـادڕەوی کردنـی ئـەو لەسـەر حیسـابی کۆمـەلانی خـەڵك دەیکـردم بـە زندیـقو خوێنڕێژەکانی ئەهلی ئیمان دەیانکوشتم.

خوێنڕێژو جەللادەکانی ئەم سەردەمەش هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ هارونە ڕەشیدا نییە، ئەمان باوەڕیان بە دیموکراتی هەیەو هەمیشەش گۆرانی بەبالایدا هەڵدەڵێن و خەڵك لەپێناویدا بەند دەکەن و دەکوژن، بەڵام خودی خۆشیان باوەڕیان بەو دیموکراتییە نییەو جێبەجێی ناکەن.

ئێمە ئاینێکمان ناوێت پیاوانی وەکو هارونە ڕەشید پەیڕەوو پیادەی بکەن. ئێمە ئاینێکمان دەوێت پیاوێکی وەکو محەمەدی کوڕی عەبدوللە باوەڕی پێ هەبوو، هەروەکو دەیگوت: ((خودایە، بە هەژاری بمژێنەو بە هەژاری بمرێنەو لە ڕۆژی دوایشدا لەگەڵ هەژارەکاندا لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکە)). ئەو دوو ئاینە دژی یەکدین و کاتی ئەوە هاتووە ئێمەش یەکێکیان هەڵبژێرین.

# سەرچاوەکان


١- Tyrrell, The Personality of man.

٢- سلیمان دنیا ((ڕاستی لە دیدی غەزالیەوە)).

٣- Wilson, Great men of Science, ch-15.

٤- Ross(ed), Anout line of Modern knowledge.

٥- Toynbee, A Study of History.

٦- Rhiue, The Reach of mind.

٧- یەعقوب سەروف (رسائل الأرواح).

٨- ولیم جێمس (ئیرادەو باوەڕ) وەرگێڕانی د. مەحمود حب الله.

٩- Thomas, The hiviag worlds of philosophy P.76.

١٠- Mannheim, Ideology and Utopia.

١١- یەعقوب قام (البراگماتیزم أو فلسفة الذرائع).

١٢- Legs, Ethics and Social Ralicy.

١٣- Encycl opedia of Social Sciences, art genius.

١٤- Encyclopedia Britaniea, art. Genius.

١٥- Harding, An Anatomg of Inspiration.

١٦- Durant, The Story of philosophy.

١٧- Deweg, Logic.

١٨- Oleaey, Arabic Thought.

١٩- Macdonald, The Development of Muslim theology.

٢٠- Thomas, Op.Cit.

٢١- ئەحمەد ئەمین (ضحی الأسلام).

٢٢- ئیبن خەلدون (المقدمة).
٢٣- Joad, Guide to philosophy.
٢٤- Dewey, Logic.
٢٥- Kluchohn and marray persouality.
٢٦- Mead, Movement of Thought.
٢٧- Schiller, for mal Logic.
٢٨- جنییز (الكون الغامض) وەرگێڕانی عبدالحمید مرسی .
٢٩- مختار المختار، هل أنت حي.
٣٠- Rhine, The Heach of the mind.
٣١- جرجی زێدان (التمدن الإسلامي).
٣٢- یەعقوب سەروف (سرّ النجاح).
٣٣- Baudouin, Suggestion and Auto suggestion.
٣٤- سەلامە موسا (أسرار النفس).
٣٥- جەمیل سەلیبا (علم النفس).
٣٦- سەلامە موسا (العقل الباطن).
٣٧- Tvrrell, opcit.
٣٨- Rhiue, New frontiers of the mind.
٣٩- Tischner, Telepathy and clairvoy ance.
٤٠- سینل (الحاسة السادسة).
٤١- Duncan, The New Knowledge.
٤٢- فواد سەروف (آفاق العلم الحديث).
٤٣- Titus, hiving lssues in philosophy.
٤٤- Joad, Guide to modern thought.
٤٥- Out line of Modern Belief.

٤٦- محەمەد مەهدی ئەلنراقی (جامع السعادات).

٤٧- گۆڤاری (الثقافة) ژمارە (٥٢).

٤٨- عەباس ئەلعەقاد (الله).

٤٩- ڕۆژنامەی (الهاتف) ژمارە ١١٩٨ تەموز ١٩٥٢.

٥٠- ولیەم سرجیوس (الیحاء).